

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی (٣١)

# کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

## توێژینەوەکان ــ بەرگی سێیەم


❖ د. موستەفا عەلوانی
❖ نەشئەت غەفور سەعید
❖ د. کاوە فەرەج سەعدون
❖ د. موحەممەد جەمیل ئەلحەبال
❖ د. کەریم ئەحمەد
❖ د. موحەممەد زەکی بەرواری


کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان ــ توێژینەوەکان ــ بەرگی سێیەم




خوێنەری بەڕێز؛ ئەم کتێبە، بەرگی سێیەم و کۆتایی ئەو زنجیرە سێ بەرگییەیە، کە سەرجەمی توێژینەوەکانی (کۆنگرەی بەرگریی لە قورئانی پیرۆز) لەخۆ دەگرن، کە سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری، بە هاوکاریی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی، وەکو یەکەمین کۆنگرەی زانستیی خۆی، لە ڕۆژانی 22-2011/12/23ی زایینی، لە شاری سلێمانی سازی کرد.

وەکو توێژینەوەکانی بەشدار لە هەر کۆنگرەیەکی تر، بڕیار بوو سەرجەم توێژینەوەکانی ئەم کۆنگرەیەش لە دووتوێی یەك بەرگ و لە ماوەیەکی دیاریکراودا چاپ و بڵاوبکرێنەوە، بەڵام لە لایەك بە هۆی زۆریی توێژینەوەکان، لە لایەکی تریش بەهۆی بەکوردیکردنی ژمارەیەکیان، هەم وادەی بەچاپگەیاندنیان دواکەوت، هەمیش نەتوانرا سەرجەمیان لە دووتوێی یەك بەرگدا چاپ و بڵاوبکرێنەوە.

سوپاس بۆ خوا وا بەرگی سێیەم و کۆتاییش بە چاپ گەیشت، هیوادارین ئەم بەرگەش وەکو هەردوو بەرگی پێشووی خۆی پێشوازیی گەرمی لێبکرێت و خزمەتی زیاتر بە زانستەکانی قورئانی پیرۆز و ڕەواندنەوەی ئەو گومانانە بکات کە لەبارەی قورئانەوە دەورووژێنرێن. خوای گەورەش ئەم زنجیرە کتێبە بکاتە مایەی ڕەزامەندیی خۆی.

کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

توێژینەوەکان ــ بەرگی سێیەم

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**
**پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی (٣١)**

# کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان
## توێژینەوەکان- بەرگی سێیەم

**ئامادەکردنی:**

**هاوژین عومەر**

**چاپی یەکەم**

**١٤٣٦ ک** **٢٠١٥ ز**





ناوی کتێب: کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان، توێژینەوەکان.

بەرگی: سێیەم.

ئامادەکردنی: هاوژین عومەر.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی.. ژمارە (٣١).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٨٤٧)ی ساڵی (٢٠١٤)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٥.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (٥٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# ناوەڕۆك

# به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

خوێنەری بەڕێز ئەم کتێبەی بەردەستت، بەرگی سێیەم و کۆتایی ئەو زنجیرەیەیە، کە سەرجەمی توێژینەوەکانی (کۆنگرەی بەرگریی لە قورئانی پیرۆز) لەخۆ دەگرن، کە سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری، بە هاوکاریی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی، وەکو یەکەمین کۆنگرەی زانستیی خۆی، لە ڕۆژانی (٢٦–٢٧/موحەڕڕەم/١٤٣٣ی کۆچی) بەرامبەر بە (٢٢–٢٣/١٢/٢٠١١ی زاینی)، لە شاری سلێمانی سازی کرد.

هەرچەند بڕیار بوو تەواوی ئەم توێژینەوانە لە ماوەیەکی دیاریکراو و لە یەك بەرگدا چاپ و بڵاوبکرێنەوە، پاشان لە کۆنگرەی دوای خۆیدا بخرێتە بەر دیدەی خوێنەرانی، بەڵام لە لایەك بەهۆی زۆریی توێژینەوەکان، لە لایەکی تریش بەهۆی بەکوردیکردنی ژمارەیەکیان، کە بە زمانی عەرەبی پێشکەشکرابوون، ناچار هەم وادەی بەچاپگەیاندنیان دواکەوت، هەمیش نەتوانرا سەرجەمیان لە دووتوێی یەك بەرگدا چاپ و بڵاوبکرێنەوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە وا بەرگی سێیەم و کۆتاییش بە چاپ گەیشت، هیواداریین ئەم بەرگەش وەکو هەردوو بەرگی پێشووی خۆی پێشوازیی گەرمی لێبکرێت و خزمەتی زیاتر بە زانستەکانی قورئانی پیرۆز و ڕەواندنەوەی ئەو گومانانە بکات کە لەبارەی قورئانەوە دەورووژێنرێن. خوای گەورەش ئەم زنجیرە کتێبە بکاتە مایەی ڕەزامەندیی خۆی.

**هاوژین عومەر**

**ل. لیژنەی چاپ و بڵاوکردنەوە**

**١٤/١١/٢٠١٤ی زاینیی**




# بنچینەکانی فیکری سیاسیی ئیسلامی لە (وەحی)دا وەڵامێك بۆ ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی دژی ئیسلام سەنگەریان گرتووە

د. مصطفى جابر العلواني
أستاذ العلوم السياسية المساعد
المعهد العالي للتوجيه والإرشاد/ صنعاء

وەرگێڕانی: د. دانا عەلی ساڵح

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيّدنا وشفيعنا نبيِّنا محمد المبعوث رحمة للعالمين، وعلى آله وصحابته والتابعين ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، اللهمّ صلِّ على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين إنك حميد مجيد. وبعد:

ئەوەی من دەمەوێ لەم باسەدا و جەختی لەسەر دەکەمەوە دەربارەی ڕۆژهەڵاتناسی لە یەکێك لە ڕەهەندە سەرەکییەکانیەوە، ئەوەیە کە ڕۆژهەڵاتناسی پرسێکی ڕۆژئاوایی تایبەت بە خۆیانە، لە تێڕوانینی لێکۆڵەرانەوە بەرامبەر بە ڕۆژهەڵات دەردەکەوێ، چ لە ڕووی گرنگییەوە بێت، یان توێژینەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕۆژهەڵاتناسی بابەتێکی تایبەت بە ڕۆژئاوایە بە دیاریکراوی، هەروەها کاریگەر دەبێ بە کلتوور و تێڕوانینی ڕۆئاوا و بە بەرژەوەندی و مەبەستەکانی، بە هەر شتێکی تر کە دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو کلتوورەوە. کلتوورێك کە لە چوارچێوەی گەڵاڵەبوون و پێکهاتنیدا ئەو توێژینەوانە نووسراون، بێگومان کاریگەریی ئەو کلتوورەیان لەسەرە، ئینجا بە باش یان بە خراپ بێت. هەروەها ئەم توێژینەوانەش کاریان کردووەتە سەر ئەو کلتوورە، کەواتە ڕۆژهەڵاتناسی بەرهەمی ژینگەی ڕۆژئاوایە و هەر لەوێشەوە ڕەنگرێژیی بۆ کراوە.

هەروەها توێژینەوە ئەورووپییە ڕۆژهەڵاتییەکانیش دەچنە خانەی ڕۆژهەڵاتناسییەوە[1]، چونکە گرنگی بە ڕۆژهەڵات دەدەن، ئەمەش زیاتر ئەو

---

(1) د. مازن بن صلاح مطبقاني، الاستشراق، محاضرات ألقاها في قسم الاستشراق/ كلية الدعوة بالمدينة المنورة/ جامعة الإمام محمد بن سعود، ص٣.

قسەیە دەچەسپێنێت کە دەڵێ: "ناتوانرێ ڕۆژهەڵاتناسی تەنها لە بەدیهێنانی چەند مەبەستێکی کۆڵۆنیالی ڕۆژئاواییدا کورت بکەینەوە، یان کورتی بکەینەوە لە سەنگەر گرتن دژی شارستانیەك یان ئایینێك و دوژمنایەتیکردنیان"، بەڵکو هەندێك لەو توێژینەوانە دەچنە خانەی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەیەکی ورد دەربارەی ڕۆژهەڵات، لە چوارچێوەی مەبەستگەلێکی زانستی و بەس، کە دەکرێ لە خانەی (زانست لە پێناو زانست)دا بژمێردرێن، ئەگەر چی هەندێ مەبەستی گوماناوی تێکەڵیشی بووبێت بەهۆی کەڵەکەبوونی کلتووری ڕۆژئاواییەوە، کە ئەو بۆچوونە هیچ هاوبەشییەك نابینێت لە نێوان خۆی و ئیسلامدا، نە لە ڕابردوو و نە لە ئێستادا – مەبەست لە ئێستا ئەو کاتەیە کە ئەو توێژینەوانەی تیادا نووسراوە، ئەویش نزیکەی سێ دەیە دەگرێتەوە– نە لە داهاتووشدا کە ئەم کلتوورە پێشبینیی ئەوە دەکات لایەنی کەم ململانێ لە نێوان ئەو و ئیسلامدا بێتە ئاراوە، ئەمە ئەگەر سەرنەکێشێ بۆ هێرش و لەناوبردن، ئەمەش بۆ بەرگریکردن و لە ترسی فراوانبوونی کیانی ئیسلام و ڕێگرتن لە مێژووی فتوحاتی ئیسلامی بە بۆچوونی ئەوان.

ئاشکرایە کە ڕۆژهەڵاتناسی گرنگی بە لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵات دەدات، بە جوگرافیا و ستراتیژی، بە شارستانی و تایبەتمەندی کۆمەڵگاکانی، بە ئایین و زانست و ئەدەب و هونەری، ئەمەش واتە گرنگیدان بە زەوی و ئینسان و پەیوەندییەکان و ئەو پەیوەندییانەی تایبەتن بە مرۆڤ و کۆمەڵگاوە، بەمەش ڕۆژهەڵاتناسی تەنها لەسەر لێکۆڵینەوەی ئیسلام و مسوڵمانان نەوەستاوە، بەڵکو درێژبووەتەوە بۆ شارستانیەکانی ڕۆژهەڵات بە گشتی: وەکو شارستانیی هیندی و چینی کۆن و هی تریش، ئەمەش ڕاستییەکی گرنگمان بۆ ڕووندەکاتەوە ئەویش ئەوەیە پاڵنەری توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی تەنها بریتی نەبووە لە سەنگەرگرتن و لە بۆسەدابوون بۆ ئیسلام و مسوڵمانان ـ ئەمەمان پێشتریش وتـ،

بەلآم ئەم ڕاستییە شایەتیدان نییە بۆ بێبەریکردنی ڕۆژهەلآتناسی لە دژایەتیکردنی ئیسلام و مسولْمانان، نەك هەر ئەوە، بەلْکو بێبەریی ناکات لەوە کە هەولْی داوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی ڕۆژئاوا، یاخود هاوکار بووە بۆ زالْکردنی باکووری زەوی بەسەر باشووریدا، جیاکردنەوەی سپی پێست لەوانی تر، هەروەها بلْندڕاگرتنی مەسیحیەت بەسەر ئایینەکانی ترەوە، یاخود شارستانیی ڕۆژئاوا بەسەر باقیی شارستانییەکانی جیهانەوە، نەك هەر ئەوە، بەلْکو جیاکردنەوەی ژینگە و ئاو و هەوای خۆیان لە شوێنانی تر، ئەگەر ئەمە نەبێت چی وا لە بیرمەندی ڕۆژئاوا دەکات خۆی تەرخان بکات بۆ لێکۆلْینەوە لە ڕۆهەلآت، ئەگەر شارەزابوون نەبێت لەوەی ڕۆژئاوا و قوتابخانە و بیرمەندەکانی چۆن سوودمەند بن لە دەریای بەهرەکانی ڕۆژهەلآت؟ یان چۆن خۆیان لە زیانەکانی بپارێزن بەپێی قسەی هەندێکیان.

توێژینەوە ڕۆژهەلآتناسییەکان وەکو ئەوەی ئاراستەیەکی فیکریی دیار و دەرکەوتوون - زۆرێك گرنگییان پێداوە وەکو دیاردەیەکی ڕێکخراو کە دامەزراوە و کاریگەریی خۆی هەیە - سنووری سەرهەلْدان و دەستپێکردنی دەگەڕێتەوە بۆ پێش لە (دوو سەدە)ی ڕابردوو، بەلآم ئەو کەسەی خەریکی ڕۆژهەلآتناسی بووە و پێی وتراوە (ڕۆژهەلآتناس) ئەم ناوەی لە سەردەمێکی نزیکتردا بەسەردا بڕاوە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (سێ دەیە) لەمەوبەر[٢]، بەلآم ئەمە ئەوە ڕەتناکاتەوە کە هەولْی لێکۆلْینەوە وگرنگیدان بە ڕۆژهەلآت هەبووبێت پێش ئەم مێژووەش، هەر لەو کاتەوەی ئەو شارستانییە شان بە شانی شارستانیەکانی مرۆڤایەتی هەبووە، جا لە ڕۆژهەلآت بووبێت یان لە ڕۆژئاوا، هەروەها بوونیان بە هاوتەریبی و پەیوەندییان بەشەڕ و بە ئاشتی.

---

(٢) مطبقاني، هەمان سەرچاوە، ص٢.

بەمشێوەیە، بابەتیتر دەبێت ئەگەر وردتر و لەسەرخۆتر لە ڕۆژهەڵاتناسی بدوێین و دەتوانین دوورکەوینەوە لە سووتاندنی تەڕ و وشك بەیەكەوە لەو توێژینەوانە و ئاكامەكانیان، هەروەها دەتوانرێ چارەسەری دەرەنجام و ئاكامی ئەو دژایەتیكردنەی هەندێك لە توێژینەوەكان بكرێت بەرامبەر ئیسلام و مسوڵمانان بە شێوازێكی زانستی كە لەو ڕێبازی یەكخواناسییەوە (منهج التوحید) سەرچاوە دەگرێت كە نیگا (الوحي) لەخۆی دەگرێت، لە چوارچێوەی بەرگریكردن لە ئیسلامدا بەوەی كە پێویستە بەرگریی لێبكەین، هەر بەوشێوەیەش دەتوانرێ ڕاستیی ئیسلام بۆ خەڵكانی تر ڕوون بكرێتەوە كە پێویستییەكی بانگەواز و جیهانێتیی ئیسلامە.

## ئاریشەی توێژینەوەكە:

ئاریشەی ئەم توێژینەوەیە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەبێتەوە:

**یەكەم:** بوونی چەند ئاستەنگێك، كە دەبنە بەربەست لەبەردەم ئیسلام و بانگخوازانی و بانگەوازەكەیدا، هەر بەمەشەوە ناوەستێت، بەڵكو سەردەكێشێ بۆ هێرشكردنێكی بەرنامەبۆدارێژراو بۆ سەر ئیسلام و پەیامەكەی و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و سەرچاوەكانی و ئوممەت و زەوی و خاكەكەشی، لە چوارچێوەی دەستدرێژیكردنە سەر ئیسلام و هەوڵی شێواندنیدا، تا یەك بە یەكی پایەكانی هەڵوەشێنن و شتێك نەمێنێ مسوڵمانان لەسەری كۆببنەوە[٣].

---

([٣]) یەكێك لەوانەی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەكان بە هەوڵی ڕۆژئاوا دادەنێت بۆ ملكەچكردنی مسوڵمانان و هەوڵی لێدانیان، د. إبراهیم محمد الفیومي، الاستشراق في میزان الفكر الإسلامي ، القاهرة: ١٤١٤هـ - ١٩٩٤م، سلسلة قضایا إسلامیة، تصدر عن المجلس الأعلی للشؤون الإسلامیة بوزارة الأوقاف، ص١٠، هەروەها ئەوەی كە تێیدا لە ئیدوارد سەعیدەوە گواستوویەتەوە.

**دووەم:** بوونی گشتاندن لەلایەن زۆرێك لەو توێژینەوانەی ڕەخنە لە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان دەگرن، کە دەیانخەنە خانەی دوژمنایەتیکردنی ئیسلام و مسوڵمانان، یان لایەنی کەم پێیانوایە هیچ سوودێکیان نییە، بەمەش زۆرێك لەو شتانە لەناو دەبەن کە دەکرێ خزمەتی بانگەوازی ئیسلامی بکەن، بەتایبەتی بانگەوازکردنی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی بە نزیککردنەوەی وێنەی ئیسلام و وەسفکردنی بە لێکەوتەکانی ڕۆژهەڵاتناسی، یاخود بە وروژاندنی فزوولیەتی مەعریفییانەو هاندانیان بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام و دۆزینەوەی ڕاستێتی و ڕێبازەکەی.

**سێیەم:** بوونی دەنگۆیەکی فراوانی ئەم توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییانە لە وڵاتانی ئیسلامی، بەتایبەت ئەو شوێنانەی زۆرتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کلتوور و دامەزراوە زانستییەکانی ڕۆژئاوا، بەشێوەیەك کە ئەم توێژینەوانە بوونەتە پێکهێنەرێکی سەرەکی کلتووری ئەو کەسانەی کاریگەریی ڕۆئاوایان لەسەرە.

## ئامانجەکانی توێژینەوەکە:

**یەکەم:** وەستان لەسەر بنەماکانی فیکری سیاسیی ئیسلامی، کە لە توانایاندا هەیە ستراتیژیەتێك بنیات بنێن بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو شتانەی ڕۆهەڵاتناس و کەسانی تر باسیان دەکەن، کە ئامانج لێیان شێواندنی ئیسلام و دروستکردنی گومانە، یان خراپ تێگەیاندنی خەڵکە، ئەمەش لە سێ تەوەردا دەبێت:

١ـ بەرگریکردن دژی ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەر ئیسلام بە بەرەنگاربوونەوەیان.

٢ـ ڕانان و ڕاسکردنی ئیسلام و سەرچاوە بێگەردەکەی بە باسکردنی ڕاستییەکانی ڕێبازی یەکخواناسی.

٣ـ بنیاتنانی گوتارێکی بانگخوازیی ئیسلامی بۆ ئەوانی تر.

**دووەم:** جەختکردنەوە لەوەی کە دەتوانرێ سوود لە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان وەربگیرێ، بەتایبەتی لە دابینکردنی سەرچاوە کۆنەکانی کەلەپووری ئیسلامی، وەکو دەستنووسەکان، وەرگێڕراوەکان، توێژینەوەکان، ئەمانە ڕێگای زۆر دەکەنەوە لەبەردەم توێژەری مسوڵماندا.

**سێیەم:** جەختکردنەوە لە بوونی چەند بنەمایەکی قورئانی کە دەبنە بنچینەدانەری مەنهەجێکی مەعریفی، بەهۆیەوە دەتوانرێ مامەڵە لەگەڵ هەموو پرسەکاندا بکرێت کە گوتاری قورئانی لەبەرامبەریاندا دەوەستێ، جا چ لەسەر ئاستی گشتی یاخود لەسەر ئاستی وردەکاریی بابەتەکان بێت، بەمەش دوور دەکەوینەوە لە پشتگوێخستنی قورئان و سوننەت بە دەستگرتن پێیانەوە و ڕامکردنی فیکرمان بە هەردووکیان.

## گریمانەکانی توێژینەوەکە:

**یەکەم:** ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەر ئیسلام و ئەو شێواندنانەی ڕووبەڕووی سەرچاوە و ڕێبازەکەی دەبنەوە، لەلایەن ڕۆژهەڵاتناس و کەسانی ترەوە، دەکرێ بەرەنگاریان ببینەوە لەسەر چەند بنەمایەکی فیکری سیاسی، کە ئەوانیش یەکدەگرنەوە لە خوێندنەوەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی ئیسلام، بەتایبەتی نیگا بە قورئان و سوننەتەوە، هەروەها خوێندنەوەی ئەوانەی دەربارەیان وتراوە، دواتر ڕێبازی ئیسلام بکەین بە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوەی وتراوە لە نیگاوە و چەسپاوە، هەروەها ئەوەی دەوترێ دەربارەی ئیسلام لەلایەن نەیارانیەوە، لە چوارچێوەی ئەوەی کە گوتاری قورئان و

سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) وتوویانە وەکو ڕێنماکار و دادوەر و ڕێکخەر.

**دووەم:** ئەوەی ئەو گریمانەیەی سەرەوە بەهێز دەکات، زۆر و زەبەندەیی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانە کە هەموو کەسێك ناتوانێ ئاگاداریان بێت، بەمەش دەبێت پشت بە کۆمەڵێك بنەمای فیکری ببەستین کە لەسەر نەگۆڕەکانی وەحی دامەزرابن و بگونجێن بۆ پێوان و هەڵسەنگاندنی ئەوەی خوێندرابێتەوە یان نەخوێندرابێتەوە، لەو توێژینەوە و بەرهەمە ڕۆژهەڵاتناسییانە، بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەین کە مەنهەجی ئیسلام دیاریی دەکات.

## میتۆدی توێژینەوەکە:

توێژەر لەم توێژینەوەیەدا هەوڵیداوە مامەڵە لەگەڵ بابەتەکەدا بکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی لەسەر بنەمای مەنهەجی شیکردنەوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە گوتاری قورئان و سوننەتەوەیە، هەروەها توێژەر هەوڵیداوە پشت ببەستێت بە مەنهەجی خوێندنەوە و هەڵێنجانی ئەو پرسانەی بیرۆکەی سەرەکیی بابەتی توێژینەوەکە دیاریی دەکەن.

## توێژینەوەکانی پێشتر:

بابەتی ڕۆژهەڵاتناسی لەلایەن بیرمەندانەوە گرنگیی زۆری پێدراوە، بەتایبەتی بیرمەندانی ئیسلامی، کە دەیانەوێ بەرەنگاری ئەو توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییانە و گومانەکانیان ببنەوە کە ئاراستەی ئیسلام و مسوڵمانانیان کردووە، دەتوانین بەم شێوەیە پۆلێنیان بکەین:

**یەکەم:** توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتناسان دەربارەی توێژەران لە بواری ڕۆژهەڵاتناسیدا، وەکو هەڵسەنگاندنی ئەوەی نووسراوە، ڕەخنە لێگرتنی و تا

چەند هاوکاریی دەوڵەمەندکردنی فیکری ئینسانیی کردووە. دیاریکردنی مەنهەجیان، یاخود ئەوەی لە سەنتەرەکانی ڕۆهەڵاتناسیدا نووسراوە و ڕەخنەی بابەتی لێیان، لەو بوارەشدا توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (گۆستاف بفان موللر) دەهێنمەوە بە ناونیشانی (ئیسلام لە فیکری ڕۆژهەڵاتناسیدا).

**دووەم:** توێژینەوەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی دەربارەی حەقیقەتی مەنهەجی ئیسلامە، نووسینی ئەمانە دەبێت بە شایەتیدانێك لەوانەوە بۆ ئیسلام کە ڕوونیان کردووەتەوە بەشێکی زۆر لە توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتناسان لایەنگریی تیایە بۆ ڕۆژئاوا لەسەر حیسابی ڕۆژهەڵات، هەروەها لایەنگریی نەصرانیەت و یەهوودیەت لەسەر حیسابی ئیسلام، نموونەی ئەمەش "ئیسلام لەچەند ڕێیانێکدا" هی ڕۆهەڵاتناس (لیوپولد فایس) کە دوای مسوڵمانبوونی بە (محمد أسد) ناسرا.

**سێیەم:** توێژینەوەی مسوڵمانانی بەرگریکار لە ئیسلام، ئەویش بە دەرخستنی گومانگەلێك کە لایەنگریی و دژایەتیکردنی زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسانی پێوە دیارە بۆ ئیسلام، ئەمانەش فرە بابەتن، نموونەیان:

١ ـ توێژینەوەگەلێك گرنگییان داوە بە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی تایبەت بە شەریعەتی ئیسلام، بۆ نموونە توێژینەوەی (عبدالقهار العاني) (ڕۆهەڵاتناسی و توێژینەوە ئیسلامییەکان)(٤).

٢ ـ توێژینەوەگەلێك دەربارەی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی تایبەت بە قورئان و زانستەکانی، لەوانە:

أ ـ هەیانە گرنگیی بە وەحی داوە وەکو توێژینەوەی (محمود ماضي) (وەحیی قورئانی لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسییەوە و ڕەخنەلێگرتنی)(٥).

---

(٤) أ. د. عبدالقهار داود عبدالله العاني، الاستشراق والدراسات الإسلامية، ط١، دار الفرقان، عمان: ١٤٢١/٢٠٠١.

ب ـ هەشیانە گرنگیی بە قورئانی پیرۆز بە گشتی داوە، وەکو توێژینەوەی (محمد خلیفە) (ڕۆژهەڵاتناسی و قورئانی پیرۆز)[٦].

٣ ـ توێژینەوەگەلێك گرنگییان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و سوننەت و مێژووی ژیانی داوە، وەکو توێژینەوەی (محمد بهاءالدين) (ڕۆژهەڵاتناسان و فەرموودەی پێغەمبەر)، وتوێژینەوەی (عبدالله محمد الأمين) (ڕۆژهەڵاتناسی لە مێژووی ژیانی پێغەمبەردا).

٤ ـ توێژینەوەگەلێك گرنگییان بە مێژووی ئیسلام داوە، لەوانە توێژینەوەی (عمادالدين خليل) (ڕۆژهەڵاتناسان و مێژووی ژیانی پێغەمبەر)، و (أكرم ضياء العمري) (هەڵوێستی ڕۆژهەڵاتناسی بەرامبەر مێژووی ژیان و سوننەتی پێغەمبەر)[٧].

٥ ـ توێژینەوەگەلێك گرنگییان بە خودی ڕۆژهەڵاتناسی داوە، بە سەرهەڵدان و مەنهەج و ئامانج و میکانیزم و پاڵنەرەکانی، لەوانە توێژینەوەی (علي إبراهيم النملة) و (مازن صلاح مطبقاني).

٦ ـ توێژینەوەگەلێك گرنگییان بە ئاشکراکردنی پەیوەندیی نێوان ڕۆژهەڵاتناسی و بەنەصرانیکردن داوە، لەوانە توێژینەوەی (عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني) (سێکوچکەی فێڵ و شاراوەکانیان موژدەدان ـ ڕۆژهەڵاتناسی ـ

---

(٥) د. محمود ماضي، الوحي القرآني في المنظور الإستشراق ونقده، دار الدعوة، الإسكندرية، ط١، ١٤١٦-١٩٩٦.

(٦) محمد خليفة، الاستشراق والقرآن العظيم، ترجمة: مروان عبدالصبور شاهين، دار الاعتصام، القاهرة، ١٤١٤- ١٩٩٤.

(٧) أ. د. عماد الدين خليل، المستشرقون والسيرة النبوية، دار الثقافة، الدوحة، قطر، ١٤٠١- ١٩٨٩، وأكرم ضياء العمري، موقف الاستشراق من السيرة والسنة النبوية، دار أشبيلية، الرياش، ١٤١٧-١٩٩٧.

کۆلۆنیالیزم) [٨]، توێژینەوەی (أنور الجندی) (موژدەدان و ڕۆژهەڵاتناسی و بانگەوازە لەناوبەرەکان).

٧ ـ توێژینەوەگەلێکی فیکری کە گرنگییان داوە بە ئاشکراکردنی گۆڕانکاری لە هەڵوێستی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی کە لەگەڵ ئیسلامدا هەڵناکەن و ئەوانەشی کە دژایەتیی دەکەن. هەروەها کاریگەریی دامەزراوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان لە فیکری سیاسیی ڕۆژئاواییدا و لە دروستکردنی بڕیاری سیاسیدا سەبارەت بە ڕۆژهەڵات، لەوانەش توێژینەوەی (عبدالله یوسف سهر محمد) (دامەزراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسی و سیاسەتی ڕۆژئاوا سەبارەت بە عەرەب و مسوڵمانان) [٩].

## دابەشکردنی توێژینەوەکە

دابەشکردنی ئەم توێژینەوەیە بەشێوەیەك کراوە کە بتوانین لە ڕێگەیەوە بگەینە ئامانجەکانی و لە گریمانەکانی بکۆڵینەوە، بەم شێوەیە:

**پێشەکی:** تیایدا گرنگی بابەتەکە ڕوونکراوەتەوە لەگەڵ ئەو زیادەیەی کە ئەم بابەتە بەدی دەهێنێ لەچاو توێژینەوەکانی پێشووتردا، هەروەها چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتی توێژینەوەکەدا بەشێوەیەك ئامانج بپێکێ:

**باسی یەکەم:** گرنگیدانی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بە ئیسلام و مسوڵمانان.

---

(٨) عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني، أجنحة المكر الثلاثة وخوافيها التبشير — الاستشراق — الاستعمار، دراسة وتحليل وتوجيه، سلسلة أعداء الإسلام(٣)، ط٨، دار القلم، دمشق، ١٤٢٠- ٢٠٠٠.

(٩) عبدالله يوسف سهر محمد، مؤسسات الاستشراق والسياسة الغربية تجله العرب والمسلمين، مركز الإمارات للدراسات والبحوث،ط١، الإمارات، ٢٠٠١.

**تەوەری یەکەم:** پەیوەندیی ڕۆژهەڵاتناسی بەو بوارانەی پاڵنەری هاتنە کایەی بوون.

**تەوەری دووەم:** لە دەرەنجامەکانی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان سەبارەت بە پێشکەشکردنی بابەتییانەی ئیسلام.

**تەوەری سێیەم:** لە شوێنەوارەکانی ڕەهەندی خودی و پێودانگی (معیاری) ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر گەڵاڵەکردنی دیدێکی نێگەتیڤ لەمەڕ ئیسلام.

**باسی دووەم:** تایبەتمەندییەکانی ئەوانەی دژی قورئانن و وەڵامدانەوەی ڕێبازەکانیان، لە گوتاری قورئانیدا:

**تەوەری یەکەم:** تایبەتمەندییەکانی سەرپێچیکارانی پێغەمبەران و دابەزێنراوەکان لە قورئانی پیرۆزدا.

**تەوەری دووەم:** چەند نموونەیەك لە گومانی سەرپێچیکاران و وەسفکردنی ڕێبازەکانیان و وەڵامدانەوەی قورئان بۆیان.

**باسی سێیەم:** بنچینەکانی بنیاتنانی ستراتیژیەتی وەڵامدانەوەی نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان:

**تەوەری یەکەم:** پلە و پایەی ئیسلام و ناواخنەکانی بەپێی گوتاری قورئان و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت).

**تەوەری دووەم:** چەمکە بنچینەییەکانی بنیاتنانی ستراتیژیەتی وەڵامدانەوەی سەپێچیکارانی ڕێبازی یەکخواپەرستی.

**کۆتایی:** گوشراوی ئەوەیە کە لەم باسەدا توێژینەوەی لەسەر کراوە، بۆ داهاتووش چی پێویستە بکرێت لەلایەن ئەوانەوە کە بەرگری لە ئیسلام دەکەن.

## باسی یەکەم:
## گرنگیدانی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بە ئیسلام و مسوڵمانان

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە، گرنگیدانی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانە بە ئیسلام و مسوڵمانان، بێگومان مەبەستمان داکۆکیکردنە لە ئیسلام و ئوممەتەکەی. بە ئامانجی ئەوەی ڕێوشوێنی ستراتیجی بەرەنگاربوونەوە بگرینە بەر بۆ هەموو ئەو هێرشانەی دەیانەوێ لە ئیسلام بدەن، جا لە بنەماکانی بێت، یان لە بیروباوەڕ و شەریعەت و بەها و مەبەستە شەرعییەکان بێت. هەروەها بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێرشانەی دەیانەوێ زیان بە ئومەتی ئیسلامی بگەیەنن، بە نەشونماکردنی و تایبەتمەندی و بزاوتی.

گرنگیپێدانی ڕۆژهەڵاتناسەکان لەوەدا دەردەکەوێ کە چۆن ئیسلامیان ناساندووە و پێشکەشیان کردووە، بەشێوەیەك کە دەربڕی توێژینەوەکانیانە بۆ واقیعی ئیسلام لە چوارچێوەی ڕەهەندی بابەتییانەدا، هەروەها بۆچوونی ئەوان و وێناکردنی ئیسلام لە چاوی ئەواندا لە چوارچێوەی ڕەهەندی خودییەوە.

ڕۆژهەڵاتناسەکان خۆیان ئەو ڕاستییەیان دووپات کردووەتەوە ـ لە زۆر شوێندا لە نووسینە شیکاری و ڕەخنەییەکانیاندا ـ کە ڕۆژئاواییەکان لایەنگرییان هەبووە کاتێك لە ئیسلامیان کۆڵیوەتەوە، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا[10]، لەکاتێکدا هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان وایدەبینن کە فەلسەفەی ئیسلامی ئەوکاتە کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبووە لە بنیاتنانی فەلسەفەی ڕۆژئاواییدا، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا[11]، کە بە سەردەمی تاریکی دادەنرێت لە ئەوروپا، لە هەمان سەردەمدا لە وڵاتانی ئیسلامی بزووتنەوەیەکی

---

(10) جوستاف بفانموللر، الإسلام في الفكر الاستشراقي، ترجمة: د.محمود حمدي زقزوق، هامش ص١٠٦.

(11) هەمان سەرچاوە، ص١٠٥.

زانستیی بەرفراوان بەڕێوەدەچوو لە هەموو بوارەکانی زانستدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بابەتی سەرەکی ـ تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی ـ دەبێ بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەی ورد و شیکردنەوە و ڕەخنە، لە چوارچێوەی ئەم تەوەرانەی کەوا دێن:

## تەوەری یەکەم:

## پەیوەندیی ڕۆژهەڵاتناسی بەو بوارانەی پاڵنەری هاتنەکایەی بوون

مەبەستمان ڕوونکردنەوەی کاریگەریی ئەو بوارە جیاجیایانەیە کە وایانکرد توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بێنەئاراوە، هەر ئەمانەش بوونە پاڵنەر و لەوانیشەوە ئامانجەکانی ڕۆژهەڵاتناسی دیاری دەکرێن، کە دەتوانین بەم شێوەیە کورتیان بکەینەوە:

**یەکەم:** پەیوەستیی ڕۆژهەڵاتناسی بە زانکۆکان و دامەزراوە ئەکادیمییەکان: ڕۆژهەڵاتناسی پەیوەستە بە کۆمەڵێك دامەزراوە کە تایبەت بوون بە سەرپەرشتیکردن و هاندانی توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتناسی، ئەمەش ئاستی گرنگیدان بەو بوارە ڕووندەکاتەوە، هەروەها پاڵنەری زانستیش دەسەلمێنێ بۆ ئەو توێژینەوانە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مەبەستی تریش نەبووبێت لەلایەن ئەو دامەزراوانەوە، چونکە ئەوان ئامانجگەلێکیان لەبەرچاو بوو، دیارترینیان ڕاسپاردەی کۆڕی کلێسایی ڤیەننا بوو، هەروەها تەرخانکردنی کورسیی خوێندن بۆ زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆ سەرەکییەکاندا[١٢]، هەروەها ئەوەی پەیوەندیی زانست بە مەبەستگەلێکی ترەوە ڕووندەکاتەوە: ئەو قسەیەی

---

(١٢) إدوارد سعيد، الاستشراق، المعرفة، ترجمة: كمال أبو ديب، ط٢، دار الكتاب الإسلامي، مدينة قم، ١٩٨٤، ص٣٢٨.

فەیلەسوفی بەریتانی (برتراند راسل)ە کە دەڵێ (زانست ڕێگایەك بووە بۆ ناسینی جیهان، بەڵام ئێستا ڕێگایەکە بۆ گۆڕینی جیهان) [١٣].

هەروەها یەکێك لەو دامەزراوە ئەکادیمییانە کۆمەڵەی ئاسیاییە لە پاریس، کە ڕۆژهەڵاتناس (سلفستر دو ساسي) دایمەزراند لە ساڵی (١٨٢٢)دا، کۆمەڵێك ڕۆژهەڵاتناسی گرتەخۆی بە جیاوازی پسپۆڕییانەوە[١٤]. هەروەها کۆمەڵەی شانشینی ئاسیایی لە بەریتانیا و ئیرلەندا (١٨٢٣) کە تایبەت بوو بە کەلەپووری ئاسیایی و (٣٢٤) ڕۆژهەڵاتناسی لەخۆی دەگرت، ئەمەیان گرنگترین دامەزراوەی ڕۆژهەڵاتناسی بوو لەجیهاندا، بووە هۆی دامەزراندنی کۆلیژی زانستە ڕۆژهەڵاتییەکان لە لەندەن، دوای ئەویش قوتابخانەی زانستە ڕۆژهەڵاتی و ئەفریقییەکان دامەزرا، لە دیارترین توێژەرەکانی (تۆماس ئارنوڵد) بوو[١٥]، هەروەها کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتی ئەمریکی(١٨٤٢) بە سەرۆکایەتیی (جۆن بکیرینج)، بە زۆری گرنگیی دەدا بە زمانە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات[١٦]، هەروەها کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتناسانی ئەڵمان بە سەرۆکایەتیی ڕۆژهەڵاتناس (فلایشر)[١٧].

ئەم جۆرە دامەزراوانەی گرنگی بە لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵات دەدەن، لەم سەردەمەی ئێستاشدا هەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆژئاوا نایەوێ ناوی ئەو توێژینەوانە بنێ ڕۆژهەڵاتناسی[١٨]، لەم دواییانەشدا پێشکەوتنی بەرچاویان

---

(١٣) محمود حمد زقزوق، الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، سلسلة كتاب الأمة، العدد٥، الدوحة، ١٤٠٤، ص٥٥.

(١٤) يوهان فوك، تأريخ حركة الاستشراق، ترجمة: عمر لطفي العالم، دار المدار الإسلامي، بنغازي، ط١، ٢٠٠٠، ص٢٠٥.

(١٥) أ.د.عبدالرحمن بدوي، موسوعة المستشرقين، ط٣، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٩٣، ص٥٢٩.

(١٦) يوهان فوك، مصدر سابق، ص٢٩٠.

(١٧) يوهان فوك، مصدر سابق، ص٢٥١.

(١٨) مطبقاني، مصدر سابق، ص٥.

بەخۆیانەوە بینی لەبەر چەند هۆکارێك، ئەمانە گرنگیان دا بە شارستانی و کلتوورەکان لە چوارچێوەی سەرلەنوێ دارشتنەوەی مەنهەج و توێژینەوەکانی ڕۆژهەلاتناسی[١٩]. لەژێر ناوەکانی: ڕۆژهەلاتی ناوین، یان زانستی ئیسلامناسی[٢٠]، لە نێوان دیارترین سەنتەرەکانی تایبەت بە ڕۆژهەلاتناسی: بەشی توێژینەوەی ڕۆژهەلاتی خوارو لە زانکۆی نیویۆرك، زانکۆی جۆرجیای ئەمریکی، سەنتەری لەیەکگەیشتنی ئیسلامی ـ مەسیحی لە زانکۆی جۆرج تاون ١٩٩٣، پەیمانگای توێژینەوە ڕۆژهەلاتییەکان لە زانکۆی مارتن لۆسەر لە ئەلمانیا، پەیمانگای نۆردك بۆ توێژینەوەی ئاسیایی، سەنتەری توێژینەوەی ڕۆژهەلاتی ناوین لە تەکساس[٢١].

ئەم دامەزراوانە بەرهەمێکی زۆر و زەبەندەیان پێشکەش کردووە، بە وەرگێڕانی کتێب و توێژینەوە لە بواری جۆراوجۆردا، گرنگترین پالنەری ئەمانەش سوود وەرگرتن بووە لەم بوارانە بۆ پێشکەوتنی زانستی و شارستانی[٢٢].

**دووەم:** پەیوەستیی ڕۆژهەلاتناسی بە پرۆسەکانی دۆزینەوە و پرۆژە داگیرکاری و وەبەرهێنییەکان: ئەمەش هەر لە سەرەتاوە پەیوەستە بە ڕێنسانسی ئەوروپی و بووژانەوەی پیشەسازی تێیدا، لەگەل پێداویستییەکانی ئەوروپا بۆ دابینکردنی کەرەستە سەرەتاییەکان و بەدەستخستنی سەرچاوەکانی وزە، پاشان گەڕان بە شوێن بازاڕی دەرەکیدا بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی، کە سەریکێشا بۆ ناردنی هەلمەتەکانی دۆزینەوەی جوگرافی و هەولەکانی

---

(١٩) محمود حمد زقزوق، مصدر سابق، ص٥٥، .... مجید خلیفة، ص٣٧.

(٢٠) علي بن إبراهيم الحمد نملة، مصدر سابق، ص١١، المقدمة.

(٢١) محمود زقزوق، مصدر سابق، ص٥٨، وما بعدها.

(٢٢) ينظر: ريتشارد سوذرن، صورة الإسلام في العصور الوسطى، ترجمة: رضوان السيد، بيروت، معهد الإنماء العربي، ١٩٨٤، ص٣٦، وينظر: مطبقاني، مصدر سابق، ص٨.

دۆزینەوەی دانیشتوانی و پاشان کلتووری، سەرەتا بە لێکۆڵینەوە لە زەوی و سەرچاوەکانی و ژینگە و پاشان گەلان و زمانەکانیان، بۆ ئەوەی ببێت بە دەروازەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە کلتوور و ژیاریان، کە دواتر –لە کۆی گشتیدا– دەچێتەوە خانەی دووبارە ئاراستەکردنەوەی بەرهەمهێنان، بەشێوەیەك کە جێی ڕەواج و قبولّ بێت لای ئەو گەلانە، هەموو ئەمانەش بەدەستهێنانی هەندێك لە ڕەگەزەکانی بەرهەمهێنان لە: سەرچاوەکانی وزە و مادده سەرەتاییەکان و دەستی کار و بازاڕی بەکاربەر ئاسان دەکەن.

ڕۆژهەڵاتناسەکان زانیاریی تەواویان سەبارەت بەو دەوڵەتانە خستووەتە بەردەست هەڵمەتەکانی داگیرکاریی کە کەوتوونەتە نێو بازنەی ویستی هێزە داگیرکەرەکانەوە، پاش ئەوەی کە زانیارییەکی زۆریان بۆ ڕەوانە کردوون تا ئەو ویست و نییەتی داگیرکارییەی لەسەر بنیات بنێن، کە دواتر گۆڕرا بۆ پرۆژەو هەڵمەتی داگیرکاریی، نموونەی ئەمەش: لێکۆڵینەوەی ئینسکلۆپیدیایی بەریتانیی سەبارەت بە کەنداوی عەرەبی لەژێر ناوی: (ڕێبەری جوگرافی و مێژوویی کەنداو).[٢٣]

هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکانیش لەگەڵ دەستەی سەرەتایی هێزەکانی داگیرکەری وڵاتانی ڕۆژهەڵات کاریان دەکرد، بۆ ئەوەی زانیاریی پێویستیان بۆ ئەو داگیرکارییە پێ بدەن، لە نێو ئەوانەدا کەسێکی هۆڵەندی هەبووە کە بە (بانگخوازی ئیسلام) وەسف کراوە، کە ناوی (سنوك هور کرونییە)، بووە، کە لە نێو ئەو هێزە هۆڵەندییانەدا –وەك ڕاوێژکاری کارگێڕیی کۆلۆنیاکان لە ساڵی ١٨٩١– کاری کردووە، کە ئیندۆنیسیایان داگیر کردووە،[٢٤]. (سنوك) خزمەتێکی

---

([٢٣]) مطبقاني، مصدر سابق، ص٩.

([٢٤]) د.قاسم السامرائي، الاستشراق بين الموضوعية والانفعالية، ط١، دار الرفاعي، الرياض: ١٩٨٣، ص ١٠٢.

زۆری پێشکەش بە داگیرکەر کرد و زانستەکەی خۆی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردبوو. (٢٥)

هەرچیش پەیوەندیی بە وەبەرهێنانەوە هەیە، هەندێك بانك ڕاپۆرتی دەورییان دەردەکرد، بۆ دۆزینەوەی دەروازە و بوارەکانی وەبەرهێنان لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا، پشتیان بە چەندین سەرچاوەی ڕۆژهەڵاتناسی فرە بوار و پسپۆڕیی دەبەست. (٢٦)

**سێیەم:** وابەستەیی ڕۆژهەڵاتناسی بە دەسەڵاتی سیاسی و نێرراوە دیپلۆماسییە ڕۆژئاواییەکانەوە:(٢٧) ئەمەش خۆی لەو ڕۆژهەڵاتناسانەدا دەبینییەوە کە پێگەی سیاسی و دیپلۆماسییان گرتبوو، بەتایبەت لە نێرراوی وڵاتەکانیان بۆ دەرەوە، ئەمەش وای کرد کە ڕۆژهەڵاتناسیی لەگەڵ پاڵنەرە سیاسییەکان تێکەڵاو بێت، کە لە چەند دیاردە و ئەرکێکدا دەرکەتن، کە سەرجەمیان لەسەر بەرژەوەندیی بنیاتنرابوون و وڵاتە ڕۆژئاواییەکان ـ نێرراو و نوێنەرەکانیان و لەنێویشیاندا ڕۆژهەڵاتناسەکان ـ هەوڵی بەدیهێنانیان دەدان.

هەروەها ڕۆژهەڵاتناسی پەیوەست بوو بە دەسەڵاتی سیاسییەوە هەر لە بنیاتنانی دامەزراوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و دابینکردنی لایەنی داراییان و ئاراستەکردنیانەوە، تا گرنگیدان بە چەند بابەتێك بەتایبەتی، ئەوەتا قوتابخانەی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتی و ئەفریقییەکان لە زانکۆی لەندەن، بە هاندانی پەرلەمانی بەریتانی دامەزرێنرا و ـ پاش جەنگی جیهانیی دووەم ـ حکومەتی بەریتانی لیژنەی بەدواداچوونی هۆکارەکانی کەمبوونەوەی دەسەڵاتی بەریتانی لە جیهاندا

---

(٢٥) انظر ترجمته بتوسع في كتاب الدكتور قاسم السامرائي. مرجع سابق الصفحات ١١٠-١٤٠.

(٢٦) مطبقاني، مصدر سابق، ص ٩.

(٢٧) راجع كتاب ، عبد الله يوسف سهر، محمد، مؤسسات الاستشراق والسياسة الغربية تجاه العرب والمسلمين، مركز الإمارات والبحوث الاستراتيجية، ط١، ٢٠٠١.

دروست کرد، کاری کرد بۆ چارەسەرکردنی لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی لە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا و پاشان پشتیوانیکردنی دامەزراوە ڕۆژهەڵاتناسییە بەریتانییەکان، بەپێی دەرەنجامەکانی ئەو لیژنەیە و ڕاسپاردەکانی،[٢٨] و (برنارد لویس) خزمەت و ڕاوێژەکانی پێشکەش بە حکومەتی بەریتانی کرد پاش ئەوەی هەستا بە ئەنجامدانی گەشتێك بۆ زانکۆ ئەمریکییەکان و ئەنجامدانی چەندین چاوپێکەوتنی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی لە ساڵی ١٩٥٤، زیاتر لە جارێك ڕاوێژی خۆی پێشکەش بە کۆنگرێسی ئەمریکی کرد و لە ساڵی ١٩٧٤ وانەیەکی بۆ ئەندامانی لیژنەی کاروباری دەرەکیی لە کۆنگرێسی ئەمریکی، لەمەڕ دۆزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێشکەش کرد.[٢٩]

هەر لەو چوارچێوەیەدا حکومەتی ئەمریکی ئەرکی دارایی هەندێك لە دامودەزگا ڕۆژهەڵاتناسییەکانی گرتە ئەستۆ، هانی هەندێك لە کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەتی دا بۆ بەڕێوەبردنی لایەنی داراییان و پشتیوانیکردنیان، لە نێویاندا کۆمپانیای فۆرد.[٣٠]

هەروەها حکومەتی بروسیا پشتیوانییەکی دارایی ساڵانەی پێشکەش بە کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتناسە ئەڵمانییەکان دەکرد، ئەمە وێڕای ئەو پشتیوانییە سویدی و نەرویجی و نەمساوییە دارایی و وەقفییەی کە هەیبوو،[٣١] هەرچی پەیمانگای هامبورگی داگیرکاریش بوو حکومەتی ئەڵمانی دروستی کردبوو، بۆ

---

([٢٨]) مطبقاني، مصدر سابق، ص ١٠.

(29) C. E. Bosworth، et al.(ed.) *The Islamic World From Classical To Modern Times.* (Princeton،1989)p. p. IX-X and Also Who's Who in the USA 1989.

([٣٠]) مطبقاني، مصدر سابق، ص ١١.

([٣١]) يوهان فوك، مصدر سابق، ص ٢٥١.

ئەوەی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ گەلانی عەرەبی و ئەفریقیدا بە سەرۆکایەتیی (کارل هاینرتش بیکر) (١٨٧٦-١٩٣٣) هاوکاریی بکات.

هەروەها (دی ساسی) لای حکومەتی فەرەنسی کاری دەکرد و ئەو بەیاننامانەی وەردەگێڕا کە لە کاتی داگیرکردنی جەزائیر و داگیرکردنی میسردا لە ساڵی ١٧٩٧ دەری دەکردن.

ئینتیمای هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکانیش ئەو پەیوەندییەی سەلماند کە لە نێوان لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و ئامانج و سیاسەتە حکومییەکاندا هەبوو، بەتایبەت سیاسەتی دەرەکییان. ئەوەشی ئەمەی پشتڕاست کردووەتەوە، ئەوەیە کە زۆرێك لە دیپلۆماتەکانی حکومەتە ڕۆژئاواییەکان هەستاون بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی ڕژهەڵاتناسی و لە نێویشاندا لێکۆڵینەوە لە ئیسلام و موسڵمانان، نموونەی ئەمانە: ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (رینیە بیست) کە وەك قونسوڵگەرێکی فەرەنسی لە جەزائیر کاری دەکرد، هەروەها (إمیلیو جارسیا جومین) کە وەك باڵوێزی وڵاتەکەی لە بەغداد و لوبنان کاری دەکرد، (جورج رنتز)یش لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە قاهیرە کاری دەکرد. [٣٢]

**چوارەم:** وابەستەیی ڕۆژهەڵاتناسی بە بیری تەبشیری و هەڵمەتەکانی بەگاورکردنەوە: ڕۆژهەڵاتناسی لەگەڵ بەگاورکردندا لە بازنەی سەنگەرگرتن دژی ئیسلام و موسڵمانان یەکیان گرت، لە چوارچێوەی دوژمنداری و ترسیان لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام و بانگەشەکەی و هەڵگەڕانەوەی گاورەکان و هاتنە نێو ئیسلامیانەوە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو جەنگی خاچپەرستییەی کە نزیکەی دوو سەدە درێژەی کێشا (١٠٩٥-١٢٩١)، ئەمەش (بیرۆکەی تەبشیر)ی هێنایە بوون و گۆڕیی بۆ (ستراتیژیەتی بەگاورکردن) کە ئامانجی وڵاتانی ئیسلامی، یان ئەو ناوچانە بوو لە ئەفریقا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە بانگەوازی ئیسلام پێی

---

([٣٢]) نفس المصدر السابق.

گەیشتبوو،[٣٣] هەروەك چۆن ئەو پەیوەندییە بە ڕوونی دەردەکەوێت لە پەیوەستیی هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بە قوتابخانە لاهوتییەکان، یان کارکردنیان لە هەندێك کاری تەبشیری و بەگاورکردندا، یاخود بە کارکردن لە لای هەندێك لە دامودەزگاکانی کڵێسا، یان بەو نووسینانەیان کە بە شێوەیەك بن خزمەتی هەموو ئەمانە بکەن.

هەندێك لەو زانایانەش کە گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە ڕۆژهەڵاتناسی دەدەن، جەختیان لەوە کردووەتەوە کە سەرەتاکانی ڕۆژهەڵاتناسی پەیوەستە بە هەوڵی قەشەکان بەو ئاراستەیەدا، لە ڕیزی پێشەوەیاندا قەشەی فەرەنسی (جربت) بوو کە پاپای هەڵبژێرراوی کڵێسا بوو لە ساڵی ٩٩٩ز. (جربر ئورغليك) (٩٣٨–١٠٠٣)ز، کە پاپای کڵێسا بوو و نازناوی (سلفستری دووەم)ی لێنرابوو، بوتروسی بەڕێز (١٠٩٤–١١٥٦)ز، کە سەرپەرشتیاری دەیر (خانووی قەشەکان) بوو لە فەرەنسا، هەروەها قەشە (تشستر)، قەشە (تۆما ئەکوینی) (١٢٢٥–١٢٧٤)ز، کە بە گشتی گرنگیدانیان بە ڕەخنەگرتن لە ئیسلام هەبوو.[٣٤]

(سیلفستر دی ساسی)ش لای هەندێك لە قەشەکان خوێندبووی، لە نێویاندا: قەشە (مور) و (الأب ارتارو)، پاشان عەرەبی و فارسی و تورکیی خوێندووە، هەروەها لە نێو ڕۆژهەڵاتناسەکاندا چەند قەشەیەکی تر هەبوون: قەشەی فەرەنسی (الأب لويس جاردية) و (الأب لامانس( کە بە ڕەچەڵەك بەلجیکی و بە ڕەگەزنامە فەرەنسی بوو.

(جۆرج سیل)یش لە سەرەتادا دەستیکرد بە خوێندنی لاهووتی، پاشان خۆی فێری عەرەبی و عیبری کرد، لە دیارترین کارەکانیشی وەرگێڕانێتی بۆ

---

(٣٣) أ.د. علي بن إبراهيم الحمد النملة، مصدر سابق، ص ١٥.

(٣٤) د.مصطفى السباعي، الاستشراق والمستشرقون ما لهم وما عليهم، دار الوراق، والمكتب الإسلامي، ص١٧.

واتاكانی قورئانی پیرۆز، كه پێشەكییەكی بۆ نووسیوه و زۆرێك شتی هەڵبەستراو و گومانلێكراوی تێكەڵ كردووه، (ولیام میور)یش كەسێكی ڕۆژهەڵاتناس و موبەششیر و كارگێڕیی ئینگلیزی بوو، كه بەشداریی له كارەكانی كۆمەڵەی بەگاوركردن له هندستان كرد و پەرتوكێكی بۆ پشتیوانیكردنی هەوڵەكانی بەگاوركردن دانا لەژێر ناوی (گەواهیی قورئان لەسەر پەڕاوه یەهودی و مەسیحییەكان)، پەرتوكێكی تری سەبارەت به قورئان به ناونیشانی (قورئان: دانان و ڕێنماییەكانی/ القرآن تألیفه وتعالیمه) دانا، (ئەندرۆ وات)ی كوڕی ڕۆژهەڵاتناس (مونتجمری وات) وەك قەشەیەكی سەرپەرشتیاری چەند كڵێسەیەك له لەندەن و ئەدینبره كاری دەكرد، هەروەها وەك پسپۆڕێك له ئیسلامدا لای قەشەی ئینجلیكانی له قودس كاری دەكرد، (هنری لامانس)یش له كۆلێژی یەسوعی له بەیرووت خوێندوویەتی و ژیانی قەشەیەتی دەستپێكرد، لەكاتێكدا كه زۆر دەمارگیر بوو له دژی ئیسلام و نموونەیەكی خراپ بوو بۆ توێژەران له مەسەلەكانی ئیسلامدا و وەك فێركەر له كۆلێژی یەسوعی له بەیرووت كاری دەكرد، ئەركی بەڕێوەبردنی گۆڤاری (البشیر)ی بەگاوركەری گرتبووه ئەستۆ،[٣٥] زۆربەی هەوڵەكانی (ماكدونالد) (١٨٦٣-١٩٤٣)ز،یش له چوارچێوەی بەگاوركردندا چڕ بووبووەوه، ئەمه وێڕای گرنگیدانی به زانستی كەلام له ئیسلامدا.[٣٦]

ئەوەی جێی ئاماژەیه، پەیوەستیی بەگاوركردنه به دامەزراوەگەلێكەوه، كه له وڵاته ئیسلامییەكاندا دروست دەكران و شوێن (سەنتەرەكانی دایك)یان له

---

(٣٥) أ. د. عبد الرحمن بدوي ، موسوعة المستشرقين ، مرجع سابق. لەگەڵ ئەوەی زۆرێك له ڕۆژهەڵاتناسان ڕەخنه له میتۆدەكەی لامانس دەگرن، له هەمان كاتدا دەبینیت بۆی دەگەڕێنەوەو پشت به هەندێك له (ڕا)كانی دەبەستن، لەوانه )توماس آرنولد) له پەرتووكەكەیدا (جێنشینی).

(٣٦) أ.د. عبد الرحمن بدوي، مصدر سابق، ص ٥٣٨.

ولّاتانی ڕۆژئاوا دەکەوتن، بۆ ئەوەی بتوانن بەریەککەوتنیان لەگەڵ ئەوانەدا هەبێت کە دەکەونە چواچێوەی ئامانجی دامودەزگاکانی بەگاورکردن و هەڵمەتەکانیانەوە، زۆرێکیش لەو دامەزراوانە باس کراون،[٣٧] لە نێویاندا ئەوانە باس دەکەین ـ کە لە سەردەمی خۆماندان ـ : نەخۆشخانەی مەعمەدانی لە جیبلە، لە شاری ئیب لە یەمەن، کتێبخانەی مەعمەدانیە لە عەممان، لە ڕێگەی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەوانەی سەردانیان دەکەن، توێژەر ئەزموونێکی تایبەتی لەگەڵیاندا هەیە، کە چالاکییەکانی بەگاورکردنیان و شێوازەکانی دەروازەکانی چوونەنێویانەوە، بوونی پەیوەندیی لە نێوانیاندا و شوێنەواری بەگاورکردن بەسەر سادەموسڵمانان و کەمداهاتەکانیانەوە دەسەلمێنێت، ئەمەش جەخت لە ڕۆڵی دەسەڵات و دەمەزراوەکانی کۆمەڵگە لە هوشیاکردنەوە و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی تاکەکانی بەو وەسفەی ئامرازگەلێکی پارێزگارین، دەکاتەوە.

**پێنجەم:** وابەستەیی ڕۆژهەڵاتناسی بە بزووتنەوەی زایۆنیزمی و کلتووری ئیسرائیلییەوە: ئەمەش لە چەند بابەتێکدا ڕەنگ دەداتەوە لە نێویاندا: ڕاگەیاندنی ئینتیمای ڕاشکاوانەی هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ زایۆنیزم، بۆ نموونە (برنارد لویس)،[٣٨] هەروەها ئەوەی کە (مکسیم رودنسون)ی فەرەنسی (١٩١٥)، سەبارەت بە (ئیسرائیل و ڕەتکردنەوەی عەرەبی) نووسیویەتی، (دیفید صموئیل مرجلیوس)یش گرنگیی بە لێکۆڵینەوە لە زمانە سامییەکان دا و

---

[٣٧] وەك زانکۆی یەسوعی و زانکۆی ئەمریکی لە لوبنان، زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە و ئەستەنبوڵ، کۆلێجی فەرەنسی لە لاهور. محمد البهيّ، المبشرون والمستشرقون في موقفهم من الإسلام، مطبعة الأزهر، (الجامع الأزهر/الإدارة العامة لثقافة الإسلامية)، بلا تاريخ ص ٩-١٠.

[٣٨] أ.د. علي إبراهيم الحمد النملة، ص ١٦. وينظر" د. مازن مطبقاني، الاستشراق والاتجاهات الفكرية في التاريخ الإسلامي، دراسة تطبيقية على كتابات برنارد لويس، الرياض، مكتبة الملك فهد الوطنية، ١٤١٦هـ، ١٩٩٥م، ص ٧٢-٧٣.

سەبارەت بە (پەیوەندییەکان و عەرەب و یەهود) نووسیویەتی، (بول کراوس)یش کە یەهودی بوو، کۆچی بۆ فەلەستین کرد و لە قوتابخانەی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆی عیبری لە قودس خوێندوویەتی، دواتر بۆ بەدەستهێنانی دکتۆرا چووە بۆ بەرلین، (ئیجناز جولدزیهر)یش کە لە خێزانێکی یەهودی بووە و خاوەن کاریگەریی بوو لە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکاندا، نووسینەکانی بە زمانە جیاوازەکانی ئەوروپا بڵاو بوونەوە. (٣٩)

ڕۆژهەڵاتناسیی ئیسرائیلی لەسەر چەند شتێك وەستاوە، لە دیارترینیان:

**یەکەم:** پەیوەستیی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بە مەورووسی تەوراتی و هەنگاونان لەو سۆنگەیەوە و ڕەچاوکردنی.

**دووەم:** پەیوەستبوونی بە کێشەی جێنشینکردنی جوولەکە لە فەلەستین و جەختکردنەوە لە پەیوەستیی مێژوویی جوولەکە بە فەلەستین. (٤٠)

**سێیەم:** ڕەچاوکردنی بوونی ئیسرائیل و ئاسایشەکەی.

**چوارەم:** گەڕان بەشوێن نیشتمانی ئەلتەرناتیڤدا ـ لە چوارچێوەی گرنگیدان بە داهاتووی ئیسرائیل ـ نەك تەنها بۆ فەلەستینییە ڕاگوێزراوەکان، بەڵکو بۆ جوولەکە ئیسرائیلییەکانیش خۆیان، لەنێویاندا هەندێك لە وڵاتانی مەغریبن پاش دۆزینەوەی تایبەتمەندییە فرە بوارەکانی لە لێکۆڵینەوەکانیاندا، ئەمەش لەگەڵ ئەوەدا یەتەوە کە لە (یەکەم)دا هاتووە لە بیروباوەڕیان بە لەناوچوونی ئیسرائیل.

---

(٣٩) لەو توێژینەوە تەواوکارییانە لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (أساليب المستشرق قولدزيهر في عرضه للإسلام: دراسة استقرائية) کە خوێندکار عەلی عەبدوڵڵا مەحفوز، لە ساڵی ١٤١٠دا پێشکەشی کردووە.

(٤٠) محمد جلاء إدريس، الاستشراق الإسرائيلي، العربي للنشر، ط١، القاهرة: ١٤١٦هـ/١٩٩٥م، ص٨٧. وينظر" إبراهيم عبد الكريم، الاستشراق وأبحاث الصراع لدى إسرائيل، دار الجيل للنشر، عمان، ط١، ١٩٩٣م.

## تەوەری دووەم:

## لە دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان لەسەر پێشکەشکردنی بابەتییانەی ئیسلام

ئەم تەوەرە ئەو هەوڵە بابەتییانە دەخاتە ڕوو، کە ڕۆژهەڵاتناسەکان لە بواری لێکۆڵینەوە لە ئیسلام ئیزافەیان کردووە، لە نێویاندا دەکرێت هەندێکیان لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە:

**یەکەم:** لێکۆڵینەوە لە ئیسلام بە زمانی دایکی ـ مەبەستم عەرەبییە ـ پاش فێربوونی، تەنانەت پسپۆڕبوون بە لێکۆڵینەوەی و وتنەوەی و تێپەڕاندنی لێکۆڵینەوە لە ئیسلام و مەسەلەکانی، لە ڕێگەی پشتبەستن بە پەرتووکە بیانییەکان، ئەو پەرتووکانەی کە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بەوە وەسفیان دەکەن کە گومڕاکەرن و لە ڕاستییەوە دوورن، چونکە لایەنگری دەکەن و بە ناڕەوا دوژمنایەتییان لە ناخیاندا لە دژی ئیسلام شاردووەتەوە. لێرەدا —ئەگەر بەشێوەیەکی بەشەکیش بێت— ڕاستکردنەوەیەك هەیە بۆ دیدی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام، ئەو ئیسلامەی —کە پێش بڵاوبوونەوەی هەندێك لە لێکۆڵینەوە بابەتییەکانی ڕۆژهەڵاتناسان— بە جۆرێك هەڵبەستن (التلفيق)، نموونەیەك بۆ شتی پڕوپووچ (الأباطيل)، بوارێك بۆ ئەندێشە، وەسف دەکرا، تا گەیشتبووە ئاستێك کە کڵێسەی ڕۆمانی خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانەی قەدەغە کرد، کە سەبارەت بە ئیسلام ئینصافیان تێدایە، چونکە بابەتیین ـ واتە نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کلتووری ڕۆژئاوایی باو، ئیسلام بە کۆمەڵە کەموکوورییەك وەسف ناکەن کە هیچ پەیوەندیی پێیانەوە نییە ـ بەتایبەت پەرتووکی مامۆستای زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆی (أوترشت)ی هۆڵەندی: (هادريان ريلاند) (١٦٧٦–١٧١٨) کە بە: (دينی موحەممەدی) ناو نراوە و لە پێشەکییەکەیدا ئەو درۆیەی گاورەکان ڕوون دەکاتەوە کە بە پاڵنەری ڕق و کینەیان و دوور لە بابەتیبوون،

وەسفی ئیسلامیان پێ کردووە. (ریلاند) بابەتیبوونی خۆی بۆ غیرەتی بەرامبەر مەسیحییەت و بەرگریکردن لە پێگەکەی گێڕاوەتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانێت کەمین لە ئیسلام بگرێت و کەموکووڕیی لێ بدۆزێتەوە و ئەمەش ببێت بە دەروازەیەك بۆ هەڵوەشانەدنەوەی،[٤١] ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە بابەتیبوونی ئەوەیە کە سەبارەت بە ئیسلام نووسیویەتی.

**دووەم:** فەراهەمکردنی سەرچاوەگەلێکی بابەتی لەسەر ئیسلام بە زمانە بیانییەکان، کە ـ ئەگەرچی تا ئەندازەیەکی دیاریکراویش بێت ـ ئەو هەڵوێستە نێگەتیڤە لایەنگرەی بۆ مەسیحییەت و دژ بە ئیسلامی تێپەڕاند، لەوانە ـ لەپاڵ ئەوەی کە سەبارەت بە (ریلاند) باسمان کرد- پێشەکییەکەی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی: (جورج سل) (١٦٩٧-١٧٣٦) کە کردی بە ڕیخۆشکارێك بۆ وەرگێڕانی بۆ قورئانی پیرۆز، لە پاڵ ئەوەی کە (ریلاند) لەسەر ئیسلام نووسیبووی، (جۆرج سل) بە نیوە موسڵمان دانراوە، لەگەڵ ئەوەی کە لە زۆر شوێندا بە خراپی باسی ئیسلامی کردووە، هەروەك زۆرێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانەی کە لێکۆڵینەوەکانیان بە جۆرێك لە بابەتیبوون وەسف کراوە.

(جار سین دی تاسی)یش تەکانێکی دا بە نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان، کاتێك لە نێو نووسینەکانیدا چەند دەقێکی قورئانی پرۆزی دەهێنا، بەڵکو چەند پەرتووکێکیشی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و فیقهدا وەرگێڕاوە.[٤٢]

(سنوك هورنجورجنە)ی ڕۆژهەڵاتناسیش چەند سەرچاوەیەکی گشتگیر و فرەبواری لەمەڕ ئیسلام و مەسەلە جیاوازەکانی پێشکەش کرد، کە هەر لە دین و کاریگەریی لەسەر کۆمەڵگەی عەرەبی کە کۆمەڵگەیەکە قورئانیان تێدا دابەزیوە، درێژ دەبێتەوە بۆ ژیاننامەی پێغەمبەر و دامەزراوە دینییەکان، بیناسازیی

---

([٤١]) جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص ١٠٧- ١٠٨.

([٤٢]) جوستاف بفانمولر، ص١١٣-١١٤.

ئیسلامی و کەڵەکەبووی ئایینەکانی تر لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی لە سۆفیگەری.[٤٣]

ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (کارادی فو) کاریگەرییەکی گرنگی هەبوو لە لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکانی ئیسلام لە ڕووی: بیروباوەڕ و فەرموودە و مێژووەوە.[٤٤]

**سێیەم:** بەشداریکردن لە فەراهەمکردنی سەرچاوەگەلێکی تایبەتمەند لە بوارەکانی زانستە ئیسلامییەکاندا –ئەمە لە پاڵ ئەو ڕێژە زۆرەی پەرتووکی کەلەپوری ئیسلامیی وەرگێڕراو– لەو بوارانە: یاسادانان و دەروازەکانی فیقە هەر لە بیروباوەڕەوە، تا ڕەوشت و سۆفیگەری، دەمەوێت بە تایبەت ئاماژە بە بەشدارییەکانی ڕۆژهەڵاتناس (مرادجیا دوهسون) بکەم.[٤٥]

**چوارەم:** لێکۆڵینەوە لە ئیسلام لە چوارچێوەی ڕێسا ژیارییە جێگیرەکاندا، ئەوەتا (ئەلفرید فون کریمر) ڕەوتی ژیاری ئیسلامی لەوەی کە بووە و کە دەبێت لە چوارچێوەی سیانەی: الله، پێغەمبەرایەتی و دەوڵەتدا،[٤٦] ئەمەش کارێکە بوارێکی فراوان بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیسلام دەکاتەوە، لە چوارچێوەی بیرکردنەوەیەکی میتۆدییانەدا، کە دەرگا بە والایی دەهێڵێتەوە بۆ ئەوانەی کە گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە ئیسلام و شارەزابوونی لە گۆشە جیاوازەکانیەوە دەدەن، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە ئەم حاڵەتە چەند دەروازەیەکی عەقڵیی هەبوو، باسی لە چەند مەسەلەیەکی دابەزێنراو دەکرد.

---

(٤٣) جوستاف بفانمولر، المصدر السابق. ص ١٢٢- ١٢٤.

(٤٤) جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص ١٤٦-١٤٨.

(٤٥) ڕاپەڕێنەری کار "قائم بأعمال"ی پادشای سوید بوو لە کۆشکی ئەستەنبوڵ، لە ١٧٤٠ز لە دایك بووە. انظر، جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص ١١٠-١١١.

(٤٦) جوستاف بفانمولر، ص١٢٠-١٢٢.

**پێنجەم:** جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام شۆڕشێکی ڕاستسازیی بیروباوەڕیی کۆمەڵایەتییە، کە لە دەرەنجامدا جەختی لە بیرۆکەی یەکسانی کردووەتەوە، با بە شێوەیەك لە پلەبەندییش بووبێت، ئەم دوو مەسەلەیەش لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسی مەجەڕی: (أجناتس کولد تسهیر) (١٨٥٠-١٩٢١) جەختی لێ کراوەتەوە.[٤٧]

**شەشەم:** لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئیسلامی لە چوارچێوەگەلێکی تیۆریی پەرەسەندووی کەڵەکەئامێزدا (تراكمية)، لەوانەش لێکۆڵینەوەی (ماکدونالد) (١٨٦٣-١٩٤٣)، [٤٨]بۆ هەریەك لە: پەرەسەندنی زانستی کەلام و فیقهـ و تیۆری دەستووری لە ئیسلامدا، تیۆری سیاسی لە ئیسلامدا، دامەزراوە سیاسییەکان، لێکۆڵینەوەکانیشی ڕوونی و گرنگیدانی بە ئەو کاتەی موسڵمانانی تێدا بوو، ئەو ساتەوەختەی ئەو تێیدا ژیا، لێکۆڵینەوەکانی دیارترینی ئەو لێکۆڵینەوانە بوون کە بەگاورکەرەکان لە چوارچێوەی بزووتنەوەی تەبشیریدا پشتیان پێ دەبەست، بۆ ناسینی ئیسلام و موسڵمانان و دیاریکردنی دەروازەکانی بەگاورکردنیان.[٤٩]

**حەوتەم:** لێکۆڵینەوە لە نیگا و دابەزین (الوحي والتنزُّل)، ئەوەی کە نیگا چارەسەری کێشە و مەسەلەکانی کۆمەڵگەی موسڵمانی کردووە، لەسەردەمی پێغەمبەر موحەممەددا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەوەش ئەو سەردەمەیە کە قورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیوە، لەگەڵ ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوانە دان بە دابەزینی نیگادا دەنێن بۆ سەر پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەڵام

---

([٤٧]) جوستاف بفانمولر، ص١٢٤-١٢٩.

([٤٨]) ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەمریکییە، وەك مامۆستا (أستاذ) لە پەیمانگای لاهوت لە هارت فۆرد کاری کردووە، (صمویل زویمر) بەشداریی لە دامەزراندنی (گۆڤاری جیهانی ئیسلام)دا کردووە، (سارتون)یش بەشداریی لە دامەزراندنی گۆڤاری (إیزیس)دا کردووە. انظر"جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص١٢٩.

([٤٩]) جوستاف بفانمولر، ص١٢٠-١٢٢.

وایان داناوه كه قورئان وەڵامی پرسیارگەلێكی زۆری نەداوەتەوە، بەتایبەت ئەوانەی كه لە سیاقی كۆمەڵگەی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی دەرچوون، كه دواتر پێویستیان به هەوڵی مرۆیی بووه –له موسڵمانان: هاوەڵان و شوێنكەوتووان– كه چارەسەریان بكەن، لەو لێكۆڵینەوانە لێكۆڵینەوەكانی ڕۆژهەڵاتناس (مرجليوس)[٥٠] سەبارەت به ئیسلام لە چوارچێوەی لێكۆڵینەوە لە ئایین و ژیاری مرۆیی.[٥١]

ئەم مەسەلەیە دەرگا لەبەردەم ڕاگەیاندنی مەسەلەی جیهانێتی ئیسلام والا دەكات، هەر لە چوارچێوەشیدا چارەسەر دەكرێت، چونكه ئاماژە به پێویستیی دەستپێكردن دەكات لە بنچینە ئیسلامییەكان و دەقەكانەوە – بەو وەسفەی لە نەگۆڕەكانی بەردەوامین – بۆ چارەسەركردنی واقیع و گۆڕاوەكانی، بەو وەسفەی بوارێكی كاراكردنی پێداویستییەكانی بەردەوامین، لە چوارچێوەی جڵەوگیری و ئاراستەكردندا.

**هەشتەم:** لێكۆڵنەوەگەلێك كه جەختیان لەوە كردووەتەوە كه ئیسلام ئایینێكی سەربەخۆیە، واتە ئیسلام دەرەنجامی كەوتنە ژێركاریگەریی ئایینەكانی پێش خۆی نەبووە، بەتایبەت ئاسمانییەكان، لە شوێنەوارەكانی ئەم ڕاستییەش بوونی یەكەیەكی سەربەخۆی كۆكەرەوەیە بۆ ژیاری ئیسلامی، كه لەسەر ئایین بنیات نرابێت، مەبەستیشمان پێی لێكۆڵینەوەی: (برونو فيوليت)ـه[٥٢]، كه لە لێكۆڵینەوەكەی و هەڵێنجانی دەرەنجامەكانیشیدا پشتی به قورئان بەستووە.

---

(٥٠) ڕۆژهەڵاتناسێكی ئینگلیزییە، (١٨٥٨-١٨٤٠)، جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص ١٣٥.

(٥١) جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص١٣٥- ص ١٣٧.

(٥٢) ڕۆژهەڵاتناسێكی ئەڵمانییە، خاوەنی پەرتووكی: (الدين الإسلامي وحضارته)وە. انظر" جوستاف بفانمولر، المصدر السابق، ص١٣٩- ص ١٤٠.

**نۆیەم:** لێکۆڵینەوەگەلێك کە جەختی لە مەسەلەی یەکتاپەرستی کردووەتەوە لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە لە ئایینە یەکتاپەرستییە نامەسیحییەکاندا، بە تایبەت ئایینی ئیسلامی، لێرەدا بە دیاریکراوی مەبەست لە لێکۆڵینەوەکەی (هانز فون شوبرت)ـە.[٥٣]

لێکۆڵینەوەگەلێکی تریش هەن کە جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئیسلام ئایینێکی پاککەرەوەیە، بۆ لادانەکانی شوێنکەوتووانی ئایینەکانی تر، بەتایبەت یەهودیەت و مەسیحیەت، هەروەها ئاماژە بە نیگا دەکەن بۆ پیاوێك ـ لە مەککە ـ لە دەرەوەی بازنەی ئەو دوو ئایینەیە، ئەمەش بابەتێکە کە لێکۆڵینەوەکە بە جۆرێك لە سەرسوڕمانەوە باسی کردووە، چونکە پێشبینیی ئەوەی کردووە کە ئەو پێغەمبەرە پاککەرەوەیەی کە نیگای بۆ هاتووە، یەکتاپەست بێت ـ بە گریمانە ـ بەڵام لەو دوو ئایینە بێت، ئەمەش حاڵەتێکە کە لە دەرەنجامدا ـ بە چاونوقاندنیش لە لادانی لێکۆڵینەوەکە لە ڕاستی ـ مەسەلەی لێکۆڵینەوە لە یەکتاپەرستی دەوڵەمەند دەکات و دەروازەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکاتەوە، ئەمە وێڕای دانان بەو کەموکورتییانەی تووشی یەهودیەت و مەسیحیەت بووە لە یەکتاپەرستیدا، پاڵنەرێکە بۆ گەڕان بەدوای ئەلتەرناتیڤێکی یەکتاپەرستی، کە پشت بە میتۆدێکی یەکتاپەرستیی ڕەوا ببەستێت. بەتایبەت لێکۆڵینەوەکەی (ئەسفالد شبنجلر).[٥٤]

**دەیەم:** هەندێك لە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانیش ئاماژەیان بە جیهانیبوونی ئیسلام داوە، لە نێویاندا لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتناس (فرانس

---

(٥٣) ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە، پەرتووکێکی لە ساڵی ١٩٢٠ بە ناوی: (وضعنا الديني الكنسي في صلاته التاريخية) نووسی.

(٥٤) ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە، لە پەرتووکەکەیدا (غروب الحضارة الغربية)، تاووتوێی ئەوە دەکات کە باسمان کرد. انظر" جوستاف بفانموللر، ص١٤٢.

بول)[٥٥] له پەرتووكەكەیدا (ئاینزای موحەممەدی بەو وەسفەی دینێكی جیهانییە)، ڕۆژهەڵاتناس (أویستروب)یش ئاماژەی بە جموجووڵی یەكێتیی ئیسلامی داوە.[٥٦]

## تەوەری سێیەم:

## لە شوێنەوارەكانی ڕەهەندی خودی و پێودانگی ڕۆژهەڵاتناسەكان لەسەر گەڵاڵەكردنی دیدی نێگەتیڤ لەمەڕ ئیسلام

لە دیارترین ئەو شتانەی كە دەگونجێت لەم چوارچێوەیەدا جێی ببێتەوە، مەسەلەگەلێكن كە چەندین لێكۆڵینەوە تۆماریان كردووە، ئەو لێكۆڵینەوانە گرنگییان داوە بەو شوێنەوارانەی كە لە ڕۆژهەڵاتناسی كەوتووەتەوە، لە لێكۆڵینەوەیان بۆ ئیسلام و نووسین لەبارەیەوە. دەكرێت ئەو مەسەلانە لەو خاڵانەدا كورت بكەینەوە كە بە شێوەیەكی بابەتییانە پۆلێن كراون، كە بەهانە و پاڵنەرەكانی ئەو هەڵوێستە خودییانە ڕوون دەكەنەوە، كە سروشتێكیان وەرگرتووە بریتی بووە لە دوژمنایەتی بەرامبەر بە ئیسلام، یان ڕووبەڕووبوونەوەی فراوانبوونی و بانگەشەكەی، یاخود لانی كەم ڕەخنەلێگرتنی.

هەڵوێستی ڕۆژهەڵاتناسەكان ـ هاوتا لەگەڵ ڕۆژئاواییەكان بەگشتی ـ لەسەر هەستی كینە بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان و لایەنگیریكردن (الانحيازية) و بەزاندنی بنچینەكانی توێژینەوەی زانستی، بنیاتنراوە، ئەمەش لەژێر كاریگەریی كەڵەكەبوونی دوژمنایەتی و ڕقلێبوونەوە بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان

---

(٥٥) ڕۆژهەڵاتناسێكی دانیماركییە، پەرتووكەكەی لە ١٩١٤ بڵاوكردەوە. انظر" جوستاف بفانموللر، المصدر السابق، ص١٤٣.

(٥٦) ڕۆژهەڵاتناسێكی دانیماركییە، توێژینەوەگەلێكی هەمەجۆری سەبارەت بە ئیسلام هەیە. جوستاف بفانموللر، المصدر السابق، ص١٤٤.

دروستبووه، ئەمەش لە ناوەرۆکی گەواهییەکەی ڕۆژهەڵاتناس (لیوپولد فایس)دا هاتووە کە بریتییە لە (موحوممەد شێرە/ محمد أسد)، کە جەختی لەوە کردەوە قەیرانی تاکی ئەوروپی لە ڕقلێبوونەوەی و سووکسەیرکردنی بۆ هەموو ئایین و کلتوورەکانی تردا ـ تەنها ئایین و کلتووری خۆی نەبێت ـ چڕ دەبێتەوە، ئەمەش وای کردووە کە توێژینەوە لە ئیسلام و موسڵمانان ببێت بە ڕاوکردنی هەڵەکان و گەڕان بەشوێن کەموکورتییەکاندا، وەك ئەوەی کە توێژینەوەکە دادگاییکردنێك بێت کە مەبەست لە پشتیەوە بەتاڵکردنەوەی بانگەشەکانی ئیسلام و لەمپەردانان بێت بۆ بانگەوازەکەی، ئەمەش لەژێر کاریگەریی کەڵەکەبووەکانی ئەو کلتووری شکستهێنانەی کە کلتووری ڕۆژئاوایی سروشتی پێی گرتووە بەرامبەر بە ئیسلام، لەو کاتەوەی لە جەنگی خاچپەرستاندا بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان شکستیان هێناوە.[٥٧]

**یەکەم:** کاتێك هەندێك لە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان ئاماژەیەکیان بە ڕەهەندی جیهانێتیی ئیسلام دا، هەندێکیان مەبەستیان لێی ئاگاییدان بوو لە مەترسیی تەشەنەکردنی ئیسلام، چونکە جیهانێتییەکی هەبوو بەو وەسفەی یەکێك بوو لەو تایبەتمەندییە گشتییانەی، کە بنچینەداڕێژەری بانگەشەکردن بوو بۆی، ئەمە بوو کە –بەشێوەیەکی شێوێنراو– هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان پەییان پێ بردبوو، بابەتەکەیان لە بازنەی بانگەشەوە گواستبووەوە –ئەو بانگەشەیەی کە ماددەکەی باسی گوتار دەکات، بزاوتی کارلێککردنی گوتارییشی لەسەر بنەمای ڕقلێنەبوونەوە بنیات نراوە، مەبەستە باڵاکەشی لەسەر ڕەحمەت بۆ جیهانیان بنیات نراوە، لەسەر مەبەستەکانی لە: ڕەچاوکردنی مافی (الله) و بەدیهێنانی یەکسانی بە بەبەندەکردنی خەڵکی بۆ پەروەردگاریان– بۆ ئەوەی

(٥٧) د.عبد العظيم الديب، المنهج عند المستشرقين، مصدر سابق، ص ٣٤٤. وينظر" محمد أسد، الإسلام على مفترق الطرق، ط٩، ص ٥٢-٦٠.

بیکەن بە مەسەلەیەکی ستراتیژی، کە بناغە بۆ دیدگایەکی ئایندەیی پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دابنێت، چونکە ئەم مەسەلەیە خەمی ڕۆژئاوایە، چونکە ئەگەری پاشکۆیەتیی بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەیە لەبری شوێنکەوتنیان، ئەوەتا (باول شمتز)[٥٨]ی ڕۆژهەڵاتناس لێکۆڵینەوەی لەسەر ئیسلام و جیهانی ئیسلامی کردووە و جەختی لەسەر ڕەگەزەکانی هێز کردووەتەوە تێیاندا، لە پەرتووکەکەیدا: (ئیسلام هێزی جیهانیی سبەی) کە تێیدا هاواری بەئاگاهێنانەوە ئاراستەی ئەوروپا دەکات لە ڕابوونێکی سەرکەش، کە خەریکە بەسەریاندا زاڵ دەبێت.[٥٩]

بەهەمان شێوە (ئەلبیر شامیدور) لە پەرتووکەکەیدا (حمراء غرناطة) ئاگایی داوە و پێشبینیی ئەوە دەکات کە جارێکی تر موسڵمانان هەژموونیان هەبێت بەسەر جیهاندا، نە چەکە مووشەکییەکان و نە چەکە ئەتۆمییەکانی ڕۆژئاواش ڕێگەی پێ ناگرن.[٦٠]

**دووەم:** ڕەخنەگرتنی ڕۆژهەڵاتناسان لە کەسایەتیی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، بەتایبەت شایستەبوونی بۆ وەرگرتنی نیگا، لە چوارچێوەی مرۆڤبوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) و هەڵسوکەوتکردن و ژیانی لە نێو خەڵکدا و ئاماژەکردن بە لاوازیی بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیی، ئەمەش بابەتێکە کە ڕۆژهەڵاتناسەکان لە پێودانگی بابەتی (میزان الوضعية)دا دایاننناوە، ئەمەش وایکردووە کە لایەنی مرۆڤبوونی پێغەمبەر –لە دیدی ئەواندا– بەڵگەیەك بێت کە پەیوەستبوونی ئەو کەسایەتییە –خاوەن ڕەهەندە مرۆیی و ماددییە لە

---

(٥٨) ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە. انظر" عبد العظيم الديب،المنهج عند المستشرقين، المصدر السابق، ص ٣٤١.

(٥٩) انظر" نفس المصدر السابق.

(٦٠) عبد العظيم الديب، المنهج عند المستشرقين، المصدر سابق، ص٣٤٢.

پەیوەندییەکانی هەڵسوکەوت و ژیانگوازرییدا– بە نیگاو جیهانی غەیبەوە ڕەت بکاتەوە، ئەوان پێش ئەوەش (عیسا)یان کردووە بە پەرستراو، لەو لێکۆڵینەوانەش، لێکۆڵینەوەی (زایتس)ـە لە پەرتووکەکەیدا (دامەزراندنی موحەممەد بۆ ئایین).[٦١]

**سێیەم:** زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسان نکوڵییان لەو ڕاستییە کردووە کە قورئانی پیرۆز نیگا بێت لە لایەن خوای بەرز و باڵاوە،[٦٢] ئەوەتا لە باسی قورئانی پیرۆزدا هەندێکیان دەڵێن،: (موحەممەد دەڵێت)، یان وەسفی ئیسلام ـ لە هەمان چوارچێوەدا ـ بە ئایینی موحەممەدی، ئایینی موحەممەد دەکەن.[٦٣]

لە هەندێك حاڵەتیشدا هەندێکیان دان بەوەدا دەنێن کە قورئان نیگایەو لە لایەن خوای گەورەوە هاتووە، بەڵام تەنها بۆ عەرەب هاتووە، بەڵکو هەندێکیان تەنها لەو چوارچێوە مێژووییەی ژیانی عەرەبدا کورتی هەڵدێنن کە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا بووە، یان دەڵێن ئیسلام گوزارشتە لە دیدێکی فەلسەفی و تایبەتە بە کەسایەتیی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەندێکیش لەوانەی کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ڕۆژئاواوە –و ئەو هەوڵانەیان کە دەوڵەتی نەتەوەیی لێ دروست بوو– کە لە ڕەوتی عەلمانین لە جیهانی عەرەبیدا، وەصفی پێغەمبەری بەڕێز (دروودی خوای لەسەر بێت) بە (پێغەمبەری عەرەبی) دەکەن، وەسفی پەیامەکەشی بەوە دەکەن کە شۆڕشێکی نوێگەرییە لە چوارچێوەی نەتەوەیی عەرەبیدا، ئەمە لەکاتێکدا کە هەندێکیان پێیان وایە کە پەیامی ئیسلام

---

(٦١) د.عبد العظيم الديب، المنهج عند المستشرقين، مصدر سابق، ص ٣٤٤. وينظر" محمد أسد، الإسلام على مفترق الطرق، ط٩، ص ٥٢-٦٠.

(٦٢) د. أحمد عبد الرحيم السايح، الاستشراق ومنهج نقده، ص ٤٤٧.

(٦٣) سعدي، ياسين، البرهان في سلامة القرآن من الزيادة والنقصان، المكتب الإسلامي، دمشق: ١٣٩٨هـ/١٩٧٨، ص٨٦.

بۆ ئەوە هاتووە کە برەو بە جیهانیبوونی عەرەب بدات، بەو وەسفەی ئەوان ڕەگەزێکن مرۆڤایەتییان بەرزی کردوونەتەوە، ئەمەش لە چوارچێوەی بە بەرز و پیرۆزگرتنی ڕەگەزی خۆیان. (٦٤)

لە باسی دابەزینی نیگاش بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و هۆی ئەو ناڕەحەتییەی کە تووشی دەبوو، وتوویانە: نۆرە پەرکەم یان غەیبووبەیە. ئەمەش بۆ سڕینەوەی ئەو ڕاستییەی نیگا و شوێنەوارەکانی دابەزینی، کە هەر کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) ژیابێت، گەواهیی بەهەڵەداچوونی ئەوەی داوە کە دەڵێت نیگا پەرکەم یان شوێنەوار و نۆرەکردنەکانی بێت، دەشگونجێت فەرموودەی ئەو ئافرەتەی،(٦٥) کە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) و داوای شیفای لێکرد بۆ نەخۆشیی پەرکەم، بەڵگەیەك بێت بۆ بە درۆخستنەوەی درۆی ئەوانەی

---

(٦٤) بڕوانە" ئەوەی میشیل عەفلەق لەم بارەیەوە نووسیویەتی، لە چوارچێوەی ئەدەبیاتی حیزبی بەعسی عەرەبیی سۆسیالیستی، و وتەکەی "لە ڕابردوودا موحەممەد هەموو عەرەب بوو، با ئەمڕۆ هەموو عەرەب موحەممەد بن" بەمەش دەیویست ئەو لایەنە شۆڕشییە پاڵ بداتە لای موحەممەد، نەك پەیامەکەی، ئەو پەیامەی کە دروشمی حیزبەکەی دژی دەوەستایەوەو ئەو پەیامەو پێداویستییەکانی هەردوو شایەتومانەکەی هەڵدەوەشاندەوە، چونکە دروشمی ئەو حیزبە بریتی بوو لە: تاکە ئوممەتێکی عەرەبی، خاوەن پەیامێکی نەمر"، بۆ ئەوەی جێی: (أشهد أن لا إله إلا الله، وأنَّ محمداً رسول الله)ی بگرێتەوە. وانظر في هذا الإطار، شبلي العيسمي، عروبة الإسلام وعالميته، دار الطليعة، بيروت، ط١: ١٩٨٥م. وينظر" مصطفى جابر العلواني، عالمية الخطاب القرآني دراسة تحليلية في السور المسبحات الخمس، رسالة ماجستير، جامعة الجزيرة، ٢٠٠٤م، ص ٣٩-٤٠.

(٦٥) أبو الحسين مسلم النيسابوري، الجامع الصحيح"صحيح مسلم"، دار الجيل، ودار الآفاق الجديدة، بيروت: باب ثواب المؤمن، ج ٨، مجلد ٤، ص ١٦." عن عَطَاءُ بْنُ أَبِى رَبَاحٍ قَالَ قَالَ لِى ابْنُ عَبَّاسٍ أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ قُلْتُ بَلَى. قَالَ هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ أَتَتِ النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَتْ إِنِّى أُصْرَعُ وَإِنِّى أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ لِى. قَالَ « إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ. قَالَتْ أَصْبِرُ. قَالَتْ فَإِنِّى أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ. فَدَعَا لَهَا."

که بەهۆی پزیشکیی نوێوە بەدرۆکەوتنەوە دوای ماوەیەکی زۆر لە نەفامی، هەروەها ئەو گومانەیان بەدرۆ دەخاتەوە کە ئەو جۆرە نەخۆشییە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیی (موحەممەد)دا (دروودی خوای لەسەر بێت) باو نەبووە.

**چوارەم:** پشتبەستن بە چەندین میتۆد بۆ مشتومڕ کردن، تەنانەت بۆ وردبوونەوە لە یەك بابەتیش، ـ مەبەستم پێوانەکردنە بە دوو پێوەرـ بۆ نموونە ئەگەر یەکێکیان باس لە تایبەتمەندییە باشەکانی ئایینی ئیسلام بکات و دانی پێدا بنێت، ئەوا ئەمە بەشێوەیەکی گشتی بۆ ئاین و سەرچاوەکەی دەگێڕێتەوە کە خوای باڵادەستە، لەگەڵ جەختکردنەوە لە یەکێتیی ئایینەکان، –کەواتە– ئایینی ئیسلامیش شتێکی نوێی نەهێناوە، بەپێی بیروبۆچوونی ئەوان، ئەگەر باسی تایبەتمەندییە باشەکانی ئایینی مەسیحیشت بۆ بکات، ئەوا دەیگێڕێتەوە بۆ ئەو تایبەتمەندی و لایەنە باشانەی کە تەنها مەسیحییەت هەیەتی، لەوانەش مەسەلەی خۆشەویستی، بە بیانووی ئەوەی کە ئیسلام خەڵکی دابەش کردووە بۆ: ئیمانداران و بێباوەڕان، مەسەلەی ئاشتی و ئەوەی کە ئیسلام ئایینی کوشتار و شمشێرە، ئەمە لە کاتێکدا کە کتێبە پیرۆزەکانیان لێوانلێوە لەو شتانەی کە پێچەوانەی ئاشتین.[٦٦]

**پێنجەم:** ئەو درۆیەیان کە دەڵێن ئیسلام جۆرێکە لە هەڵبەستن و لە یەهودییەت و نەسرانییەتەوە وەرگیراوە، ئەمەش لە بەرامبەر ئەو شتانەدا بەکاری دەهێنن کە تەنها لە نیگادا هاتوون، لە چوارچێوەی نەتواناییان بۆ بە

(٦٦) لەژێر ناونیشانی (يسوع والعالم) لە ئینجیلی مەتتا ١١/١٠دا هاتووە: وا گومان مەبەن کە من هاتووم بۆ ئەوەی ئاشتی لەسەر زەوی بچەسپێنم. بۆ ئەوە نەهاتووم ئاشتی بچەسپێنم، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم شمشێر بچەسپێنم. من بۆ ئەوە هاتووم بۆ ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ باوکیدا و کچ لەگەڵ دایکیدا و بووك لەگەڵ خەسوویدا بخەمە ناکۆکییەوە. بەم شێوەیە کەسانیماڵەکە دەبنە دوژمنی مرۆڤ. مقطع ٣٤-٣٦ ص٣١. الإنجيل كتاب الحياة، ط٥، IBS١٩٨٢ .

درۆخستنەوەی ئەو مەسەلانەی ئیسلام کە نیگا بە ڕاستی داناون و دژی زانستیش نین، ئەم هەڵوێستەش تەنها لەو دەمارگیرییە ئایینییەوە دەردەچێت، کە ڕاستی ڕەتدەکاتەوەو تەسلیم بە باڵایەتییەکەی نابێت.[٦٧]

**شەشەم:** هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی ئیسلام لەو توانایەیدا کە بۆ دروستکردنی کلتووری ئیسلامی هەیەتی، هەروەها بەرەنگاربوونەوەی هەر شتێك کە وا بکات ئەو کلتوورە ئیسلامییە ببێت بە مەرجەع، بەشێوەیەك کە عەقڵی موسڵمان دیدی خۆی لێوە دروست بکات و ڕێبازی خۆی تێدا بدۆزێتەوە، سەرچاوەکانی بۆ دیاری بکات و گرێنتیی بەردەوامبوونی بکات، پشتبەست بەو هەوڵە دژ بە ئیسلامانەیە، بانگەشەی بەپیرۆزگرتنی سیستمی ڕۆژئاوایی و دانانی بە لووتکەی ئەوەی کە دەگونجێت عەقڵی مرۆیی پێی بگات، هاتە بوون، ئەمە لەلایەك و بانگەشەی جیهانیبوونی مەسیحییەت، بۆ ئەوەی ببێت بە ئەلتەرناتیڤێك بۆ جیهانێتییەکەی ئیسلام، ئەمەش وای لێکردن کە پێداچوونەوە بکرێت بۆ مەسیحییەت و سەرچاوەو نووسینەکانی، هەڵبەستنی واتای فراوانتر لە ئاستی چەمکەکانی خۆی، لەوانە چەمکی (التكرين) کە بە واتای بانگەشەکردن دێت بۆ ئەو مەسیحییەتەی کە بنچینە بۆ تەبشیر دادەنێت، ئەمەش لایەنەکەی تری.[٦٨]

**حەوتەم:** تۆمەتبارکردنی هزری موسڵمان بە سۆزدارییبوون (العاطفية)، دەستپێکردن لە چەند مەسەلەمەیەکی پێشوەختەوە، کە دەبنە ڕێگر لە گەیشتن بە دەرەنجامگەلێکی شیاو، چونکە ئەو دەرەنجامانەی پێی دەگەن لەو دوو مەسەلەیەدا پێچەوانەی زانستییبوونن، ئەمەش هەوڵێکی ڕۆژئاواییە بۆ

---

(٦٧) د. مصطفى السباعي، المستشرقون ما لهم وما عليهم، مصدر سابق، ص ١٨. وينظر" أ.د.عماد الدين خليل، المستشرقون والسيرة النبوية، مصدر سابق، ص١٥.

(٦٨) ينظر، د. أحمد السايح، مصدر سابق، ص ٤٥٢.

بەپاشكۆكردنی عەقڵی عەرەبی و موسڵمان بۆ گەیشتن بە كاروانی شارستانییەت و پێشكەوتن، ئەگەر عەقڵی موسڵمان واز لە هۆكارەكانی دواكەوتوویی و نەتوانابییەكەی بهێنێت، كە لە تەسلیم بە كلتوورێكی بۆماوە سەرچاوەی گرتووە، ئەمەش بووەتە هۆی سنووردار‌بوونی ئازادییەكەی و – بە وتەی ئەوان – دەیخاتە نێو جیهانی دواینییەكانەوە (الماورائیات).[٦٩]

**هەشتەم:** تۆمەتباركردنی ئیسلام بەوەی كە ئایینێكە هێز بە پیرۆز دەزانێت و فەرمان بە كوشتار دەكات، ئایینی جەنگ و غەزوەكانە، ئەمەش لەو ترسەیانەوە دەردەكەوێت كە لە ئایندەی ئیسلام و ئەو شتانەوە هەیانە كە سەبارەت بە ژیاننامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) و غەزوەكانی موسڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) وتراوە.

---

(٦٩) المصدر السابق نفسه.

## باسی دووەم:
## تایبەتمەندییەکانی ئەوانەی دژی قورئانن و بەرپەرچدانەوەی ڕێبازەکانیان لە گوتاری قورئانیدا

مەبەست لەم باسە ئەوەیە کە پشت بە گوتاری قورئانی ببەستین، لە ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ئەوانەی دژ و پێچەوانەی قورئانن و ڕوونکردنەوەی ڕێبازەکانیان لەو دژبوون و پێچەوانەبوونەیاندا، ئەو ڕەتدانەوانەی کە لەسەریان هاتووە، بەشێوەیەك کە ئەوە دەردەخات کە گوتاری قورئانی بنچینەکانی فیکری ئیسلامی لەو ڕووەوە لە خۆ دەگرێت، دەکرێت ئەم بابەتە لەم دوو تەوەرەدا بخەینە ڕوو:

### تەوەری یەکەم:
### تایبەتمەندییەکانی سەرپێچیکارانی پێغەمبەران و دابەزێنراوەکان لە قورئانی پیرۆزدا

**یەکەم:** خراپەکاری لە زەویدا: خوای گەورە وەسفی هەر کەسێکی بە خراپەکاری (فەساد) کردووە، کە سەرپێچی و تاوان ئەنجام دەدات، چونکە کارێکی کردووە کە پێچەوانەی ئەرکە چاکسازییەکەیەتی لە زەویدا، کە بریتییە لە شوێنکەوتنی هیدایەت و ڕێبازەکەی بەو شێوەیەی بۆ کار و بارەکانیان باشە، ئەو ڕێبازەی کە لەسەر باوەڕبوون بە خوای گەورە و کارکردن بەپێی ڕێنماییەکانی بنیات نراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ)،[٧٠] (واتە:[٧١] ئەوانە کاتێك پێیان دەوترێت تۆوی

---

([٧٠]) ينظر، تفسير ابن كثير، البقرة:١١.

گوناه و تاوان و خراپەکاری مەچێنن لە زەویدا، دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها چاکسازی دەکەین! !)، (البَقَرَة: ١١)، ئایەتەکە جەخت لە تایبەتمەندیی گومانی بێباوەڕان بە خۆیان دەکاتەوە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەمەی ئەوان دەیڵێن جۆرێکە لە خەیاڵ و چەوتبینی (السراب) و سووربوون لەسەر بێباوەڕی.

**دووەم:** گەوجی و گەمژەیی و بێ عەقڵی (السَفَه): کە سیفەتێکی بێباوەڕ و دووڕووەکانە لە سەرپێچکاران، ئەوانەی لە بێباوەڕبوونیاندا تەنها بە تاوان و سەرپێچی و سووربوونیانەوە لەسەر ڕەتکردنەوەی ئیمان ناوەستن، بەڵکو هەرکەسێکیش کە باوەڕی هێنابێت، بە گەمژەیی و بێعەقڵی تۆمەتباری دەکەن، بە پێچەوانەی ئەوەی کە بڕوادارانی لەسەرە، لە توندوتۆڵییان لە ئاین و جێگیریی کۆڵەکەکەی. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِن لاَّ يَعْلَمُونَ)، (واتە: کاتێك پێیان دەوترێت ئیمان و باوەڕ بهێنن وەکو ئەو هەموو خەڵکە (بێ فێڵ و ڕاستگۆیانە) کە باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: چۆن ئێمە وەکو ئەو خەڵکە کەم عەقڵ و گێلانە باوەڕ دەهێنین، (خەڵکینە) چاك بزانن و ئاگادار بن کە هەر ئەوانە خۆیان کەم عەقڵ و گێل و نەفامن، بەڵام بۆ خۆیان نازانن)، (البقرة: ١٣).

**سێیەم:** هەوا و ئارەزوو کردن بە حەکەم لە شوێنکەوتنی پێغەمبەران و هەڵسوڕانیان بەپێی ئەو هەوا و ئارەزووەیان، ئەمەش لە ئەنجامی ستەم و خۆ بەگەورەزانینیانەوە: ئەمەش لە چوارچێوەی ئەو ئایەتەدا دێت کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێت: (وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الكِتَابَ وَقَفَّيْنَا مِنْ بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ البَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ القُدُسِ أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لا تَهْوَى أَنْفُسُكُمُ

---

([٧١]) تێبینی: سەبارەت بە تەفسیرکردن و وەرگێڕانی ئەو ئایەتانەی کە لەم توێژینەوەیدا هاتوون بۆ زمانی کوردی، پشتم بە (تەفسیری ئاسان) بەستووە کە لە نووسینی مامۆستا (بورهان موحەممەد ئەمین)ـە، دەقاودەق ڕاڤەکەی ئەوم لە دوای دەقی ئایەتەکان لە دوو کەوانەدا گواستووەتەوە. (وەرگێڕ).

اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ)، (واتە: سوێند بێت بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بە موسا و بەردەوام دوای ئەویش پێغەمبەرانمان ڕەوانە کرد و بە عیسای کوڕی مەریەم بەڵگە و نیشانە و موعجیزەی جۆراوجۆرمان بەخشی هەروەها پشتگیریمان کرد بە فریشتە (جبرئیل)، ئایا چۆن دەبێت هەر کاتێك پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەکانی ئێوەدا نەگونجا بێت، خۆتان بە زل زانیوە و لووتتان بەرزکردووەتەوە و بڕواتان نەهێناوە، ئەوسا دەستەیەکتان (بەرنامەی خواتان) بە درۆ زانیوە و هەندێکیشتان پێغەمبەرانتان دەکوشت)، (البقرة: ٨٧).

ئەم ئایەتە – وەك ابن كثير دەفەرموێت – وەسفی بەنو ئیسرائیلی تێدایە بە لووتبەرزی و بە نکوڵی و بە پێچەوانەیی کارکردن و خۆبەزلزانین لە بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان، ئەمەش بەهۆی شوێنکەوتنیان بۆ ئارەزووەکانیان، تەوراتیان شێواند و گۆڕییان و پێچەوانەی فەرمانەکانی جووڵانەوە و تەئویلیان کرد، دوای موساش خوای گەورە ڕەوانەکراوی خۆی لە (رسل) و (أنبياء) ناردووە، تا بە عیسای کوڕی مەریەم کۆتایی بە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل هێنا، کە خوای گەورە چەندین موعجیزەی پێ بەخشی و بە جیبریل (سەلامی خوای لەسەر بێت) پشتگیریی کرد، بەڵام ئەوان بە درۆیان خستەوە و لە ئەنجامی ئیرەیی و نکوڵیی خۆیاندا دەستەیە لە پێغەمبەرانیان بە درۆ خستەوە و پۆلێکی تریان کوشتووە، ئەمەش لە ئەنجامی شوێنکەوتنیان بۆ هەوا و ئارەزووە خراپەکانیان.[٧٢]

**چوارەم:** زاتکردن و نەترسان لە سەرپێچیکردنی خوای گەورە و سووربوون لەسەری دوای باوەڕهێنانێکی ڕووکەشی: لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە شوێنکەوتنی ئەوەیان پێ قبوڵە کە خوای گەورە دایبەزاندووە، ئەمەش گوزارشت لەو وتەیەیان دەکات کە دەیانوت (سمعنا) واتە بیستمان –یان گەر لە

---

(٧٢) ينظر" تفسير ابن كثير، البقرة:٨٧، وما نقله عن ابن عباس.

نزمترین ئاستیشدا بێت دانیان بەوەدا دەنا کە ئەو پەیامە ڕاستە، لەلایەن خوای گەورەوە دابەزێنراوە– پاشان پێچەوانییان بۆ دابەزێنراوەکان (التنزيل)، بەوەی کە لەو وشەیەیاندا گوزارشتیان لێ دەکرد کە دەیانوت "عصينا" واتە سەرپێچی دەکەین، بەپێی ئەوەی لە ڕاڤەکردنەکەی ابن کثیر دەردەهێنرێت، هەروەها لەو شتانەی کە جەخت لە سووربوونیان لەسەر بێ باوەڕیی دەکاتەوە، بریتییە لە خۆشەویستییان بۆ گوێرەکە و پەرستنی، بەپێی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: (وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُوا قَالُوا سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ العِجْلَ بِكُفْرِهِمْ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِنْ كُنْتُم مُّؤْمِنِينَ)، (واتە: (یادیان بێنەرەوە ئەو سەردەمەی) کە پەیمانمان لێ وەرگرتن و کێوی طورمان بەسەردا بەرزکردنەوە و (فەرمانمان پێدان): ئەوەی پێمان بەخشیوون (لە تەورات) بە توندی بیگرن و لێی لامەدەن و گوێبیستبن، (بە دەم) وتیان: گوێڕایەڵین، (بەڵام بە کردەوە) پێچەوانەیان کرد و یاخی بوون و گوێرەکەپەرستی لە دڵ و دەروونیاندا ڕووابوو بە هۆی بێ باوەڕییانەوە، پێیان بڵێ: ئیمانەکەتان شتی ناڕەواتان پێ دەکات ئەگەر ئێوە ئیماندارن؟! (باووباپیرانتان گوێرەکەپەرست و پێغەمبەرکوژ، ئێوەش سەرسەخت و بێ باوەڕ)، (البقرة: ٩٣).

**پێنجەم:** هەڵبەستن بەدەم خوای گەورەوە بەهۆی لەخۆباییبوونیان بەهۆی ئەوەی خوای گەورە فەزڵی داون بەسەر جیهانیاندا: بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ)، (واتە: بۆیەش (وا دەکەن) چونکە بەڕاستی ئەوان دەیانوت: هەرگیز ئاگری دۆزەخ چەند ڕۆژێکی کەم نەبێت بەر لەشمان ناکەوێت و ئەوەی لە ئایینەکانیاندا بۆ خۆیان هەڵبەستبوو، سەری لێ شێواندن و تەفرەی دان)، (آل عمران: ٢٤)، ئەوان تێگەیشتنێکی وردیان نەبوو بۆ پێداویستی و داخوازییەکانی

باوەڕهێنان، هەر لە شوێنکەوتنی ڕێبازی یەکتاپەرستی و بەرهەمەکانی، کە بە خۆیانەوە بەستبووەوە و کردبوویانە مافێکی جێگیر بۆ خۆیان، دانیشیان بەوەدا نەدەنا کە ببیبەستنەوە بە باوەڕەکەیانەوە، هەروەك چۆن دانیشیان بەوەدا نەدەنا کە شوێن ویستی خوای گەورە دەکەون، ئەو فەزڵەش کە خوای گەورە بەهۆی تەکلیفەوە لێی نابوون، درێژیان کردبووەوە بۆ فەزڵ لە حساب و لێپرسینەوە و چارەنووسیشدا، بە پێچەوانەی خواستەکانی ئەو تەکلیفە، لە بەرپرسیارێتی و حساب و لێپرسینەوە، بەپێی ئاست و جۆری ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ دەیکات لەو چوارچێوەیەدا.

**شەشەم:** ڕق و کینەیان بەرامبەر بڕواداران لە ئەنجامی ئیرەیی و بەدی و چاوچنۆکییانەوە، بەهۆی ئەوەی شەریعەت لە ئیسرائیلییەوە بووە بە جیهانی: بەپێی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: (هَا أَنْتُمْ أُولاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الغَيْظِ قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ)، (واتە: ئاگاداربن! ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێت و باوەڕتان بە هەموو کتێبە ئاسمانییەکانیش هەیە (بەڵام ئەوان باوەڕیان بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و بە قورئان نییە)، کاتێکیش پێتان دەگەن دەڵێن: ئێمە ئیمانداریین بەڵام کاتێك بە تەنها دەبن، پەنجەی خۆیان دەگەزن ئەوەندە ڕقئەستوور و داخ لە دڵن، پێیان بڵێ: دەك بمرن لە داخا، بەڕاستی خوا خۆی زانایە بەوەی کە لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە و (چاکتان دەناسێت)، (آل عمران: ١١٩)، نیشانەی ئەو هەستکردنەش دوو شتە: یەکەم: پەیوەندیی بە کینەوە هەیە بەرامبەر بە بڕوادارە موسڵمانەکان. دووەمیش: بە بەشبەشکردنی بڕواهێنانیان بە دابەزێنراو (التنزيل) و بڕوا بە کۆتا پەیام ناهێنن، ئەمەش وای کردووە کە ڕقلێبوونەوەیان لە موسڵمانان و باوەڕنەهێنانیان بەوەی کە خوای گەورە بۆیانی

دابەزاندووە، ببنە بەڵگەی بێباوەڕی و نیشانەی ئیرەیی و بەدی، چونکە یەکێك لە دەرەنجامەکانی گۆڕانی پەیامی نێونەتەوەیی ئیسرائیلی بۆ پەیامی جیهانیی ئیسلامیی بریتییە لە: هەڵوەشاندنەوەی فەزڵبوونیان بەسەر جیهانیاندا، دەرخەری ئەمەش ئەوەیە کە قورئان گوتاری خۆی ئاڕاستەی هەموو خەڵکی دەکات.

**حەوتەم:** بێباوەڕبوونیان بە خوای گەورە و زاتکردنیان بە بێئەدەبیکردن بەرامبەر زات و سیفاتی و هەر شتێك کە لایەقی بێت:

وەسفکردنی خوای گەورە لەلایەن ئەوانەوە بە هەژاری و وەسفکردنی خۆیان بە دەوڵەمەندی: بەپێی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت: (لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الحَرِيقِ)، (واتە: سوێند بێت بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابەجێی) ئەو (جولەکانەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین!! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بە ناحەق، (لە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر)، (آل عمران: ١٨١)، لەوانەش: بێباوەڕبوون و لەسنووردەچوونیان بەوەی کە وەسفی خوای گەورەیان بە رژدی و دەستقوچان (البخل) کرد، ئەمەش وەك ئیرەییەك بە موسڵمانان و ئەو حەق و ڕاستییەی کە بۆیان هاتووەتە خوارەوە، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَقَالَتِ اليَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ العَدَاوَةَ وَالبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَارًا لِّلحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا وَاللَّهُ لا يُحِبُّ المُفْسِدِينَ)، (واتە: ئەو جولەکە (نەفام و خوانەناسانە) دەیانوت: خوا دەستی بەستراوە و خێری لەدەست نابێتەوە!! دەك دەستیان

بەستراو و بیٚ خێر و کەلەپچە و تووشی شەلەل بێت، دەك نەفرینیان لیٚ بێت، بۆ خۆیان و قسەیان، نەخێر وانییە، بەڵکو دوو دەستی (پڕ لە بەرەکەتی پەروەردگار) هەمیشە و بەردەوام کراوەیە، چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت! سوێند بێت زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە، یاخیبوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە کوفردا، ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان لەنێوانیاندا بەرپاکردووە، هەر کاتێك دەیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن، خوا دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات. ئەوانە زۆر بەپەلە و بە گەرمی هەوڵی بڵاوبوونەوەی فەساد و تاوان دەدەن لە زەویدا، خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن)، (المائدة: ٦٤).

١- داننانیان بە بێباوەڕییاندا بەوەی کە عیسا (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت)یان کردووە بە پەرستراو، بەپێی ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە: (لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ المَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ المَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ)، (واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی ئەوانە بیٚ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە (بەمەرجێك) مەسیح وتوویەتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و دڵنیا بن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرام کردووە و شوێن و جێگا و سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەو ستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نییە (کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت)، (المائدة: ٧٢)، هەروەها ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە بیروباوەڕە هاوبەشپەیداکەرەکەیان لەسەر لادانیان لە ڕاستی بنیات نراوە، ئەو بڕوایەی کە دژ و پێچەوانەیە لەگەڵ: فیترەت و عەقڵ و ئەوەشە کە عیسا (سەلامی خوای

لەسەر بێت) هێناویەتی، هەروەها خوای گەورە بە زیاتر لە ئامرازێکی جەختکردنەوە جەختی لەسەر ئەمە کردووەتەوە، لە میانەی ئایەتەکەدا: بە فەرمانکردن بە پەرستنی خوا و ئەوەی کە ئەو پەروەردگاری هەموویانە و هەرکەسێکیش هاوەڵ پەیدا بکات بۆ خوای گەورە، بەهەشتی لەسەر حەرام دەکرێت و دەخرێتە نێو ئاگرەوە و هیچ سەرخەرێکیشی نابێت، بەهۆی ئەوەی کە بەهۆی گەورەترین ستەمەوە ـ کە هاوبەشپەیداکردنە بۆ خوای گەورە ـ ستەمی لە خۆی کردووە.

٢ـ داننایان بە بێباوەڕییاندا بەوەی کە خوای گەورە دەکەن بە سێ بەشەوە (التثليث)، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلاَّ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)، (واتە: سوێند بێت بە خوا بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا یەکێکە لە سێ دانە خوا (لە حاڵەتێکدا): هیچ خوایەك، هیچ پەروەردگارێك نییە جگە لە خوایەکی تاکو تەنها، خۆ ئەگەر لەو گوفتارە نابەجێ و ناقۆڵایەیان کۆڵ نەدەن، سوێند بە خوا ئەوانەیان کە بێ باوەڕ بوون سزایەکی بەئێشیان تووش دەبێت)، (المائدة: ٧٣)، هەر کەسێکیش خوای گەورە بە سێ بەش بزانێت، ئەوا بێباوەڕ بووە بەو پەیامی یەکتاپەرستییەی کە موسا هێناویەتی و عیسا (سەلامی خوایان لەسەر بێت) بە ڕاستی داناوە و جەختی لە نەفیکردنی پەرستراوێتیی بۆ هەر شتێکی تر کردووەتەوە جگە لە (الله)ی بەرز و بڵند، پاشان هەڕەشەی سزایەکی بەئێش و سەختی لێکراوە، لە دنیا و دواڕۆژدا.

٣ـ لەدەستدانی تەرازووی باوەڕ، لە شێوازەکانیشی بریتییە لە سنووربەزاندن و نکوڵیکردن و داننەنانیان بەو بێباوەڕییەی ئەوان لەسەرین، ئەویش بە بەریکردنی خۆیان لە هاوبەش پەیداکردن، بەپێی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: (ثُمَّ لَمْ تَكُنْ فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَنْ قَالُوا وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ)، (واتە:

پاشان سەرئەنجامی بیٚ باوەڕییان هیچ نەبوو بێجگە لەوەی کە وتیان: سوێند بە خوای پەروەردگارمان ئێمە هەرگیز موشریك و هاوەڵگەر نەبووین! !)، (الأنعام: ٢٣).

٤ـ سنووربەزاندنیان بۆ قەدر و ڕێزی پەرستراوێتیی خوای گەورە و سیفات و خواستەکانی، لەوانەش دابەزاندنی نیگا و ناردنی پێغەمبەران، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّنْ شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنْزَلَ الكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنْتُمْ وَلا آبَاؤُكُمْ قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ)، (واتە: (جولەکە) وەکو پێویست قەدری خوایان نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، چونکە وتیان: خوا هیچ کتێبێکی بۆ هیچ کەس دانەبەزاندووە، پێیان بڵێ: باشە ئەی کێ ئەو کتێبەی دابەزاند کە موسا هێنای (بۆتان)، لەکاتێکدا نوور و هیدایەتیش بوو بۆ خەڵکی، کەچی ئێوە بەش بەش و پارچە پارچەی دەکەن و ئەوەی بەدڵتان بێت نیشانی خەڵکی دەدەن و زۆریشی دەشارنەوە (بەتایبەت دەربارەی پێغەمبەر و قورئان). هەروەها بڵێ هەندێك شت فێرکران کە نە ئێوە نە باووباپیرانتان دەتانزانی، پێیان بڵێ: هەر خوا خۆی دایبەزاندووە و فێریشی کردوون، لەوەودوا وازیان لێ بهێنە با لە بەتاڵ و نادروستیی خۆیاندا ڕۆبچن و گەمەو یاری بکەن! !)، (الأنعام: ٩١)، هەروەها ڕاگەیاندنی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەوەی کە بۆ موسا دابەزێنراوە و سنووربەزاندنی ئەوەی کە پێی هاتووە، هەروەها لێشیان لادا پاش ئەوەی باوەڕیان پێ هێنا.

٥ـ بەزاندنی سنوور لە بەرامبەر سیفاتەکانی پەرستراوێتی و حەقیقەتی پەرستراوێتی: هەروەها قسەهەڵبەستن بە ناوی خوای گەورەوە، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الغَنِيُّ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ

وَمَا فِي الأَرْضِ إِنْ عِنْدَكُم مِّنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ)، (واتە: (خوانەناسان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە! پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو خوایەیە، ئەو زاتە بێ نیازە (پێویستی بە کوڕ و کچ نییە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، بێگومان هیچ بەڵگە و نیشانەیەکتان نییە بۆ ئەم بوختانە ناڕەوایە، ئایا شتێك هەڵدەبەستن بۆ خوا و (بێ باکانە) دەیڵێن، کە هیچی لێ نازانن و هیچ بنەمایەکی نییە؟!)، (یونس: ٦٨)، وەڵامەکەش بەم شێوەیە هات: ئەوەی کە دەیڵێت تەنها درۆهەڵبەستنێکی ڕووتە، هیچ بنچینەیەکی نییە لە ڕێبازی ڕاستی دابەزێنراو، هەروەها وەڵام درایەوە بە جەختکردنەوە لە پاك و بێگەردیی خوای بەرز و بڵند.

**هەشتەم:** پابەندنەبوون بە شەریعەتەوە و بەزاندنی ئەحکامەکانی:

١- شێواندن و دەستکاریکردنی وشە لەجێی خۆیدا، وەك گوزارشتێك بۆ سووربوون لەسەر سەرپێچی و تاوان و سووك سەیرکردنی شەرع و شەرعدانەر، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (مِنَ الَّذِينَ هَادُوا يُحَرِّفُونَ الكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَاعِنَا لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي الدِّينِ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانْظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَكِن لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلا يُؤْمِنُونَ إِلاَّ قَلِيلاً)، (واتە: هەندێك لەوانەی کە بوونەتە جوو قسە لەجێی خۆیدا دەسکاری دەکەن و جێگۆڕکێی پێدەکەن و بە ئارەزووی خۆیان لێکی دەدەنەوە (بە کینە و گاڵتەوە) دەڵێن: بیستمان و بە قسەشمان نەکردیت!! گوێ بگرە دەك گوێت لێ نەبێت!! (هەروەها دەیان وت:) (راعنا) و دەمیان بۆ خوار دەکردەوە تا مانایەکی هەڵە ببەخشێت و ببێتە تەعنە و ڕەخنە لە دین، خۆ ئەگەر بەڕاستی ئەوان بیانوتایە: بیستمان و گوێڕایەڵین و تۆیش گوێمان بۆ بگرە و مۆڵەتمان بدە (تا تێبگەین) چاکتر و ڕاستتر و بەنرختر بوو

بۆیان، بەڵام (چونکە پاك نین و دەروون نەخۆشن) خوا نەفرەتی لێ کردوون بەهۆی کوفریانەوە، بۆیە باوەڕناهێنن کەمێك نەبێت)، (النساء: ٤٦).

٢ـ لەبیرکردنی یادخستنەوە و فەرامۆشکردنی بەشێك لەو شتانەی کە یادیان خرابووەوە پێیان، بە سەرەنجامەکەشی: (وَمِنَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ العَدَاوَةَ وَالبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللَّهُ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ)، (واتە: هەروەها پەیمانمان لەوانەش وەرگرتووە کە دەیانوت: ئێمە گاورین کەچی بەشێك لەو شتانەیان فەرامۆش کرد کە پێی یاداوەری کرابوون، (بەتایبەتی دەربارەی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان پێوەلکاندن، لە ئایندەشدا خوا هەموو ئەو کار و کردەوانەیان دەخاتەوە بەرچاو و پێیان ڕادەگەیەنێت)، (المائدة: ١٤)، فەرامۆشکردنی بەحەکەمدانانی شەریعەت لەوانەوە کە باوەڕیان بە خوای گەورە هێناوە، کەموکورتییەکە کە سەرەنجامە خراپەکەی دونیایان دەگرێتەوە بە: بڵاوبوونەوەی دوژمنایەتی لەنێونیاندا، پارچەپارچەبوونی یەکێتیی ڕیزیان و هەڕەشە بۆ سەر ئینتیما و تەباییان، ئەو سەرەنجامە دواڕۆژیشیان دەگرێتەوە بەوەی کە ئەو فەرامۆشکردنەیان دەگوڕێت بۆ هۆکارێك بۆ ئەوەی خوای گەورە لێپێچینەوەیان لەسەری بکات.

٣ـ هەوڵی خۆقوتارکردن لە ئیرادەی شەرعیی خوای گەورە و ڕێساکانی سەبارەت بە باوەڕداران و کوشتاریان، ئەویش لە ڕێگەی بەڵگەهێنانەوە بە چەند بەهانەیەکی ماددی: (فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُمْ بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لا طَاقَةَ لَنَا اليَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاقُوا اللَّهِ كَم مِّنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ)، (واتە: ئینجا لەکاتێکدا تاڵوت سەربازانی جیاکردەوەو پێی

وتن (وا ئێمه دەڕۆین)، بێگومان خوا (له ڕێگوزەرماندا) تاقیتان دەکاتەوە به ڕووبارێك (دوای ماندووبوون و تینوویەتی)، جا ئەوەی لێی بخواتەوە (ئەوە سەربازی) من نییه و (بگەڕێتەوە) و ئەوەی ئەیچێژێت یان تەنها لوێچێك به دەستی خۆی بخواتەوە، ئەوە بەڕاستی سەربازی منه و (دەپەڕێتەوە و دەڕۆین، جا لەگەڵ ئەو ڕوونکردنەوەیەشدا) زۆربەیان (له ئاوی ڕووبارەکەیان) خواردەوە، کەمێکیان نەبێت، جا کاتێك لێی پەڕینەوە خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو لەگەڵیدا (هەندێکیان) وتیان: ئەمڕۆ (زەحمەته بەم ژماره کەمەوە) دەرەقەتی جالووت و سەربازانی بێین، (بەڵام) ئەوانەی دڵنیا بوون به خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چونکه چەندین جار دەستەی کەم، زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا به فەرمانی خوا و خوا یار و یاوەری خۆگر و ئارامگرانه)، (البقرة: ٢٤٩)، بەهانەهێنانەوە به پێداویستییه مرۆییەکان، له بەرامبەر فەرمانێکی شەرعیی تاقیگەریدا، باوەڕ دەکاته شتێکی سەرزارەکی و ڕەگ دانەکوتاو تا ئەو ئاستەی هیممەتی لەگەڵدا بەرز ببێتەوە، خۆی له لووتبەرزی پێ بپارێزرێت و تەزکیه و پاکیی دەروونی لەگەڵدا بەدی بێت، به متمانەبوون به کۆمەك و سەرخستنی خوای گەورە و باڵا، له ئاستێکدا که بگاته ئاستی ئەو تاقیکردنەوەیەی خوای گەورە بۆیان، یان باڵاتریش بێت.

**نۆیەم:** دووڕوویی و بێباری، وەك گاڵتەکردن به پێغەمبەران و باوەڕداران، دەرخستنی پێچەوانەی ئەوەی که له ناخیاندا شاردوویانەتەوە:

گاڵتەکردن به پێغەمبەران به دەرخستنی باوەڕ و شاردنەوەی بێباوەڕی: ئەمەش دەبێته یەکێك له جۆرەکانی دووڕوویی، ئەویش به جەختکردنەوە لەسەر ئینتیمایان بۆ کوفر و پێشەواکانیان له نێو سەرکردەکانیاندا[٧٣] لەبریی شوێنکەوتنی ڕێبازی ڕاستی و هەڵگر و بانگەشەکارانی، (وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا

---

([٧٣]) ينظر: ابن كثير "تفسيره"، البقرة: ١٤.

آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ)، (واتە: کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: ئێمە ئیماندارین و باوەڕمان هێناوە!!، کەچی کاتێك بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین!!)، (البقرة: ١٤).

دووڕوویيش یەکێکە لە پلەکانی کوفر، یەکسانیشن لە شاردنەوەی بێباوەڕی و لە بیروباوەڕەکەیدا، جا با لە جۆری دەرخستنەکەیشیدا جیاواز بن، چونکە ئەصڵ لە بیروباوەڕ و تەرازووەکەیدا (زانیاریی خوای باڵادەستە)، هەر ئەوە کە نهێنی و پەنهانتریش دەزانێت، بۆ نموونە ئەوەتا خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (وَإِذَا جَاءُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَقَد دَّخَلُوا بِالْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا بِهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا يَكْتُمُونَ)، (واتە: ئەوانە کاتێك دێن بۆ لاتان (بە درۆوە دەڵێن) ئێمەش موسوڵمانین و باوەڕمان هێناوە، لە کاتێکدا بەڕاستی ئەوانە بە بێ باوەڕییەوە هاتبوونە ژوورەوە و بێگومان هەر بە بێ باوەڕیشەوە چوونە دەرەوە، جا خوا خۆی چاك دەزانێت کە چییان حەشارداوە لە دڵ و دەروونیاندا)، (المائدة: ٦١).

**دەیەم:** بەدرۆخستنەوەیان بۆ ڕۆژی دوایی، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ أَلا سَاءَ مَا يَزِرُونَ)، (واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان بە ئامادەبوونی بەردەم (دادگای) خوایی نەبوو، زەرەریان کرد و خۆیان دۆڕاند، کاتێکیش قیامەت کتوپڕ یەخەیان پێدەگرێت، دەڵێن: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو ڕۆژگارەی بە کەمتەرخەمی و (بە بەرەڵایی و سەرکەشی و تاوان) بردمانەسەر، لەکاتێکدا ئەوانە هەموو گوناه و تاوانیان داوە بەکۆڵیاندا، ئاگاداربن کە چەندە خراپە، کۆڵ و باری وا، کە هەڵی

دەگرن)، (الأنعام: ٣١)، هەروەها ئەو سزا و خراپ چارەنووسییەش کە بەهۆی ئەو بە درۆخستنەوەیەیانەوە تووشی دەبن چی دەبێت، وەڵامەکەشی بەو پەشیمانی و ئاخهەڵخواستنەی ئەو کەسانەیە کە لە ژیانیاندا ڕۆچوون و بەفیڕۆیان دا و شوێن ئەو ڕێبازی یەکتاپەرستییە نەکەوتن، کە جەخت لە تەکلیف و لێپرسینەوە دەکاتەوە، هەروەها وەڵامەکەی بە وێناکردنی دیمەنێکە لە سزا، کە بریتییە لە بارهەڵگرتنی، ئەو بارەی کە شانی بێباوەڕان لە ڕۆژی سزادا قورس دەکات.

**یانزە:** بەدرۆخستنەوەیان بۆ ئایەت و بەڵگەکان، گومانکردنیان لە پێغەمبەران:

١ـ داواکردنی بەڵگەی مادی وەك مەرجێك کە بۆ باوەڕهێنان بە پێغەمبەران دایاننابوو، ئەوەش لە فڕوفێڵی خۆیانەوە بوو، خوای گەورە خۆی دەتوانێت بەڵگەکان داببەزێنێت، بەپێی ئەم ئایەتە: (وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ حَتَّى نُؤْتَى مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا صَغَارٌ عِنْدَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ) (واتە: (بێباوەڕان) کاتێك ئایەتێکی قورئانیان بۆ بێت دەڵێن: ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین هەتا وێنەی ئەوەی کە بۆ پێغەمبەران هاتووە بە ئێمە نەبەخشرێت، خوا زانایە بەو شوێن و دڵ و دەروونەی کە شایستەیە پەیامی خۆی تێدا دابنێت، لە ئایندەیەکی نزیکیشدا ئەوانەی کە تاوانیان کردووە لەلایەن خواوە سووکی و ڕیسوایی و بێ نرخی یەخەیان پێدەگرێت، هاوڕێ لەگەڵ سزای پڕ ئێشدا لە پاداشتی ئەو پیلان و تەڵەکەیەدا کە دەیانگێڕا) (الأنعام: ١٢٤).

٢ـ تەحەدداکردن، بەڵگەی ڕۆچوونە لە بێباوەڕی و نکوڵیرکردندا، بەپێی وتەی خوای گەورە: (قَالُوا أَرْجِهِ وَأَخَاهُ وَابْعَثْ فِي المدَائِنِ حَاشِرِينَ)، (واتە: دارودەستەی فیرعەون وتیان: مۆڵەتێك بدە بە موسا و براکەی، فەرمانیش بنێرە

بۆ کاربەدەستانی هەموو شارەکان تا خەڵکی کۆبکەنەوە و لە پیلانەکە ئاگاداریان بکەین!!)، (الشعراء: ٣٦).

٣- ڕێبازی بێباوەڕی بە پێغەمبەران و تۆمەتبارکردنیان بە جادوو یان شێتی، بەپێی وتەی خوای گەورە: (كذَلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهُمْ مِّن رَّسُولٍ إِلاَّ قَالُوا سَاحِرٌ أَو مَجْنُونٌ)، (واتە: هەر نا بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێك لەپێش ئەماندا نەهاتووە، خوانەناسان نەیانوتبێت جادووگەرە، یان شێتە)، (الذاريات: ٥٢).

**دوانزە:** پەیوەستبوون بە ڕێبازی باووباپیرانەوە:

١- ئەنجامدانی خراپەکاری بە بیانووی ڕێبازی باووباپیرانەوە، قسە هەڵبەستن بە ناوی ڕێبازی خوای گەورەوە، بەپێی وتەی خوای گەورە: (وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لا يَأْمُرُ بِالفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ)، (واتە: کاتێکیش (بێباوەڕان) تاوان و گوناهێك ئەنجام بدەن دەڵێن: باووباپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردووە و خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین!! پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناه و تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێك هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا)، (الأعراف: ٢٨).

٢- دەستگرتن بە ڕێبازی باووباپیرانەوە لادانە لە ئیرادەی شەرعیی خوای گەورە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلا يَهْتَدُونَ)، (واتە: هەر کاتێك پێیان بوترێت: وەرن بۆ لای ئەوەی خوا دایبەزاندووە و وەرن بۆ لای پێغەمبەریش (بۆ ئەوەی داوەری بکات لە نێوانتاندا) ئەوە دەڵێن: هەر ئەو بەرنامەیەمان بەسە کە باووباپیرانمان لەسەری بوون و لە مامۆستا و ڕابەرانمانەوە فێری بووین و بۆمان ماوەتەوە، ئایا ئەگەر کاتێکیش باوان و

مامۆستایانیان هیچ شتێك لە حەرام و حەڵاڵ نەزانن و ڕێنموویش وەرنەگرن، ئەوە هەرشوێنیان دەکەون؟!)، (المائدة: ١٠٤).

٣ـ بەدرۆدانانی دابەزێنراوەکان، لە بەرژەوەندیی ڕێبازی باووباپیران، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ)، (واتە: کاتێکیش پێیان بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە خوا ناردویەتی، ئەوە هەر شوێنی ئەو شتانە دەکەوین کە باووباپیران و مامۆستایانمان پەیڕەوییان لی کردووە، ئایا ئەگەر شەیتانیش بانگی کردبن بۆ سزای داگیرساوی دۆزەخ، هەر پەیڕەوی دەکەن؟!)، (لقمان: ٢١).

**سیانزەیەم:** پشتبەستن بە ڕەهەندی ماددی:

١ـ گومان دروستکردن لە هێنانی بەڵگەی ماددی و تەحەداکردنی، وەك جەختکردنەوەیەك لەسەر بیروباوەڕیان لە بەدوورزانینی بەدیهاتنی، ئەمەش جەخت لەسەر بێباوەڕی و نکوڵیکردن و سووربوون و خۆبەزلزانینیان دەکاتەوە: (وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ)، (واتە: یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە بێ باوەڕان وتیان: خوایە ئەگەر ئەم دین و بەرنامە و قورئانە ڕاستە، لەلایەن تۆیشەوە ڕەوانە کراوە، ئەوە بەرد لە ئاسمانەوە ببارێنە بەسەرماندا، یان بەڵا و سزایەکی بەئێشمان بۆ بهێنە)، (الأنفال: ٣٢).

٢ـ کەوتنەژێر کاریگەریی هاوبەشپەیداکردن و ماددیبوونیان لە بەرامبەر یەکتاپەرستیدا، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ البَحْرَ فَأَتَوْا عَلَى قَوْمٍ يَّعْكُفُونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَّهُمْ قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَل لَّنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةً قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ)، (واتە: لەوەودوا نەوەی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە، دوای تاوێك ڕێیان کەوت لە خەڵکێك کە بەدەوری بتەکانیاندا

دەخولانەوە و دەیانپەرستن، (دەستەیەکیان) وتیان: ئەی موسا خوایەکیش بۆ ئێمە ساز بکە وەکو ئەوانە چەند خوایەکیان هەیە!! موسا پێی وتن: بەڕاستی ئێوە قەومێکن نە دەزانن و نە دەفامن)، (الأعراف: ١٣٨).

٣ـ گومانکردن لە پێغەمبەران و نکوڵیکردن لە موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) و داواکردنی بەڵگەی ماددی، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُوا يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ لَئِنْ كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ)، (واتە: جا کاتێکیش هەر بەڵایەك لەو بەڵایانە بەسەریاندا هات (پەنایان دەبرد بۆ موسا) و دەیانوت: ئەی موسا (فریامان بکەوە) لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە بۆمان، بەو پەیمانەی کە خوا لای داناویت، سوێند بە خوا ئەگەر ئەم بەڵایانەمان لەسەر هەڵگری، ئەوسا بێگومان باوەڕت پێ دەکەین و نەوەی ئیسرائیلیش ئازاد دەکەین و لەگەڵتا دەنێرین)، (الأعراف: ١٣٤).

٤ـ باوەڕنەهێنان بە جیهانی غەیب: داننان بە یەکتاپەرستی تەنها دوای لێکۆڵینەوەی ماددییانە، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَلَمَّا سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا قَالُوا لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الخَاسِرِينَ)، (واتە: کاتێکیش کە لە دەستیان چوو و پەشیمان بوونەوە و (ڕاستییان بۆ دەرکەوت و گوێرەکە بوو بە پەند لەبەر چاویان) زانییان و دڵنیا بوون کە بەڕاستی گومڕا بوون و وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر پەروەردگارمان بەزەیی پیاماندا نەیەتەوە و لێمان خۆش نەبێت، ئەوە بەڕاستی لە زەرەرمەندانین)، (الأعراف: ١٤٩).

**چواردەیەم:** خۆبەزلزانین و هەستکردن بە باڵایەتی و خۆجیاکردنەوەیان تەنانەت لە بەهای مرۆڤایەتیدا: ئەوەتا لەو ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: (قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الأَرْذَلُون)، (واتە: هەندێك لە دەمدارانی

قەومەکەی) وتیان: ئێمە چۆن باوەڕ لەبەر خاتری تۆ بهێنین، لە کاتێکدا کە کەسانی هەژار و داماو شوێنت کەوتوون)، (الشعراء: ١١١)، لەم ئایەتەدا جەختکردنەوە هەیە لەسەر هەستکردنیان بە خۆبەزلزانین بە ناهەق، بە شێوەیەك کە دەبێتە لەمپەر لەبەردەم شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەران، بە بیانووی ئەوەی گوایا ئەوان لەو ئاستە بەرزترن کە ببنە شوێنکەوتووی پێغەمبەران، ئەم هەستە دەروونییە نەخۆشە لەسەر بنچینەگەلێکی ماددیی پڕوپووچ بنیاتنراوە، کە هیچ پەیوەندییەکی بە حەقیقەتی باڵایەتییەوە نییە، ئەو بەرزی و باڵایەتییەی کە لە ئەنجامی بە ڕاستدانانی پێغەمبەران و شوێنکەوتنیان دروست دەبێت، بەشێوەیەك کە مەبەستەکانی خەڵکی بهێنێتە دی، ئەویش بە بەرپاکردنی جێنشینیی لەسەر زەوی، کە پلەکانی ڕێز و بڵندی بەپێی تەقوا و لەخواترسان دادەنێت.

**پانزە:** زەلیلی و خەجاڵەتی: ئەمەش لە میانەی ئەم ئایەتە پیرۆزانەدا دێت: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ المُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ المُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الفَاسِقُونَ * لَن يَّضُرُّوكُمْ إِلاَّ أَذًى وَإِن يُّقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الأَدْبَارَ ثُمَّ لا يُنْصَرُونَ * ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَمَا ثُقِفُوا إِلاَّ بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ المَسْكَنَةُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ)، (واتە: (بەڕاستی) ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا دەهێنن، خۆ ئەگەر خاوەنانی کتێب باوەڕیان بهێنایە (بە ئایینی ئیسلام) ئەوە چاکتر بوو بۆیان، هەیانە ئیماندارن، بەڵام زۆربەیان گوناهبار و تاوانکارن. هەرگیز ناتوانن زیان (لە بیر و باوەڕتان) بدەن مەگەر ئازارێکی کەم و ئەگەر بجەنگن دژتان پشتتان لێهەڵدەکەن و

هەڵدێن، لەوەودواش سەرکەوتوو نابن. (جوولەکە) زەلیلیی و ڕیسواییان بۆ بڕیاردراوە لە هەر کوێ جێگیر بن، مەگەر لە سایەی ئایینی خوادا بحەوێنەوە و (زوڵمیان لێنەکرێت کاتێك ئیسلام فەرمانڕەوا بێت) یان بەخۆ هەڵواسین بە خەڵکیدا بۆ یارمەتیدانیان، یان پشتگرتنیان (لەو سەردەمانەدا کە ئیسلام فەرمانڕەوا بووە بە ئاسوودەیی ژیاون، هەرچەند لە ژێرەوە هەر خەریکی پیلانگێڕان بوون، لە سەدەی بیستەمیشدا توانییان ئەمریکا و وڵاتانی ڕۆژئاوا و هەندێ وڵاتی تریش، بکەنە پشتیوان و داردەستی خۆیان). ئەوانە شایستەی ئەو خەشم و قینەی خوا بوون و زەلیلی و خەجاڵەتی بەشیانە، چونکە ئەوانە بڕوایان نییە بە ئایەتەکانی خوا و پێغەمبەرانیش بە ناحەق دەکوژن، ئەم یاخیبوون و سەرشۆڕییەیان، بەهۆی سەرپێچی و گوناهبارییانەوەیە، ئەوانە هەمیشە لە سنوور دەردەچوون و دەردەچن)، (آل عمران: ١١٠–١١٢)، هەرکەسێکیش خوا ویستی لەسەر سەربەرزکردنی بێت، دڵی ڕێنموویی دەکات بۆ باوەڕ، هەر کەسێکیش لە هیدایەت جیاببێتەوە، یان بە درۆی بخاتەوە، خوای گەورە زەلیلی دەکات، هەر کەسێکیش ئەو ڕاستییەی زانی کە لە هیدایەتدا هەیە و نکوڵیی لێکرد، ئەوە دەکەوێتە چوارچێوەی زەلیلی و سەرشۆڕی، کە وەك تووڕەیی خوای گەورە دێت بەسەریاندا، لە ئەنجامی گۆڕینی ڕاستی و لادانیان لە شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی.

**شانزەیەم:** لادان لە ڕێبازی فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە، کۆمەڵی ئیماندار لە چوارچێوەی کۆمەڵیدا هەڵدەستێت بە چەند ئەرکێك، کە باوەڕەکەی لەسەری فەرز کردووە، بۆیە ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیە وەسفی ئەم حاڵەتە دەکات: (وَالعَصْرِ * إِنَّ الإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ * إِلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ)، (واتە: سوێند بە زەمانە، سوێند بە کاتی عەسر. بەڕاستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایە. بێجگە

لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە و ئامۆژگاریی یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە)، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاریی یەکتریان کردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگر و ئارامگریش بن)، (العصر: ١ـ ٣)، هەر بۆیە وەسفی گومڕایانی ئەهلی کیتاب، بەهۆی سەرپێچیکردنیان لەو بنچینە کۆمەڵییە، بە شێوەیەکی تر هاتووە لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە دەفەرموێت: (كَانُوا لا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ)، (واتە: ئەوانە قەدەغەی یەکتریان نەدەکرد لە خراپە و تاوانێك کە دەیانکرد، سوێند بێت بە خوا ئەوەی کە دەیکەن زۆر خراپ و ناپەسەندە!)، (المائدة: ٧٩).

**حەڤدەیەم:** دڵڕەقی، ئەو دڵانەی کە وەك دڵی ئیمانداران بە یادی خوا نەرم نابن، یاخود دڵڕەقییان لەوپەڕی توندییدا دەبیّ لە حاڵەتی لادانی لە باوەڕ دوای ئەوەی لە دڵیاندا جێگیر بووە، گەڕاونەتەوە بۆ دلڕەقی، بە شێوەیەك کە دڵڕەقییەکەیان لە دڵڕەقیی کەسێك زیاترە کە دڵی گومڕا بووە و پێشتریش لەسەر هیدایەت نەبووە، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنْ بَعْدِ ذَلِكَ فَهِيَ كَالحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ المَاءُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ)، (واتە: پاشان لەوەودوا دڵەکانتان ڕەق بوو، (ئەی جولەکەکان) هەر وەك بەرد، بەڵکو ڕەقتریش (چونکە) بەڕاستی بەرد هەیە ڕووباری لیّ هەڵدەقوڵێت، هەشیانە لەت لەت دەبێت و ئاوی لیّ دێتە دەرەوە، هەشیانە لە ترسی خوا لە لووتکەی شاخەکان بەردەبێتەوە، خوایش بێئاگا نییە لەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن)، (البقرة: ٧٤).

## تەوەری دووەم:

## چەند نموونەیەك لە گومانی سەرپێچكاران و وەسفی ڕێبازەكانیان و وەڵامدانەوەی قورئان بۆیان

**یەكەم:** سنووربەزاندن لە بەرامبەر یەكتاپەرستی و بنچینەكانی و داخوازییەكانی، و بەرامبەر بە زانست، لە ڕێگەی بەكارهێنانی میتۆدی عەقڵیی – ناڕاست و نادروست–ەوە[٧٤]: بەپێی ئەوەی كە لەم ئایەتە پیرۆزە هەڵدەهێنجێنرێت: (وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلا بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ قَالُوا أَتُحَدِّثُونَهُمْ بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَاجُّوكُمْ بِهِ عِنْدَ رَبِّكُمْ أَفَلا تَعْقِلُونَ) (البقرة: ٧٦)، (واتە: (لە مەدینەدا جووەكان) هەر كاتێك تووشی ئیمانداران دەهاتن، دەیانوت: ئێمەش ئیمانمان هێناوە و (موسوڵمان بووین)، بەڵام كاتێك پێكەوە كۆدەبوونەوە لەگەڵ (بەناو زانا و دڵڕەقەكانیان) بە یەكتریان دەوت: ئەوە بۆ ئێوە ئەو شتانەیان بۆ باس دەكەن كە خوا بۆ ئێوەی لە (تەورات)دا باسكردووە (دەربارەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) تاوەكو بیكەنە بەڵگە بەسەرتانەوە لای پەروەردگارتان! ! ئایا ئێوە عەقڵتان بەو شتانە ناشكێت و ژیریتان ناخەنەكار؟!)، وەڵامدانەوەیان و ڕەتدانەوەیان لە چوارچێوەی زانستی ڕاستیدا هاتووە، كە لە ڕێگەیەوە بانگەشەكانیان بە عەقڵگرتن بەدرۆ دەخرێتەوە، یەقین بوونیش بە زانستی خوای گەورە بە نهێنی و ئاشكرایان بریتییە لە زانستی ڕاستی ـ كە هیچ عاقڵێك نكوڵیی لێ ناكات ـ بە خواستەكانی صیفاتەكانی پەروەردگارێتی (الربوبيّة) لە نێویشیاندا هێنانەبوون (الخلق)، بۆیە لە ئایەتەكەدا ناوی بەرزی (الله) بە لەفزی پەروەردگار (الربِّ) "جلَّ جلاله" هاتووە، نەك بە لەفزی (الله)، ئەمەش ئەم وتەیەی خوای گەورە جەختی لێ

---

(٧٤) وهو ما يتنص من الآية العاقبة، البقرة: ٧٧، بقوله: (ألا يعلمون....).

دەکاتەوە: (وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ * أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ)، (واتە: خەڵکینە، چونیەکە بۆتان چ بەنهێنی قسە بکەن یان بە ئاشکرا، ئەو زاتە بە هەموو ئەو خەتەرە و خەیاڵانەی دێن بە کرۆکی سینەکاندا زانا و ئاگایە، مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکار و بەسۆز و ئاگایە)، (الملك: ١٣ـ ١٤)، عەقڵ و مەنهەجی عەقڵی دان بە زانستی خوای گەورەدا دەنێت، بە ئاشکرا و پەنهاندا، بەپێی توانای خوای گەورە بەسەر مەخلوقاتەکانیەوە.

**دووەم:** بەزاندنی (خواستەکانی یەکتاپەرستی بەشوێنکەوتنی ویستە شەرعییەکانی خوای گەورە):

١ـ عوزرهێنانەوە بە شوێنکەوتنی ئەو شەریعەتەی کە پێشتر لەنێویاندا هەبوو، ئەمەش عوزرێکی قبوڵنەکراوە، چونکە جیاوازییان لە ویستی شەرعیی خوای گەورە ـ لە باوەڕهێنان بەوەی کە لە دوای ئەوان بەسەر غەیری ئەواندا دابزیوە لە پەیامی موحەممەدیی جیهانی ـ کوفرێکی تەواوە پێی، بەڵگەی کوفریشیان بە ویستی شەرعیی خوای گەورە: هەستانیان بە کوشتنی پێغەمبەران، ئەو پێغەمبەرانەی کە خوای گەورە نیسبەتی دابوونە پاڵ خۆی کە "پێغەمبەرانی خودا"ن، وەك جەختکردنەوەیەکی تر بۆ شوێننەکەوتنیان، بەڵکو کوشتنیان گوزارشت بوو لە ڕەتکردنەوەیان بۆ ئەو ئەحکامە شەرعییانەی کە هێنابوویان، بەپێی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا نُؤْمِنُ بِمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَاءَهُ وَهُوَ الحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَهُمْ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنْبِيَاءَ اللَّهِ مِنْ قَبْلُ إِنْ كُنْتُم مُّؤْمِنِينَ)، (واتە: کاتێك پێیان دەوترێت باوەڕ بهێنن بەوەی کە لە لایەن خواوە ڕەوانەکراوە، دەڵێن: ئێمە تەنها باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆ ئێمە ڕەوانەکراوە و باوەڕ ناهێنن بە هەموو ئەوانەی کە دوای (تەورات) هاتووە، وەکو (ئینجیل و قورئان) لەکاتێکدا کە هەر ئەو قورئانە حەق

و ڕاستییه و بەڕاست دانەری (تەورات)ی ئەوانیشە، پێیان بڵێ: ئەی کەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەکانی خواتان دەکوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن بە تەورات؟!)، (البقرة: ٩١)، ئەوەتا بەڵگەیەکی تریش هەیە لەسەر بێباوەڕبوونیان بەوەی کە فەرمانیان پێکراوە باوەڕی پێ بهێنن ـ لە بارێکدا ئەوان لە باوەڕی ڕاستی بە شەریعەتەکەیان جیابوونەوە ـ ئەوەیە: وەسفی ئایەتەکە بۆ ئەوەی کە لە دوای ئەوان دابەزیوە بەوەی کە ئەو شەریعەتەی ئەوان هەیانبووە بە ڕاستی زانیوە، ئەوە دەخوازێت کە خێرا باوەڕ بهێنن، بەهۆی ئەوەی کە لە چوارچێوەی یەکێتیی ئایین، بنچینە و مەبەستەکانی شەرعدا هاتووە.

٢ـ کوشتار لەژێر پەرچەمی پاشایەکدا نەك لەژێر پەرچەمی پێغەمبەرایەتیدا، ئەمەش پێچەوانەی ویستی شەرعیی خوای گەورەیە، لە هەمان کاتدا وتووشیانە گوایا ئەو مەرجەی ئەوان مەبەست لێی سەرپێچیکردن نییە لە ویستی شەرعیی خوای گەورە، هەر ئایندەی حاڵی خۆیان بانگەشەکانی خۆیانی بەدرۆخستەوە، ئەویش بە پشتهەڵکردنیان لە کوشتار لەو کاتدا کە کوشتارەکەیان لەسەر فەرز کرا، بەمەش ئەو ستەمکردنەیان لە خودی خۆیان ئاشکرا بوو بە هۆی ئەوەی کە ویستیان، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى المَلإِ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ القِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُوا قَالُوا وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ القِتَالُ تَوَلَّوْا إِلاَّ قَلِيلاً مِنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ)، (واتە: ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە بەسەرهاتی دەستەیەك لە گەورە پیاوانی نەوەی ئیسرائیل لە دوای موسا لەکاتێکدا بە پێغەمبەرەکەی خۆیانیان وت: پاشایەك، سەرکردەیەکمان بۆ دیاری بکە و بینێرە تا لە پێناوی خوادا بجەنگین، پێغەمبەرەکە وتی: باشە، ئەی ئەگەر جەنگتان لەسەر بڕیاردراو خەریك بوو یەخەتان بگرێت و پەشیمان بوونەوە و

نەجەنگان؟ (لە وەڵامدا) وتیان: چیمانە کە لە پێناوی خوادا نەجەنگین، لە کاتێکیشدا ئەوەتە دەربەدەرکراوین و لە ماڵ و منداڵ و وڵاتمان بووین. کەچی کاتێك جەنگیان لەسەر بڕیاردا، تەنها کەمێکیان نەبێت، ئەوانی تر هەموویان پشتیان هەڵکرد و پەشیمان بوونەوە، خوایش زانا و بەئاگایە بە ستەمکاران)، (البقرة: ٢٤٦).

٣. ملکەچپێکردنی ویستی شەرعی بۆ مەنهەجی عەقڵ، بە بیروباوەڕی خۆیان: خاڵیبوونی ئەحکامە شەرعییەکان لە حیکمەت، ئەوەی کە جیاوازیی نێوان حەڵاڵ و حەرام تەنها لە ویستی خوای گەورەدا خۆی دەبینێتەوە لەسەر حەڵاکردن یان حەرامکردن، بە بەڵگەی ئەو بانگەشەیەیان کە گوایا فرۆشتن و سوو لە تەرازووی ڕاستیدا یەکسانن، جیاوازیشیان ـ بەپێی دیدی بەتاڵی ئەوان ـ تەنها لە تەرازووی شەرعدایە، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ المَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا البَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ البَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِّنْ رَّبِّهِ فَانْتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)، (واتە: ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوکەوت ناکەن و ڕاست نابنەوە (لە گۆڕدا) مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت (هەر لە دنیادا سروشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە (لە حاڵێکدا): خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و سووی حەرام کردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاریی پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا، ئەوەی دەستی کەوتووە، بۆ خۆی، کاری (لە لێپرسینەوەشی) دەکەوێتە لای خوا، بەڵام ئەوەی دەست بکاتەوە بە سووخۆریی، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیادا دەبەنەسەر)، (البقرة: ٢٧٥). بەڕاستی وەڵامی پەروەردگاریان بۆ هات لەبەرامبەر ئەو بانگەشەیەی وتیان فرۆشتن و سوو یەکسانن، ئەویش بە

وەسفکردنی ئەوەی کە سوو دەخوات وەك کەسێك وایە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێت و شێتی کردبێت، بەهۆی ئەو بەڵا ئابووری و دابڕانە کۆمەڵایەتییەی کە بەهۆی سووخۆرییەوە دێتە کایە، بەهۆی ئەو پەیوەندیی ئیستیغلالکردنەوەی کە بەهۆیەوە دێتە ئاراوە، بەڵام ئەحکامەکانی شەریعەت بەڕاستی بە تۆکمەیی لەلایەن زاتێکی دانا و شارەزاوە هاتوون و بەڕاستی وەك ڕەحمەت بۆ جیهانیان هاتوون.

**سێیەم:** گومانکردن لە ڕاستیی ئەحکامەکان و مەبەستەکانیان: نموونەکەشی: گونمانکردن لە پەیامی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت)، گومانکردن لە ویستی شەرع و وەسفکردنی بە گاڵتەکردن: (وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً قَالُوا أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الجَاهِلِينَ)، (واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێك موسا بە قەومەکەی وت: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە مانگایەك سەر ببڕن (کاتێك یەکێکیان لێ کوژرا بوو، بکوژەکەش لای زۆربەیان نادیاربوو، هانا و هاواریان برد بۆ موسا) وتیان: ئایا دەمانکەیتە گاڵتەجاڕی خۆت؟ موسا وتی: پەنا دەگرم بە خوا بچمە ڕیزی نەفامانەوە (گاڵتە بە خەڵکی بکەم)، (البقرة: ٦٧)، وەڵامدانەوە بۆ ئەمە ئەوە بوو کە ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات تەواو زانست و حەقیقەتە، کەواتە ناگونجێت پێغەمبەرانی خوا (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) گاڵتەجاڕی یان گاڵتە لە ئەرکێکدا بکەن کە پەیوەندیی بە پەیامەکەیانەوە هەیە، ئەو پەیامەی کە تەنها جێی زانست و ڕاستیی تێدا دەبێتەوە، بەشێوەیەك کە جەخت لە حیکمەتی ئەحکامەکان و ڕەچاوکردنی خوای گەورە بۆ مەبەست و ئامانجەکانی لە تەشریعدا دەکاتەوە.

**چوارەم:** ملکەچپێکردنی سوننەتی ژیان و مردن، ویستی خوای گەورە لە تەدافوعی نێوان خەڵکی بۆ مەنهەجێکی عەقڵانیی ماددی:

١. ئەمەش لە چوارچێوەی ئەم ئایەتەدا دێت: (الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنْفُسِكُمُ المَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ)، (واتە: ئەوانەی بۆی دانیشتن و (نەچوون بۆ جەنگ) بە براكانی خۆیانیان وت: ئەگەر ئەوانە (واتە شەهیدەكان) بە قسەی ئێمەیان بكردایە، نەدەكوژران، ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: دەی كەواتە مردن لە خۆتان دووربخەنەوە ئەگەر ڕاست دەكەن؟! هەرگیز وا مەزانن و وا دامەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون و كوژران، مردوون، نەخێر وانییە، بەڵكو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزیی (هەمە جۆر و تایبەت) بەهرەوەرن)، (آل عمران: ١٦٨)، ئەم وتەیەشیان دوای ئەوە هات كە قورئان بڕیاری لەسەر بێباوەڕیی دووڕووەكان دا، دوای ئەوەی كە حەقیقەتی دووریان لە باوەڕەوە بەهۆی ئەوەی كە وتبوویان، ئاشكرا بوو، چونكە ئەوەی كە وتبوویان گوزارشت بوو لە خاڵیبوونی دڵەكانیان لە باوەڕ، هەر بەهۆی ئەوەی كە وتبوویان چەند شتێك هاتنە دی، لەوانە: خۆشویستنیان بۆ ژیان و فەزڵدانی ژیان بەسەر فەرمانی خوای گەورە بە جیهادكردن، چونكە ئەگەر ئەوەی هەیە ببێتە هۆی تەواوكردنی ژیان، باوەڕیان وابوو كە هۆكارەكانی مردن لەو جیهادەدا خۆی دەبینێتەوە، بۆیە ویستیان هۆكارەكەی ببڕن كە خوای گەورە تەقدیری كردووە، بۆیە وەك تەحەددایەك و بەدرۆخستنەوەیەك بۆ مەنهەجە عەقڵانییە ماددییەكەیان "بەدوور خستنەوەی مردن لە خۆیان"، وەڵامی خوای گەورەیان بۆ هات، ئەمەش تەحەددایەكە كە ماددە لەئاستیدا بێ توانایە، هەروەك چۆن عەقڵ لە ئاستیدا دەسەوسانە، چونكە جار هەیە كەسی ساغ دەمرێت و جاریش هەیە كەسی نەخۆش تەمەندرێژ دەبێت، جگە لە ویستی خوای گەورە سوننەتەكانی لە ژیانی دروستكراوەكانیدا، هیچ هۆكارێكی تر بۆ ئەمە نییە.

**پێنجەم:** گومانکردن لە پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت):

١. گومانکردن لە پێغەمبەران و داواکردنی بەڵگەی ماددی بەمەبەستی دەرخستنی ناتوانایی پێغەمبەران و پاشان بەدرۆخستنەوەیان، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَا أَلاَّ نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّى يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ النَّارُ قُلْ قَدْ جَاءَكُمْ رُسُلٌ مِّنْ قَبْلِي بِالبَيِّنَاتِ وَبِالَّذِي قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ)، (واتە: (ئەو جوولەکانەی) دەڵێن: خوا پەیمانی داوە بە ئێمە کە بە هیچ پێغەمبەرێك باوەڕ نەکەین تا قوربانییەکمان بۆ نەهێنێت و (نەیبینین) ئاگر دەیخوات و دەیسوتێنێت و لە ناوی دەبات، (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: خۆ ژمارەیەك پێغەمبەر لە پێش منەوە ڕەوانەکران بۆتان بە چەندین بەڵگە و نیشانەی ئاشکراوە و بەو داخوازییەشەوە کە وتتان، جا بۆ کوشتانن و (شەهیدتان کردن) ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن؟!)، (آل عمران: ١٨٣)، کەواتە داواکردنیان بۆ بەڵگە ماددییەکان، لە چوارچێوەی بێباوەڕییاندا دێت، ئەمەش دوو مەسەلە جەختی لێ دەکەنەوە: یەکەم: پەیوەستە بە داواکردنیان بۆ بەڵگەکان، کە لە دەروازەی گوماندروستکردنەوە سەرچاوە دەگرێت، کە بێباوەڕییان و حەزکردنیان لە باوەڕنەهێنان و شوێنکەوتنی دەردەخات. دووەم: لە سوننەتی خوای گەورەدا خۆی دەبینێتەوە لەبارەی دروستکراوەکانیەوە کە لە دوو بازنەدا دایان دەنێت: بێباوەڕی یان باوەڕ، بەپێی ئەوەی کە لەم میانەیەدا ڕوونی کردووەتەوە، لەو چوارچێوەیەدا ئایەت هاتووە،[٧٥] و بیانووی ئەوانی بە داواکردنی بەڵگە ماددیەکان وەك مەرجی باوەڕهێنانیان بەدرۆدەخاتەوە، چونکە پێشتر خوای گەورە بەڵگەی ماددیی لەو شێوەیەی بۆ پێغەمبەران ناردووە، بەڵام ئەوان بەدرۆیان خستوونەتەوە، بەڵکو کەمینیان لە

---

([٧٥]) لێرەدا مەبەستم لە ئایەتەکانی: ١٧٦ و ئایەتەکانی دواتری سورەتی (آل عمران)دا هاتوون.

خۆیان و بانگەوازەکەشیان گرتووە، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕاستیی گومانکردنیان لە پێغەمبەران بە داواکردنی بەڵگەکان ببێتە درۆیەك لەسەر خوای گەورە و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران.

٢. گومانکردن لە پێغەمبەران و ڕەتکردنەوەی مرۆڤبوونیان: هەر لەو چوارچێوەیەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتووە: (وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جاءَهُمُ الهُدَى إِلا أَنْ قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَسُولا)، (واتە: هیچ شتێك نەبووەتە کۆسپ لە ڕێگەی ئەوەدا خەڵکی باوەڕ بهێنن ـ کاتێك هیدایەتیان بۆ هات ـ تەنها ئەوە نەبێت کە وتیان: ئایا خوا مرۆڤێکی بە فرستادە ناردووە؟! (لەباتی ئەوەی زوو بەدەم بانگەوازی خواوە بچن و ئەوە بەڕێز بۆ خۆیان بزانن، کە نوێنەریان لێ هەڵدەبژێرێت و ئیمانی پێ بهێنن، زۆربەی خەڵکی لە سەردەمەکانی عەقڵیان کول بووە لە ئاستی ئەو ڕێزە تایبەتییەدا)، (الإسراء: ٩٤)، بەڕاستی هیچ بەهانەیەکیان نەما بۆ بەدرۆخستنەوە، تەنها ئەوە نەبێت بڵێن پێغەمبەران مرۆڤن، ئەمەش دوای ئەوە هات کە هیچ بەڵگەیەکیان نەما بۆ بەدرۆخستنەوەی ناوەرۆکی ئەو ڕاگەیاندن و بانگەوازەی پێغەمبەران هێناویانە، ئەو بانگەوازەی دوو کەسی هۆشمەند ناکۆك نابن لەسەر ئەوەی کە سەرچاوەکەی خوای بەرز و بڵندە، یان لە دەرەوەی بازنەی مرۆییدایە، ئەگەر نزمترین ئاستی تەسلیمبوون بە بەرزی و باڵایی ناوەرۆکەکەی وەرگرین.

٣ـ گومانکردن لە پێغەمبەران و تۆمەتبارکردنیان بە هەڵبەستن (الافتراء)، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ)، (واتە: کاتێکیش ئایەتێك دەخەینە جێی ئایەتێکی تر (بۆ ئەوەی پلە بە پلە شتێك حەرام بکەین، یان دیاردەیەکی نەفامی لابەرین) خوایش خۆی دەزانێت چی دادەبەزێنێت و چ فەرمانێك دەدات، ئەوە نەفامان دەڵێن: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بێگومان تۆ هەر لە

خۆتەوە شت هەڵدەبەستیت، نەخێر وا نییە، (ئەو لە خۆیەوە شت ناڵێت) بەڵکو زۆربەی ئەو نەفامانە تێناگەن و نازانن)، (النحل: ١٠١)، خوای گەورە نیسبەتی بڵندی دەداتە پاڵ زاتی خۆی و ئیرادەی شەرعیی ئەو گۆڕینی بەڵگە و ئایەتەکانە، ئەمەش ڕاستی دانی پێدا دەنێت و هەرکەسێکیش زانستی ڕاستیی وەرگرتنبێت و بە ڕاستی زانیبێت، قبووڵی دەکات.

٤. گومانکردن لە پێغەمبەران و تۆمەتبارکردنیان بە جادوکردن: (قَالُوا إِنْ هَذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَن يُّخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ المُثْلَى)، (واتە: (هەندێك لە دارودەستەی فیرعەون) وتیان بە (جادووگەران) بەڕاستی ئەم دوانە، دوو جادووگەرن و دەیانەوێت لە وڵات و نیشتمانی خۆتان دەرتانپەڕێنن بەهۆی جادووەکەیانەوە و ئەم ڕێگە و بەرنامە گرنگ و بەرزەی ئێوە لەناو بەرن...)، (طە: ٦٣)، بەدرۆخستنەوەی ئەو دوو پێغەمبەرە لەم ئایەتەدا بەهۆی ئەوەوە بوو کە بە جادووکردن وەسف کرابوون، ئەمەش وەك گومڕاکردن و لاڕێکردن لە ڕاستی و ناشرین کردنی ڕووی ئەو ڕاستییە، ئەویش بە دەرکردنی بەنوئیسرائیل لە خاکی میسر، کە تێیدا کرابوون بە کۆیلە و تەرخانکرابوون بۆ خزمەتکردنی خەڵکەکەی، بۆیە وەسفی ئەو خاکە بەوە هات کە خاکی ئەوانە، بۆ ئەوەی ئەمەش ببێت بە یەکێك لە ئامرازەکانی گومڕاکردن، بۆیە ڕێبازی بەتاڵکردنەوەی بانگەشەکانیان لە تەحەدداکردنی جادووەکەیاندا خۆی بینییەوە.

٥ـ گومانکردن لە پێغەمبەران و وەسفکردنی ئەوەی کە دەیفەرموون بەوەی کە: خەو و خەیاڵی بێسەر و بن و هەڵبەستن و شیعرە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ)، (واتە: بەڵکو (شتی تریشیان) دەوت: (وەك ئەوەی کە گوایە ئەم قورئانە): خەو و خەیاڵی بێ سەر و بنە، یاخود خۆی هەڵی بەستووە، بەڵکو ئەو کەسێکی شاعیرە، دەبا بەڵگە و موعجیزەیەك بهێنێت وەك پێغەمبەرانی

پێشوو!!)، (الأنبياء: ٥)، بۆیە وەڵامدانەوەیان لە چوارچێوەی بیرهێنانەوەیان بوو: بە زانستی خوای بەرز و بڵند بۆ قسەکردن لەسەر ئاسمانەکان و زەوی، بەوەی کە قورئان باسی ئەوان لەخۆ دەگرێت، لە چوارچێوەی ئەوەدا کە پێشتر باسی لێپرسینەوە و نزیکیی ئەو لێپرسینەوەیەی کردووە، ئەمە وێڕای وەسفکردنیان بە غافڵبوون و پشتهەڵکردن و گاڵتە و گەمەکردن. (٧٦)

٦. گومانکردن لە ڕۆڵی پێغەمبەران و وەسفکردنیان بە "گومڕایی"، پاشان تەحەدداکردنیان بۆ پێغەمبەران –وەکو بەڵگەیەکی بێباوەڕان لەسەر بانگەشەکانیان– بە داوای خێراهاتنی سزا بۆیان، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ)، (واتە: خوانەناسانی قەومەکەی پێیان وت: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتوویت کە ئێمە لە بەندایەتیی خواکانمان لابدەیت؟! کەواتە ئەگەر لە ڕاستگۆیانی، ئەو هەڕەشانەی کە لێمان دەکەیت، پێشی بێنە بۆمان!)، (الأحقاف: ٢٢)، بۆیە وەڵامەکەیان بەم شێوەیە بۆ هات کە: خوای گەورە زانستی بەوە هەیە کە دەیەوێت، لە ئاگادارکردنەوەیان بە سزای خۆی، لەسەر هاوبەش پەیداکردنیان و ئەرکی پێغەمبەرانیش ڕاگەیاندنە، ناتوانن سزا داببەزێنن و ئەو نەفامییەی ئەوان ڕادەگەیەنن کە لەمەڕ توانای خوای گەورە هەیانە سەبارەت بە دابەزاندنی سزا بۆ ئەو هاوبەشپەیداکەرانەی کە ئاگادارکراونەتەوە.

**شەشەم:** گومانکردن لە نیگای قورئانی و هەموو دابەزێنراوەکانی تر:

١. گومانکردنیان لە قورئان: بە گومانکردن لە ناوەڕۆکەکەی، دانیان بەوەدا نەدەنا کە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دابەزێنراوە و دەیانوت داستانی پێشینانە، ڕووداوی نەتەوەکانی پێشوو دەگێڕێتەوە، مەبەستیان لەم وەسفەش ئەوە بوو کە: ئەم قورئانە شتێکی نوێی نەهێناوە کە ئەمان

(٧٦) ئایەتەکانی: (١-٤) لە سورەتی (الأنبیاء).

نەیانبیستبێت و پێی ئاشنا نەبووبن، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنن کە ئەم قورئانە نیگا نییە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنْزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ)، (واتە: خۆ ئەگەر بە (بێ باوەڕان) بوترێت: ئەوە پەروەردگارتان چی دابەزاندووە؟! ئەوە (بێشەرمانە) دەڵێن: چیرۆك و داستانی کۆن و خەیاڵی پێشینانە!!)، (النحل: ٢٤).

٢ـ گومانکردن لە نیگا: دەیانوت جۆرێکە لە خەون، کە پێغەمبەران دەیبینن، ئەمەش لە چوارچێوەی ڕەتکردنەوەیان بۆ نیگابوونی قورئان، هەروەها دەیانوت ئەم قورئانە هەڵبەستراوە بۆ ئەوەی ڕاستیی بانگەوازی پێغەمبەران ڕەت بکەنەوە، یاخود دەیانووت ئەم قورئانە شیعرە لەپێناو ئەوەی گوتاری بەیانیی و ڕەوانبێژیی پێغەمبەران ڕەتبکەنەوە. دوای ئەمانە داوای بەڵگەیان کرد بۆ دەستەوسانکردنی پێغەمبەران، ئەمەش لە چوارچێوەی ئەو بەهانەیەیاندا کە کەلەپوور لە هێنانی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ بەڵگەکان پشتیوانی دەکات، ئەمەش —لە دیدی ئەواندا— عەقڵ پەسەندی دەکات و بەهانەکەیان بەهێز دەکات، ئەمە لە کاتێکدا کە چەندین شتی جێگیری شەرعی بەدی هاتووە لە وێنەی بەڵگە و ئایەتەکان، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ)، (واتە: بەڵکو (شتی تریشیان) دەوت: (وەك ئەوەی کە گوایە ئەم قورئانە): خەو و خەیاڵی بێ سەر و بنە، یاخود خۆی هەڵی بەستووە، بەڵکو ئەو کەسێکی شاعیرە، دەبا بەڵگە و موعجیزەیەك بهێنێت وەك پێغەمبەرانی پێشوو!!)، (الأنبياء: ٥).

٣. بەدرۆخستنەوەیان بۆ ئایەتە بەیانییەکان و داواکردنیان بۆ ئایەت و بەڵگەی ماددی: داوای بەڵگەیەکیان کرد بە زیندووکردنەوەی باووباپیرانیان، وەکو بەڵگەیەك بۆ ڕاستێتیی زیندووبوونەوە، لە چوارچێوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: (وَقَالُوا مَا هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلاَّ الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ

بِذَلِكَ مِن عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ * وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِم آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلاَّ أَنْ قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِنْ كُنْتُم صَادِقِينَ * قُلْ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لا رَيْبَ فِيهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ * وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ المُبْطِلُونَ)، (واتە: خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگار و زەمانە کایگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنها پشت بە گومان و دوودڵی دەبەستن. کاتێکیش ئایەتەکانی قورئانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە (کە بەڵگەی زۆر بەهێز و ڕوونی تێدایە لەسەر زیندووبوونەوە، هەموو بەڵگەیەکیان هاتووەتە سەر ئەوەی) کە دەڵێن: دەباشە باووباپیرانی مردوومان بۆ زیندوو بکەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن؟! (شایەنی باسە کە حەزرەتی عیسا ئەو کارەی بۆ خەڵکی ئەنجام دا بە ویستی خوا، کەچی وتراوە: ئەمە سیحر و جادووە)؟! ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: (ئەو شتانە بەدەست ئێمە نییە) ئەوە هەر خوایە ژیانتان پێ دەبەخشێت و پاشان دەتان مرێنێت و دوای ئەوە کۆتان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانی تیادا نییە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن. هەر خوا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، ئەو ڕۆژەی کە قیامەت پێش دێت، هەر ئەو ڕۆژە هەرچی بەتاڵپەرست و ناحەق پەرستانە لە زەرەرمەندییەکی زۆر گەورەدا دەبن)، (الجاثية: ٢٤-٢٧)، بۆیە وەڵامی ئەو بیروباوەڕەی ئەوان بەوە هات -کە مرۆڤ لە دونیادا دەژیەت بەبێ زیندووکردنەوە و بەبێ لێپرسینەوە- لە چوارچێوەی ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) کردووە لە: هەواڵپێدانیان کە تەنها (الله) پەروەردگاریانە، ژیێنەر و مرێنەرە، هەر ئەویش بۆ ڕۆژی دوایی کۆیان دەکاتەوە، چونکە موڵکدارێتیی ئاسمانەکان و زەوی هەمووی هەر هی خۆیەتی.

**حەوتەم:** بەڵگەهێنانەوەیان بە مەحاڵبوونی زیندووبوونەوە ڕێچکەیەکی جێگیرە لای بێباوەڕان: ئەمەش لە میانەی بەڵگەکانی ئەم ئایەتانەدا دێت: (بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الأَوَّلُونَ*قَالُوا أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ*لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَذَا مِنْ قَبْلُ إِنْ هَذَا إِلا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ*قُلْ لِمَنِ الأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ* سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ * قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ العَرْشِ العَظِيمِ*سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ* قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلا يُجَارُ عَلَيهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ*سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ*بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِالحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ)، (واتە: لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا ئەوانە هەر وەکو خەڵکی پێشین قسە کۆنەکان دەڵێنەوە و دەڵێن: باشە، ئەگەر مردین و بووینە خاك و خۆڵ و ئێسك، ئایا ئێمە دووبارە زیندوودەکرێینەوە؟! بە ڕاستی ئێمە و باووباپیرانمان لەم جۆرە بەڵێنانەمان پێشتر پێدرابوو، ئەم قسە و بەڵێنانە داستانی پێشینەکانە!!. تۆش پێیان بڵێ: باشە زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین، کێ خاوەنیانە، ئەگەر زیرەك و هۆشیارن؟ ئەگەر شت دەزانن؟! سەرئەنجام هەر دان بە ڕاستیدا دەنێن و دەڵێن: هەر خوا خاوەنیانە، هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە. ئەوسا پێیان بڵێ: جا ئەوە بۆچی یاداوەری وەرناگرن؟ پێیان بڵێ: ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیە و کێ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی گەورە و فراوانە؟ (ئاسمانەکان و زەوی لە بەرامبەر عەرشی پەروەردگاردا، وەکو ئەڵقەیەکی پەنجە وایە لە پاڵ چیایەکی گەورەدا). سەرەنجام دەڵێن: هەر خوا پەروەردگاریانە، ئەوسا بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن؟ خۆتان ناپارێزن لە خەشم و قینی؟ (ئاخر ئێوە لە کێ یاخی دەبن؟). (هەروەها پێیان) بڵێ: کێ جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، لە کاتێکدا هەر ئەو پەنابەخشە و کەس ناتوانێت لە سزای ئەو زاتە کەس پەنا بدات، ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزابن. (سەرەنجام بۆ ئەمەش) دەڵێن: هەموو

ئەوانە بە دەست خوایە، تۆش بڵێ: کەواتە چۆن جادووتان لێ دەکرێت؟ کە ئەمە دەزانن. نەخێر وانییە، بەڵکو ئێمە حەقیقەت و ڕاستیمان بۆ هێناون، بەڕاستی نەفامان هەمیشە درۆزنن)، (المؤمنون: ٨١–٩٠)، ئایەتەکان باس لە ڕێچکەی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران دەکات، وەك ڕاگەیاندنێك بۆ ڕاستییەکی جێگیر لە کەسانی درۆزندا، هەروەها وەك دڵدانەوەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەروەها وەك ڕاگەیاندنێك بۆ سنووری بانگەوازەکەی و چڕبوونەوەی لەوەدا کە ئەو تەنها یادخەرەوەیە نەك کەسێکی زاڵ، ئەوەشی کە ئەوان کردبوویان بە بەڵگە، وەڵامەکەی لەو چوارچێوەیەدا دێت کە بریتییە لە: بیرخستنەوە بە پرسیار لەبارەی سەرەنجامی گەڕانەوەی زەوی و ئەو دروستکراوانەشی کە تێیدایە، کە ئەوان بەدڵنیاییەوە زانیویانە کە بۆ لای خوای گەورەیە، چونکە پرسیارکردن لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی مەزن، لە چوارچێوەی هەوڵدان بۆ وروژاندنی تەقوا و لەخواترسان تێیاندا هات، پاشان پرسیارکردن لە مەلەکووتی هەموو شتەکان و لەناوبردنیان، بەشێوەیەك کە دواتر ڕاستییەکی زانستی بەدی دەهێنێت کە لە ڕێبازێکی ڕاستی تەواوکارەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوان درۆزنن، لەوەدا کە دان بەوەدا دەنێن کە خوای گەورە خاوەنی زەوی و ئەوەشە کە تێیدایە و پەروەردگاری ئاسمانەکان و عەرشە و مەلەکووت هەر بۆ ئەوە، چونکە مافی خوای گەورەیان تێدا نەداوە لە بەڕاستزانینی پێغەمبەرەکانی، بەهۆی بەدرۆخستنەوەیان بۆ توانای زیندووکردنەوە و بڵاوکردنەوە لای خوای گەورە.

**هەشتەم:** حسابکردن بۆ میراتگریی ڕێبازی باووباپیران:

١ـ بەهانە هێنانەوە بۆ ئەو هاوبەش پەیداکردن و لادانە لە یەکتاپەرستیی ڕاست بەوەی کە ئەوان بۆیان ماوەتەوە لە باووباپیرانیانەوە لەو ڕێبازە

هاوبەشپەیداکەرییە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ * قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ * أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ * قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ)، (واتە: وتیان (ئاشکرایە) ئێمە کۆمەڵێ بت دەپەرستین و بەردەوام دەورو خولیان دەدەین. ئیبراهیم وتی: ئایا کاتێك کە هانا و هاواریان بۆ دەبەن و دوعا و نزا دەکەن، گوێیان لە ئاه و ناڵە و داخوازیەکانتان هەیە؟! یاخود دەتوانن ئەوانە قازانجێك یان زیانێکتان پێبگەیەنن؟ بتپەرستان وتیان: (ئێمە ئەوە نازانین) باووباپیرانمان بینیوە ئاوایان کردووە (ئێمەش وا دەکەین).)، (الشعراء: ٧١–٧٤)، وەڵامەکە لە چوارچێوەی سێ تەوەردا هات: **یەکەم:** ڕوونکرنەوەی حەقیقەتی ئەوەی کە دەیپەرستن. ئاشکراکردنی تایبەتمەندییە خاکییەکەی کە نزمییەکەی بۆ خوار ئاستی مرۆڤ دەردەخات، لە کاتێکدا پێویستە پەرستراو بەرز و باڵاتر بێت لە پەرستەر. دووەم: بەرێبوون لەوەی کە ئەوان دەیپەرستن. سێیەم: ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ئەوەی کە شیاوی پەرستنە لە شوێنەوارەکانی پەروەردگارێتی، وەك توانابوون بەسەر: دروستکراوەکاند (الخلق)، زیندووکردنەوە، مراندن، ڕۆزیدان، شیفادان، لێپرسینەوە، لە چوارچێوەی ئەم ئایەتانەدا: (فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلا رَبَّ الْعَالَمِينَ * الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ * وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ * وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ * وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ * والَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ)، (واتە: بێگومان هەموو ئەوانە دوژمنی منن، بە دوژمنی خۆمیان دەزانم جگە لە پەروەردگاری جیهانەکان. ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنموییم دەکات (بۆ بەختەوەریی هەردوو جیهان). ئەو زاتەش خۆی خۆراکم پێ دەبەخشێت و تینویەتیم دەشکێنێت. کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم، ئەوە هەر ئەو چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت. هەر ئەویش دەممرێنێت و لەوەودواش زیندووم

دەکاتەوە. هەر ئەوە ئومێدم پێیەتی کە لە گوناهم خۆش ببێت لە ڕۆژی قیامەتدا)، (الشعراء: ٧٧- ٨٢).

٢ـ حسابکردن بۆ ڕێبازی باووباپیران لە چوارچێوەی بەدرۆخستنەوەیان بۆ پێغەمبەران: بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ)، (واتە: پێغەمبەرانیان وتیان: باشە، ئاخر گومان لە چی دەکەن؟ ئایا لە خوای پەروەردگاردا گومان هەیە؟! بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟! ئەو زاتە بانگتان دەکات بۆ ئەوەی لێتان خۆش ببێت، بۆ ئەوەی هەڵە و گوناهەکانتان چاوپۆشی بکات و مۆڵەتیشیتان دەدات تا کاتێکی دیاریکراو، کەچی (خوانەناسان ڕوو بە پێغەمبەران) وتیان: ئێوە تەنها بەشەرن وەکو ئێمە، هیچی تر نین (لەباتی سوپاسی خوا بکەن کە ئەوەندە ئادەمیزاد ڕێزدارە، نوێنەر لە خۆیان هەڵدەبژێرێت)، کەچی ڕەخنەیان گرت و وتیان: ئێوە دەتانەوێت ڕێگر و دژ بەوە بن کە باووباپیرانمان دەیانپەرست (دەی ئەگەر ڕاست دەکەن) بەڵگەیەکی ئاشکرامان بۆ بهێنن و نیشانمان بدەن؟!)، (إبراهيم: ١٠)، وەڵامی ئەو گومانە لە چوارچێوەی یادهێنانەوە بە حەقیقەتی ئیلاهی و ئەو بەڵگانەدا هات کە خوای گەورە لە ربوبیەتی خۆیدا هەیەتی، وەك: هێنانەبوونی ئاسمانەکان و زەوی بە حەق، هەروەها خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ڕێنموویيکردنی خەڵك ناردووە، ئەم دوو شتەش لە چوارچێوەی بیرهێنانەوەی جێنیشینبوونی مرۆڤ دێن لەسەر زەوی، ئەو جێنشینییەش لە مەبەستەکانی خەلقکردنە، لە چوارچێوەیەکی کۆکەرەوەی پێویستییەکانی هەریەك لە ربوبییەت و ئولوهییەتدا پێکەوە.

٣ـ هەروەها دەستگرتن بەو کەلەپوور (التراث)ەوە کە لە باووباپیرانیانەوە فێری بوون، لەسەر حسابی ئیرادەی شەرعیی خوای گەورە: ئەمەش نە عەقڵی تەندروست قبووڵی دەکات، نە بەڵگەشە لەسەر هیدایەتدرانی باووباپیرانیان، چونکە ئەوەی کە لە باووباپیرانیانەوە بۆیان دەمێنێتەوە، مەرج نییە پابەندبوونیان بە ویستی شەرعیی خوای گەورە بگەیەنێت سەبارەت بە باووباپیرانیان، هیچ مانایەکی شوێنکەوتنی ئەو پەیامە دابەزێنراوە ناگەیەنێت کە لە سەردەمی ئەواندا هەبووە، کە گوزارشتە لە ویستی شەرعیی خوای گەورە سەبارەت بەوان، ئەمەش بە ڕوونی لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێت: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلا يَهْتَدُونَ)، (واتە: ئەگەر بەو خەڵکە نادانانە بوترێت: شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە باووباپیرانمان پێوەی ئالوودە بوون و لەسەری ڕاهاتوون، ئایا ئەگەر باووباپیرانیشیان تێنەگەیشتوو و هیچ نەزان و ناشارەزابن و ڕێنموویش وەرنەگرن (هەر شوێنیان دەکەون؟!)، (البقرة:١٧٠).

**نۆیەم:** نکوڵیکردنی ئەو بەڵگە موعجیزانەی کە پشتگیریی پێغەمبەرانیان دەکرد: بەدرۆخستنەوەی بەڵگە و ئایەتەکان دوای بەدیهاتنیان و تۆمەتبارکردنی پێغەمبەران بە جادوو دێت، بەڵگەکان دوای ئەوە دێن کە بێباوەڕان هێنانیان دەکەن بە مەرج بەسەر پێغەمبەرانیانەوە بۆ ئیمانهێنانیان، بەڵام هەندێکیان خێرا لەو پەیمانەی داویانە بە باوەڕهێنان، ڕادەکەن، ئەمەش لە چوارچێوەی ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێت: (فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ آيَاتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ)، (واتە: جا کاتێك _ موعجیزە _ کانی ئێمەیان بە ڕوونی و ئاشکرا بۆ هات و خرایە بەرچاویان، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە) (النمل:١٣)،، لە میانەی ئەم بەڵگە و ئایەتانەدا خوای گەورە ئاماژە بەو نۆ بەڵگەیە دەکات کە پشتیوانیی

موسا (سەلامی خوای لێبێت)ی پێکرد، کە ناردی بۆ لای فیرعەون و قەومەکەی بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ فِي تِسْعِ آيَاتٍ إِلَى فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ)، (واتە: جا دەستەکەت بخەرە گیرفانتەوە، هەر کە دەرتهێنا بە سپییەکی بیٚ عەیب دێتە دەرەوە، ئەم دوو _ موعجیزە _یە لە ڕیزی نۆ _ موعجیزە _ دایە بۆ فیرعەون و قەومەکەی، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی لە سنوور دەرچوو بوون)، (النمل: ١٢)، بۆ پشتگیریکردنی موسا، کە بە ترسەوە بەجێی هێشتن دوای ئەوەی کە کەسێکی لیٚ کوشتن، پێویستی بە بەڵگەی ڕوون و دەستەوسانکەر هەیە، کە پشتگیریی بانگەوازەکەی بکات بەوەی کە ئەو نێرراوە و پەیامبەرە بۆ بەنی ئیسرائیل، دوای دیارنەمانێك کە چەند ساڵێکی خایاندبوو.

**دەیەم:** چەند نموونەیەکی گشتی لە هەڵوێست بەرامبەر کۆتا پەیامی موحەممەدی:

**یەکەم:** هەڵوێستی بەنو ئیسرائیل لە حەقیقەتی کۆتا پەیام (ئیسلام):

چەند نموونەیەك لەسەر ناسینی ئەهلی کیتاب بۆ ڕاستێتیی پەیامی موحەممەدیی جیهانیی:

أ. بەڕاستدانان بە زوبان (تصديق قوليّ): ئەویش بە ناسینی یەقینیان بۆ سیفەتەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، بە ڕاستی لە چوارچێوەی گەواهیدان لەسەر ڕاستگۆیەتیی ئەو —دوای ئەوەی هاوبەشپەیداکەران بەدرۆیان خستەوە— بەوەی کە ئەو ئەو کەسەیە کە لە پەڕاوەکانیاندا سیفەتەکانیان دۆزیوەتەوە و چاوەڕێی نێردرانیان کردووە، بەپێی سیاقی ئەم ئایەتە پیرۆزانە: (قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُل لاَّ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ * الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ الَّذِينَ

خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ)، (واته: (ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەوانە بڵێ کە شایەتیان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ) چ شتێك گەورەتر و ڕاستترە لە شایەتیدا؟! هەر خۆت بڵێ: الله ڕاسترین شایەتە، کە شایەتی نێوان من و ئێوەیە، من ئەم قورئانەشم بە وەحی و نیگا بۆ هاتووە، تا ئێوە و هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە، ئاگادار و بێدار بکەم، (لەگەڵ ئەم هەموو ڕوونکردنەوانەدا) ئایا ئێوە ئیتر شایەتی دەدەن کە بەڕاستی لەگەڵ خوادا چەند خوایەکی تر هەبێت؟! بڵێ: (من بەش بەحاڵی خۆم) شایەتیی ناحەق و ناڕەوای وا نادەم و بڵێ: بەڕاستی ئەو خوایە زاتێکی تاك و تەنهایە و من بەڕاستی بەریم لە هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانکەنە هاوەڵ و هاوتای ئەو زاتە. ئەوانەی کتێبی (ئاسمانیمان پێداون لە گاور و جوو) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەناسنەوە هەروەك چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسنەوە، (بەڵام) ئەوانەی کە خۆیان دۆڕاند و بڕوایان بە موحەمەد (صلی الله علیه وسلم) نەهێناوە، ئەوە هەر باوەڕ ناهێنن)، (الأنعام: ١٩–٢٠)، هەروەها ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلاً قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الكِتَابِ)، (واتە: ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون دەڵێن: تۆ پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوا نیت، لە وەڵامیاندا بڵێ: هەر خوا بەسە کە شایەت بێت لە نێوان منیش و ئێوەشدا، هەروەها ئەو کەسەش کە شارەزای قورئان و کتێبە ئاسمانییەکانە)، (الرعد: ٤٣).

ب. بەڕاستدانانی کردارەکی (تصديق فعليّ): بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزانە: (وَبِالحَقِّ أَنْزَلْنَاهُ وَبِالحَقِّ نَزَلَ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إلا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا*وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنْزِيلا *قُلْ آمَنُوا بِهِ أَوْ لا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا العِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّدًا*وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولا*وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا)، (واتە: ئێمە قورئانمان لەسەر

بنچینەی حەق و ڕاستی دابەزاندووە، بۆ چەسپاندنی حەق و ڕاستیش دابەزیوە، ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە مژدەبەخش بیت (بە ئیمانداران) و ترسێنەر بیت (بۆ خوانەناسان). ئێمە قورئانیشمان بەش بەش کردووە تا بە شێنەیی و بە ئارامی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا، هەر ئێمەش بەو شێوەیە دامانبەزاندووە (کە تۆ ڕایدەگەیەنیت). پێیان بڵێ: (ئەی خوانەناسان) باوەڕ بە قورئان بهێنن یان باوەڕی پێ نەهێنن (بەدەست خۆتانە و ئەمڕۆ سەربەستن، بەڵام بزانن) بەڕاستی ئەوانەی پێشتر زانیارییان پێدراوە، (دەربارەی تەورات و ئینجیلی دەستکاری نەکراو، چاك دەزانن کە ئەم قورئانە لە هەمان سەرچاوەوەیە، هەر بۆیە) کاتێك بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە (خۆیان پێناگیرێت) خێرا سەری ڕێز و نەوازشی بۆ دادەنەوێنن و سوژدە (بۆ نێرەری قورئان دەبەن). دەشڵێن: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارمانە، بەڕاستی بەڵێنی پەروەردگارمان هەر دێتە دی بە سەرخستنی ئیمانداران لە دنیادا و سەرفرازییان لە قیامەتدا. ئەوانە سوژدە و کڕنووش دەبەن و دەگرین و ئەسرینی خۆشەویستیی پەروەردگار لە چاوانیان دەبارێت، فرمێسکی ئیمان و شادی هەڵدەوەرێنن و تا دێت زیاتر ملکەچ و فەرمانبەردار و دڵ پڕ لە ئیمان دەبن)، (الإسراء: ١٠٥–١٠٩)، ئەمەش لە چوارچێوەی بەدرۆخستنەوەی هاوبەشپەیداکەران دێت بە کۆتا پەیام، بۆ ئەوەی شوێنکەوتنی ئەوەی زانستی پێ دراوە لە ئەهلی کیتاب ببێتە بەڵگەی ڕاستێتیی ئەو پەیامە و وەڵامێکیش بێت بۆ هەڵوێستی هاوبەشپەیداکەرە بەدرۆخەرەوەکان.

٢. چەند نموونەیەکی لە بەدرۆخستنەوەی جولەکە و گاورەکان بۆ کۆتا پەیام: ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی دەفەرموێت: (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ)، (واتە: بیریان

بخەرەوە، کاتێك عیسای کوڕی مەریەم بە نەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستیی تەوراتیش دەسەلمێنم کە لە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی –ئەحمەد–ە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواوو موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە)، (الصف: ٦)، کە چەند خاڵێك ڕووندەکاتەووە، دیارترینیان:

أ. ئەوە گەواهیدانێکە لە پێغەمبەرێکی نێرراوەوە بۆ بەنو ئیسرائیل – ئەویش (عیسا)یە سەلامی خوای لەسەر بێت– لە چوارچێوەی ڕوونکردنەوەی ئەرکی پەیامدارێتیی خۆی کە بریتی بوو لە دوو خاڵ: یەکەم: بە ڕاستدانانی ئەوەی کە موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە لایەن پەروەردگاریەوە هێناویەتی. دووەمیش: مژدەدان بە کۆتا پێغەمبەر، سەڵات و سەلام لەسەر هەموویان.

ب. ئامۆژگارییەکە لە پێغەمبەرێکی نێرراوەوە بە شوێنکەوتنی کۆتا پێغەمبەر لە چوارچێوەی ڕوونکردنەوەی ویستی شەرعیی خوای گەورەدا، و ئەو واتایەی کە لەخۆی دەگرێت سەبارەت بە گۆڕینی بەنو ئیسرائیل لە پەیامێکی ئومەمییەوە- کە گوتاری خۆی ئاراستەی ئەوان –نەك خەڵکی تر– دەکات، بۆ پەیامێکی جیهانی، کە گوتاری خۆی ئاراستەی هەموو جیهان دەکات.

ج. کارەکە تەنها بە گەواهیدان و ئامۆژگاریکردنی عیساوە نەوەستا، بەڵکو کۆتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای هێنا، کە بریتی بوو لە قورئانی پیرۆز.

د. تۆمەتی بێباوەڕان بەرامبەر هەڵگری کۆتا پەیام بەوەی کە جادووی ڕوون و ئاشکرای کردووە، زیادەڕۆییەك بوو لە سووربوون لەسەر بێباوەڕی، ئەوان بێباوەڕ بوون بە: گەواهیدان و ئامۆژگارییەکەی عیسا (سەلامی خوای

لەسەر بێت) و بێباوەڕبوون بە بەڵگە ڕوونەکان، ئەمەش واتای پاشەکشەیان بوو لە باوەڕهێنان بە: کۆتا پەیام و ڕێبازە ڕوونەکەی و پەیامی عیسا، کە گەواهیدان و ئامۆژگارییەکەی وەك بەشێك لە ئەرکی پێغەمبەرایەتییەکەی هات.

**دووەم:** چەند نموونەیەك لە بەدرۆخستنەوەی هاوبەشپەیداکەران: لەوانە ئەوەیە کە لەم ئایەتە پیرۆزانەدا هاتووە: (تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا * الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الملْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا * وَاتخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلا يَمْلِكُونَ لأنْفُسِهِمْ ضَرًّا وَلا نَفْعًا وَلا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلا حَيَاةً وَلا نُشُورًا * وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا * وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً*قُلْ أَنْزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيماً * وَقَالُوا مَا لِهَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ لَولا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا * أَوْ يُلْقَى إِلَيْهِ كَنْزٌ أَوْ تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا وَقَالَ الظَّالِمونَ إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلا رَجُلاً مَّسْحُورًا * انْظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلا*تَبَارَكَ الَّذِي إِنْ شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّنْ ذَلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ وَيجعَلْ لَكَ قُصُورًا * بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمنْ كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا)، (واتە: بەرز و پیرۆز و پاك و بڵندە ئەو زاتەی کە قورئانی دابەزاندووە، تا ببێتە جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاست، بۆ سەر بەندەی خۆی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) تا ببێتە هۆشیارکەرەوە و بێدارکەرەوەی دانیشتوانی جیهان لە هەموو سەردەمێکدا. ئەو زاتەی کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی موڵکی ئەوەو هەر ئەو خاوەنیانە، کەسیشی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و کەسی نەکردووە بە شەریك و هاوبەش لە مەودای موڵك و دەسەڵاتیدا، هەموو شتێکی دروستکردووە بە ئەندازە و قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەمە جۆر... هتد، نەخشەی ڕێکوپێکی بۆ هەموو شتێك

داناوە (بە شێوەیەك كە پێویستییەكانی ئادەمیزاد دابین بكەن و لە خزمەتیدا بن. كەچی هاوەڵگەران لەجیاتی ئەو زاتە، شتانێكی تریان كردووە بە خوای خۆیان كە هیچ دروست ناكەن و هیچیان پی بەدی ناهێنرێت، بەڵكو خۆیان دروست دەكرێن، (تەنانەت) ناتوانن سوودێك یان زەرەرێك بە خۆیان بگەیەنن، هەروەها نە مردنیان بە دەستە، نە ژیان، نە زیندووكردنەوە. ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتوویانە: ئەم قورئانە درۆیەك نەبێت كە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) خۆی هەڵیبەستووە، شتێكی تر نییە، كەسانی تریش یارمەتیان داوە، بە ڕاستی ئەوانە (بەو گوفتارەیان) ستەم و بوختانێكی گەورە دەكەن و قسەیەكی ناڕەوایان كردووە. هەروەها وتوویانە: ئەم قورئانە داستانی پێشینەكانەو داوای نووسینەوەیانی كردووە، بەیانیان و ئێواران بەسەریدا دەیخویننەوە! ! تۆ ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بڵێ: ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە، بە هەموو نهێنیەك دەزانێت لە ئاسمانەكان و زەویدا، هەر ئەویش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو و میهرەبانە. ئەوانەی بێ باوەڕن دەڵێن: ئەم پێغەمبەرە چییەتی، خواردن دەخوات و بە بازاڕدا دەڕوات و دەگەڕێت، دەبوایە فریشتەیەك بۆ لای دابەزییایە! ! تا ئەویش لەگەڵیدا خەڵكی بێداربكاتەوە و (لە سەرەنجامی سەرپێچی) بیانترسێنێت! !. یاخود گەنجینەیەكی لە ئاسمانەوە بۆ فڕێ بدرایە، یاخود باخ و باخات و بێستانێكی تایبەتی ببوایە و لێی بخواردایە، بەڵكو ستەمكاران دەڵێن بە ئیمانداران: ئێوە تەنها شوێن پیاوێكی جادوولێكراو نەبێت، شوێن كەسی تر نەكەوتوون؟! تەماشاكە و سەرنج بدە (لەو نەفامانە) چۆن نموونە و بیانووت بۆ هێنایتەوە، ئەوانە گومڕا بوون و ڕێگەیەك نادۆزنەوە بۆ سەرزەنشت كردنت، یاخود بۆ ڕزگاری و ئاسوودەیی دنیا و قیامەت. (لە حاڵەتێكدا) ئەو زاتە مەزن و پیرۆزە، زاتێكە كە ئەگەر بیەوێت زۆر لەوەی كە خوانەناسان باسی دەكەن چاكتر پێ دەبەخشێت.. باخ و باخاتی (جوان و

ڕازاوەت هەر لە دنیادا بۆ دەڕەخسێنێت) کە چەندین ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هەروەها کۆشك و تەلاری بەرز و بڵندت پێ دەبەخشێت. نەخێر، (ڕەخنەکانیان بەجێ نییە)، ئەگینا ئەوان بڕوایان هەر بە قیامەت نییە، ئێمەش ئاگری بڵێسەدارمان بۆ ئەو کەسانە ئامادە کردووە کە بڕوایان بە قیامەت نییە)، (الفرقان: ١–١١)، لەم ئایەتانەدا ئاماژەی بۆ ئەم چەند مەسەلەیە تێدایە:

١ـ جەختکردنەوە لە جیهانێتیی پەیامی موحەممەدی و وابەستەبوونی بە ویستی خوای بەرز و بڵندەوە، بەوەی کە بەرەکەتی خۆی لە چواچێوەی ڕێبازی پەیامی جیهانیدا دابەزێنێت، کە قورئانی پیرۆزە، هەروەها دابەزاندنەکەی (بۆ سەر) بەندەی خۆی جەخت لە ویستی خوای گەورە دەکاتەوە لەو هەڵبژاردنەیدا بە بەڵگەی پیتی (جرّ) کە (على)یە و جەخت لە ویستی بڵندیی لە گەیشتنەکەی دەکاتەوە، هەرچی وەسفکردنی موحەممەدە بە "بەندەیی–العبديّة"، ئەوا جەخت لە جیاکردنەوە دەکات لە نێوان دابەزینی قورئان و لە نێوان ویستی پێغەمبەر تێیدا، چونکە ئەو تەنها بەندەیەکە و هیچ ویستێکی خوایەتی و پەرستراوێتیی نییە، هەروەك چۆن جەخت لە پەیوەندیی ئەو بە پەروەردگارەکەیەوە دەکاتەوە وەك بەندەیەکی ئەو، ئەوەی کە ئەو بەندەیەکە وابەستەی ویستی پەروەردگارەکەیەتی و لێی لانادات.

٢ـ جەختکردنەوە لە سیفەتی خوایەتی و پەرستراوێتی (الإله)، خاوەن پایەی بەرز و بڵند، کردەوەکانی پەروەردگارێتی (الربوبية)، وەك جەختکردنەوەیەك لەسەر مەزنیی ئەوەی کە دابەزێنراوە (کە قورئانە)، کە لە مەزنیی دابەزێنەرەکەیەوە هاتووە (کە خوای گەورەیە).

٣ـ مافی پەرستن تەنها بۆ خوای تاك و تەنها دەبێت، خاوەنی ڕاستەقینەی موڵك، بەدیهێنەر و ئەندازەکێش، کە هیچ هاوبەشێکی نییە لەم مەسەلانەدا، کەواتە هیچ هاوبەشێکی نییە کە شیاوی پەرستن بێت، بەڵام هاوبەشپەیداکەران

ئەم سنوورەیان بەزاند، ئەویش بە پەرستنی شتگەلێك كە نە سوود و نە زیان و نە ژیان و نە زیندووكردنەوە و لێپرسینەوەیان بە دەستە.

٤ـ وەسفكردنی كۆتا پەیامی جیهانی بە هەڵبەستن (الافتراء) لە لایەن بێباوەڕانەوە، كە ستەمێكی تەواو و درۆیەكە لە لایەن ئەوانەوە دەكرێت و زۆر لە ڕاستییەوە دوورە، ستەمێكە كە دادگەری ناناسێت، جگە لەمە وەسفكردنی ئەوان بۆ دابەزێنراو (قورئان) بە ئەفسانە.

٥ـ جەختكرایەوە لە حەقیقەتی ئەوەی كە دابەزێنراو (قورئان) بە ڕاستی وەك ڕەحمەت و لێخۆشبوون هاتووە لە جیهانی پەنهانەوە لە ئاسمانەكان و زەویدا.

٦ـ پاشان گومانی بێباوەڕان بە كەسی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت): مرۆڤبوونی، موعجیزە داراییەكانی وەك دابەزینی گەنجینەكان بۆی، دواتر بە جادوو تۆمەتباریان كردووە.

٧ـ وەڵامی خوای گەورە هات بە یادخستنەوە بەوەی كە لە بەهەشتدا و لە ناز و نیعمەتەكانی دەیبێت، كە زۆر بەرز و باشترە لە ناز و نیعمەتی دونیای تیاچوو.

## باسی سێیەم:
## بنچینەکانی بنیاتنانی ستراتیژییەتی وەڵامدانەوەی نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان

مەبەست لەم باسە هەوڵدانێکە بۆ هەڵوێستەکردن لەسەر بنچینەکانی هزر، کە توانای بنیاتنانی ستراتیژییەتێکی هزرییان هەبێت، کە بتوانرێت بە (ئیسلامی) وەسف بکرێت بۆ وەڵامدانەوەی ئەوەی ڕۆژهەڵاتناسەکان، یان کەسانی ناحەزی تر دژ بە ئیسلام دەیڵێن، کەواتە باسەکە لە سەرچاوەکانی ئیسلام و نیگاوە دوور نابێت، بە تایبەت قورئان و سوننەت.

لەبەر ئەوەی ئیسلام چەند شتێك لەخۆدەگرێت، –ئایین بەو وەسفەی سیستمێکی کۆمەڵایەتیی تەواوکارە، سەرچاوە بەو وەسفەی دابەزێنەری ڕێبازی ئیسلام و وێستگەی دابەزێنراوە (کە قورئانە)، هەروەها پەیامەکە کە قورئانی پیرۆزە بەو وەسفەی کرۆکی ڕێبازی ئیسلامە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەو وەسفەی کە هەڵگری پەیامەکە و ڕاگەیەنەری و نموونە و پێشەوای بێت، ئوممەتیش بەو وەسفەی کە ژینگەی مرۆیی دابەزاندنە– ئەوا پێویستە لە سۆنگەی خودی گوتاری قورئانی و سوننەتەوە توێژینەوەی لەسەر بکرێت، بۆ دیاریکردنی مەسەلە گرنگیپێدراوەکان بۆ توێژینەوە و دەرخستنی ئەو تەوەرانەی کە لە نێو ئەو مەسەلانەدا پێویستە زیاتر گرنگییان پێ بدرێت، لەو کاتانەدا کە گفتوگۆ لەسەر ئەو باسانە دەکرێت کە سەبارەت بە ئیسلام دەوروژێنرێن لەلایەن ڕەخنەگرانەوە لە ڕۆژهەڵاتناسان و کەسانی تریش، بە شێوەیەك کە هاوسەنگی ڕابگرێت بەپێی ڕێبازی یەکتاپەرستی، بۆ ئەوەی گفتوگۆ و وەڵامدانەوەکان دوور بن لە ئەگەری لادان لە ڕاستەڕێی ڕێبازی یەکتاپەرستی، پەلکێش نەکرێن بەرەو جەدەلێکی نەزۆکی بێ سوود، کە لە چوارچێوەی کار و کاردانەوەیەکدا

بخولێتەوە، کە لەسەر ڕێنمایی خوایی بنیات نەنرا بێت، لە دوو تەوەردا لەم باسە دەدوێین:

## تەوەری یەکەم:

## پلە و پایەی ئیسلام و ناواخنەکانی بەپێی گوتاری قورئان و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)

مەبەست پێی ناسینی ئیسلامە بەپێی گوتاری قورئانی و گوتاری پێغەمبەری، لە چوارچێوەی وەسفکردنی ئەو ناسینە و ڕوونکردنەوەی ئەرکەکەی، ئەوەی پەیوەستە پێوەی، بە شێوەیەك کە حەقیقەتەکانی ڕوون بکاتەوە و لەبەرامبەریشدا حەقیقەتی ئەو شتانە ڕوون بکاتەوە کە لەسەری دەوترێت، وەسفی دووری و نزیکییان لە حەقیقەتەوە بکات، جا لە دەرەنجامی لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بێت، یاخود لە غەیری ئەوان.

**یەکەم:** ئیسلام لە گوتاری قورئان و سوننەتدا:

ئیسلام، ئایینی خوای بەرز و بڵندە کە پێی ڕازی بووە بۆ بەندەکانی، بەپێی ئەم خاڵانەی کە دێن دەتوانین هەڵوێستەیەك لەسەر ئیسلام و سیفات و ئەرکەکانی بکەین:

١. ئیسلام بەو وەسفەی گوزارشتە لە ڕێکوپێکیی بزاوتی بوونەوەر، لە چوارچێوەی ملکەچبوون بۆ ڕاگری و سەرپەرشتیارێتیی خوا بۆ بوونەوەر، هێز و توانای بەسەر بەندەکانیدا، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ)، (واتە: ئایا ئەواه بێجگە لە ئایینی خوا ئایینێکی تریان دەوێت؟! لەکاتێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بە ڕەزامەندی بێت یان بە ناچاریی تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارن، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە)، (آل عمران: ٨٣)، بۆیە

تەسبیحات و ستایشی خەڵکی بۆ خوای بەرز و بڵند، ئەو خوایەی کە فیترەتی ئەوانی لەسەر ئەو ئایینە ڕام هێناوە کە پێی ڕازییە، تەسبیحات و ستایشێکە کە ڕێك و هاوشێوەیە بۆ ئەو تەسبیحات و ستایشە فیترییەی کە بوونەوەر بۆ پەروەردگارەکەی دەیکات، ئەو پەروەردگارەی کە بەدییهێناوە.

٢. ئیسلام بەو وەسفەی ئایینی خوای گەورەیە، کە بریتییە لە پەیوەندیی بەندەکان — لە مرۆڤ لەسەر زەوی— بە پەروەردگاریانەوە، کە ئەو ئایینە شێوازی ئەو پەیوەندییە دیاریی دەکات و ڕێکی دەخات، ئایینیش دەکات بە یەك ئایین لە نێو خەڵکیدا، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّه الإِسْلامُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ إِلاَّ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ العِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَمَن يَّكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّه فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الحِسَابِ)، (واتە: بەڕاستی دین و ئایینی پەسەند لای خوا تەنها ئایینی ئیسلامە، ئەوانەش کە کتێبە (ئاسمانییەکانیان) دراوەتیٚ، جیاوازییان لە نێواندا پەیدا نەبووە مەگەر لە دوای ئەوەی زانست و زانیاریی تەواویان بۆ هاتووە (دەربارەی ڕاستیی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و ئیسلام)، ئەمەش بەهۆی دنیاپەرستی و حەسوودی و ستەم کردنیان لە نێو خۆیان (چونکە ڕازی نەبوون بە پێغەمبەرێك لە غەیری خۆیان)، جا ئەوەی باوەڕی بە فەرمان و ئایەتەکانی خوا نەبێت، ئەوە بێگومان خوا بەخێرایی حیسابی خۆی دەکات لەگەڵیاندا (هەر زوو بە دۆزەخیان دەگەیەنێت)، (آل عمران:١٩)، وە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (شَرَعَ لَكُمْ مِن الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا والَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ومَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ ومُوسَى وعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ ولا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى المُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيهِ مَن يَشَاءُ ويَهْدِي إِلَيهِ مَن يُنِيبُ)، (واتە: ڕێبازی ئایین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، ئەوەی کە فەرمانی پێکردووە بە — نوح—، هەر بەوشێوەیە قورئانیشی بۆ تۆ ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) وەحی و نیگا کردووە و بە ئیبراهیم و موسا و عیساشمان ڕاگەیاندووە کە ڕێبازی

ئایین و یەکخواناسی بەرنەدەن و لەسەری پایەدار بن، ئەم بانگەوازە ڕاست و دروستە زۆر بەلای بتپەرست و خوانەناسانەوە گران و زەحمەتە، بەڵام خوای دانا خۆی کەسانی شایستە هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی ئایینەکەی ڕێنموویی خەڵکانێك دەکات کە بگەڕێنەوە بۆ لای بەرنامەکەی بە پەرستن و ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاك)، (الشوری: ١٣)، قورتوبی دەفەرموێت: (أن أقیموا الدین) بریتییە لە یەکتاپەرستیی خوای گەورە و گوێڕایەڵیکردنی، باوەڕهێنان بە پێغەمبەرانی، پەڕاوەکانی، بە ڕۆژی پاداشت، بە هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ بە ئەنجامدانی دەبێتە موسڵمان، مەبەستی لە شەریعەتەکان نەبووە، کە بریتییە لە بەرژەوەندیی نەتەوەکان لەسەر باشترین بارەکانی، چونکە ئەو شەریعەتانە جیاوازن، خوای گەورە دەفەرموێت: (لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجا)، (واتە: بۆ هەرلایەکتان (موسڵمانان و خاوەنانی کتێب) بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوە)، [٧٧]، (المائدة: ٤٨)، کەواتە ئایینەکە بریتییە لە ئیسلام، کە بریتییە لەو ئینتیمایەی کە جەخت دەکاتەوە لە: بەرپاکردنی یەکتاپەرستی و وازهێنان لە هاوبەش پەیداکردن، یەکڕیزی و تەبایی لەسەر یەکتاپەرستی و وازهێنان لە دووبەرەکی و جیاوازی، هەڵبژاردنی پێغەمبەران و نێرراوەکان بەپێی ویستی خوای گەورە، بەدیهێنانی ڕێنمووی و هیدایەت بۆ خەڵکی بەهۆی پێغەمبەران و نێرراوەکانەوە بەپێی ویستی خوای گەورە. [٧٨]

ئایینی (ئیبراهیم)یش درێژبووەتەوە بۆ ئیسلامی ئیبراهیم، هەرکەسێکیش ڕووی تێ بکات ئەوا هاتووەتە نێو ئیسلامەوە، هەرکەسێکیش پشتی تێ هەڵ بکات ئەوا لێی جیابووەتەوە، لە گێلی و نەفامیی خۆیەوە و بەکەم سەیرکردنی ئەو سزایەی کە دواتر ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بە پێچەوانەی ئەو فیترەتەی کە

---

([٧٧]) تفسير القرطبي، الشورى: ١٣.

([٧٨]) ينظر: تفسير البغوي، الشورى: ١٣.

وەڵامی ویستی شەرعیی خوای گەورە دەداتەوە، نموونەی فیترەتپاکیش ئەوەیە کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت)ی لەسەر بووە، تەنانەت پێش موسڵمانبوونیشی، چونکە ناسینی ئەو بۆ نیعمەتەکانی خوای گەورە، لە ڕێگەی نیشانەکانی پەروەردگاریێتی (الربوبیة) خۆی بۆ خۆی هاتنە نێو ئیسلامەوە بوو، پێش ئەوەی نیشانەکانی پەرستراوێتیی (الألوهیة) بە نیگا بۆ بێت، لەبەرئەوە ئیسلامەکەی بەپێی ئەم دوو ئایەتە بۆ پەروەردگاری جیهانیان بوو، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَن يَّرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ * إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ العَالَمِينَ)، (واتە: ئایا کێ لە ئایینی ئیبراهیم پشت هەڵ دەکات، جگە لەو کەسەی کە خۆی گێل و نەفام بکات، سوێندبێت بێگومان ئێمە ئیبراهیممان لەم دنیایەدا هەڵبژاردووە و (کردوومانە بە پێشەوا) بەڕاستی لەو دنیاش لە ڕیزی پیاوچاکاندایە. کاتێك پەروەردگاری پێی وت: ملکەچ و فەرمانبەردار بە، (ئەویش خێرا) وتی: تەسلیمی پەروەردگاری هەموو جیهان بووم (باوەڕی پتەوم پێی هەیە)، (البقرة: ١٣٠-١٣١)، بۆیە جەختکردنەوەی موحەممەدی لەسەر شوێنکەوتنی ئایینی ئیبراهیم هاتووە، کە بریتییە لە ئایینی یەکتاپەرستی، تەسلیمبوون بە خوای گەورەی پەروەردگاری جیهانییان، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ المُشْرِكِينَ)، واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان) بڵێ: بەڕاستی من پەروەردگارم هیدایەت و ڕێنمووی کردووم بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست، ئایینێك کە ڕاگری ژیانی خەڵکە، ئەویش ئایینی ئیبراهیمە کە دوورە لە هەموو لادان و ناڕێکییەکەوە و ئەو هەرگیز لە ڕیزی موشریك و هاوەڵگەراندا نەبووە). (الأنعام: ١٦١).

٣. ئیسلام بەو وەسفەی ئایینێکی موحەممەدییە: لە چوارچێوەی یەکێتیی ئایین و یەکێتیی ویستی شەرعی سەبارەت بە خەڵك، لەوانەی کە کراون بە جێنشین لە زەویدا، ئەویش بە تەسلیمبوون دەبێت بە ویستی شەرعیی خوای گەورە، ئەویش بە باوەڕهێنان بەوەی کە پێغەمبەران هێناویانە دەردەکەوێت، بەبێ جیاوازی لەنێوان هەر یەکێکیاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّيْنُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ)، واتە: (ئەی ئینسان بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە) ڕوو بکەرە بەرنامە و ئایینی خوا و ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆك و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لە هیچ نەخشە و دروستکراوێکی خوادا نییە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستییانە نازانن) (الروم: ٣٠).

ئیسلامیش بەو وەسفەی کۆتایی ئایینەکانە، گوتاری ئاراستەی هەموو خەڵکی کراوە –لە چوارچێوەی جیهانیبوونی گوتارەکەیدا– بە ڕێباز و شەریعەت و ئەو تایبەتمەندییانەیەوە، کە وای لێ دەکات ببێت بە بەشێك لە چوارچێوە گشتییەکەی ئایین، هەروەها ئەو تایبەتمەندییانەی کە دەیکات بە خاوەن تایبەتمەندییەك کە لە هەموو ئایینەکانی تر جیای بکاتەوە، ئەمەش بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (اِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ)، (واتە: بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا حەق و ڕاستی ڕوون بکاتەوە، کەواتە هەر خوا بپەرستە و هەر ملکەچ و دڵسۆزبە بۆ ئایین و بەرنامەکەی)، (الزمر: ٢)، کە جەختی لەوە دەکاتەوە کە دینداریێتی بە ناردنی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت)،

دابەزینی پەڕاو نابێت بۆ سەری، گەر بەپێی ئەحکامە شەرعییەکان و ڕەچاوکردنی هەموو ئەو شتانە نەبێت کە تێیدا هاتووە.

بەڵام ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالهُدَى وَدِينِ الحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ المُشْرِكُونَ)، (واتە: هەر ئەو زاتە بۆیە پێغەمبەرە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئایینی ڕاست و دروستدا ڕەوانە کردووە، تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامە و ئایینەکانی تردا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵگەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن)، (التوبة: ٣٣)، ئەو ئایەتە جەخت لە ویستی خوای گەورە دەکاتەوە لەسەر ئیسلامی موحەممەدیی کە ببێتە کۆتایی ئایینەکان، سەرکەوێت بەسەر هەموویاندا، ئەمەش وا دەکات کە ئایین و ئاینداریێتی تەنها لە کۆتا ئایندا کورت هەڵبێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَمَن يَّبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُّقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الخَاسِرِينَ)، (واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئایینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئایینێکی تر بکات، لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە)، (آل عمران: ٨٥)، ئەمەش دەرگای گفتوگۆکردن لەسەر ئەو شێواندنە دەکاتەوە کە تووشی ئایینەکانی تر هاتووە، کە وای لێدەکات لە چوارچێوەی ئاینداری دەری دەکات، کە بە ئیسلام وەسف بکرێت، بەمەش ئیسلام دەبێتە گوزارشتێك لە دروستی و تەندروستی و ڕێکوپێکی لە ئایین و ئاینداری، ئەمەش ئەوەی لەم فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە ڕاڤەی دەکات: (...الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأنّ محمّداً رسول الله وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلاً).[٧٩] (واتە: ... ئیسلام ئەوەیە کە شایەتی بدەیت لەسەر ئەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق تەنها زاتی الله نەبێت و موحەممەد پێغەمبەری خودایە

---

([٧٩]) صحيح مسلم، مصدر سابق، باب: معرفة الإيمان، ج١، مجلد ١، ص ٢٨، رقم الحديث: ١٠٢.

و نوێژ ئەنجام بدەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت و ئەگەر توانیت حەجی ماڵی خوا بکەیت).

**سێیەم:** قورئانی پیرۆز بەپێی گوتاری قورئانی:

١. قورئانی پیرۆز لەلایەن خوای گەورە دابەزێنراوە، ئەمەش ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی دەکاتە: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ القُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الهُدَى وَالفُرْقَانِ...)، (واتە: مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتووەتە خوارەوە، لەکاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموویبەخشە بە خەڵکی و بەڵگەی زۆری تیادایە، لە ڕێنموویی و جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست و حەق و ناحەق...)، (البقرة: ١٨٥)، لەم ئایەتەدا بەڵگەیەکی ئاشکرا هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە دابەزێنراوە و سەرچاوەکەی بەرزی و بڵندییە، چونکە سەرچاوەی قورئانی پیرۆز خوای بەرز و بڵندە.

٢. لەم ئایەتەی تریشدا کە دەفەرموێت: (فَتَعَالَى اللَّهُ المَلِكُ الحَقُّ وَلا تَعْجَلْ بِالقُرْآنِ مِنْ قَبْلِ أَن يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا)، (واتە: بەڕاستی هەر من (الله)م، من خوام، هیچ خوایەك نییە جگە لە من، کەواتە هەر من بپەرستە و نوێژەکانیشت بە چاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لە یاد بێت)، (طه: ١١٤)، جەختکردنەوەیەك لەسەر ئەوە هەیە کە قورئان نیگایەکە لەلایەن خوای زاناوە، ئەو قورئانە سەرچاوەی زانستی ڕاستە، هەر کەسێك لەوانەی گوتاری قورئانیان ئاراستە کراوە بیانەوێت لە سەرچاوەکەی هەڵدەگۆڕن.

بەڵگەیەکی تریش هەیە لەسەر ئەوەی کە دابەزینی قورئان پەیوەستە بە خوای بەرز و تەنهاوە، گوزاشتە لە ویستی ئیلاهیی بڵند، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ)، (واتە: کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمە کە ڕوون و

ئاشکرایە، بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئەوانەی کە بەتەما نین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە ببن، دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بهێنە و بیخوێنەرەوە، یان بیگۆڕە (بەشێوەیەکی تر)، تۆیش ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: من بۆم نییە لەخۆمەوە ئەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێك ناکەوم جگە ئەوە نەبێت کە بەوەحی پێم دەگات، بەڕاستی من دەترسم ئەگەر یاخی بم لە پەروەردگارم و نافەرمانی بکەم گیرۆدەی سزایەکی سەختی ڕۆژێکی زۆر گەورە ببم)، (یونس: ١٥)، قورئان گوزارشتە لە ویستی خوای گەورە لەسەر دابەزاندنی و هەروەها لەسەر ناوەڕۆکە ڕاگەیانگوزارەکەی، ئەو قورئانە گوتارێکی ئیلاهیی جێگیرە لە ناوەڕۆکەکەیدا، نوێگەرە لە گشتگیرییەکەیدا، بەمەش شوێنکەوتنی نیگاکەی دەبێتە گوێڕایەڵی خوای گەورە و وازلێهێنان و دوورکەوتنەوەش لێی دەبێتە سەرپێچی بۆی.

٢. قورئان ناوەڕۆکی ڕێبازێکی یەکتاپەرستیی زانستییە: بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە:

(... وَلا تَعْجَلْ بِالقُرْآنِ مِنْ قَبْلِ أَن يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا)، (واتە:... خوای گەورە زۆر پایەبەرز و بڵندە و پاشای بە حەق و ڕاستەقینەیە، (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) نەکەیت لە خوێندنی قورئاندا پەلە بکەیت: لە پێش ئەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ (چونکە ئێمە نایەڵین فەرامۆشی بکەیت) نزا بکە و بشڵێ: پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرتر و زیاترم پێ ببەخشە)، (طه: ١١٤)، کار و ئەرکی بەدیهێنانی هیدایەت لە خەڵکدا، هەر بەم کار و ئەرکەش وتەکانی بە چاك و جوان وەسف کراون لە چوارچێوەی بەراوردکردنی بە هەر ڕێبازێکی غەیری خۆی، ویستراوە ئەم قورئانە ببێتە سەرچاوەی هیدایەتدانی خەڵکی، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ

يَخْشَونَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وُ قُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ)، (واتە: خوا جل جلاله جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردووەتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی دارِشتندا) بابەتەکانی لە یەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارەبووەتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەو کەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەروونندا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی، ئا ئەوە هیدایەت و ڕێنموویی خوایە کە هەر کەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموویی دەکات بۆ ئەو پلەو پایە بەرزانە، ئەوەش کە ڕێبازی خوا ون بکات کەس نییە ڕێنموویی بکات)، (الزمر: ٢٣)، هەرکەسێکیش سوود لە زانستی قورئان وەربگرێت لە ڕێگەی بەدیهاتنی تەزکیە و پاکی بە هیدایەت، ئەوا بە باڵا وەسف دەکرێت، لە نزمیی دەروونەوە بۆ بڵندیی فیترەت، بە شێوەیەك کە بتوانرێت بە پاکی وەسف بکرێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (لا يَمَسُّهُ إِلاَّ المُطَهَّرُونَ)، (واتە: تەنها پاکان نەبێت کەس دەستی لێ نادات)، (الواقعة: ٧٩).

٣. لە تایبەتمەندییەکانی قورئانی پیرۆز:

أـ گونجانی زمانی قورئان بۆ بارودۆخی دابەزینەکەی، عەرەبیبوونەکەشی بەشێکە لە ئیعجاز، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًا لقَالُوا لَوْلا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ أَاعْجَمِيٌ وعَرَبِيٌ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ والَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وهُوَ عَلَيْهِم عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَكَانٍ بَعِيدٍ)، (واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان بە زمانی گەلانی تر بناردایە، ئەوە بێ باوەڕان دەیانوت: ئایا نەدەبوو ئایەتەکانی ڕوون و ئاشکرا بوایە و زمانی خۆمان بوایە، چۆن دەبێت قورئان بە زمانی بێگانە بێت؟ لە کاتێکدا موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بە عەرەبی دەدوێت؟! ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئەم

قورئانە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، هیدایەت و ڕێنموویی و شیفایە و چارەسەری هەموو دەرد و نەخۆشییەکان دەکات، جا ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن گوێچکەیان کەڕە و بە شتی تر ئاخنراوە، هەروەها کوێرن لە ئاستیدا، ئەوانە هەروەك لە دوورەوە بانگیان لیٚ بکرێت وایە (نە دەنگەکە بە چاکی دەبیسن، نە ڕەنگەکە بە ڕوونی دەبینن)، (فصلت: ٤٤)، هەروەها جەخت لە سوننەتی خوا دەکاتەوە لە دابەزاندنی پەڕاوەکان بە زمانی ئەو خەڵکانەی کە ئەو پێغەمبەرانەیان لە نێودا نێرراوە، عەرەبیبوونی قورئان لەگەڵ زمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) گونجاوە، هەردوو شتەکەش: عەرەبیبوونی قورئان و عەرەببوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەستراون بە ویستی خواوە، کە هۆکاری تریشی هەیە.

ب ـ قورئان بێتواناکەر یان دەستەوسانکەری بەدیهێنراوەکانی خوایە لەوەی کە بتوانن وێنەی ئەو بهێنن: بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ وَالجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا القُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا)، (واتە: ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵیٚ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و پەرییەکان کۆببنەوە و (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وا بکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببن بە پشتگیر و یارمەتیدەری یەکتر.)، (الإسراء: ٨٨)، ئەمەش ئەو کەسانە دەستەوسان دەکات کە ڕەخنەی لیٚ دەگرن، لە چوارچێوەی بانگهێشتکردنیان بۆ هێنانی وێنەی ئەو قورئانە، یان تەنانەت وێنەی هەندێکی بهێنن، لە لەفزی و واتاکانی و دەلالەتە بەیانییەکانیدا، تەنانەت لە مەبەست و شوێنەواری شوێنکەوتن و حیکمەتەکانیدا.

ج ـ قورئان ماددەی بانگەوازی جیهانیی و ڕێبازەکەیەتی، ئەو قورئانە هێندەی تێدایە لە پێداویستی و پابەندکردن کە بەس بێت بۆ هەڵسوڕاندنی،

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنمَّا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ المُنْذِرِينَ)، واتە: (فەرمانیشـم) پێدراوە کە: قورئان دەور بکەمەوە و بەردەوام بیخوێنمەوە، جا ئەوەی ڕێبازی هیدایەت وەربگرێت، ئەوە بەڕاستی قازانجی وەرگرتنی ڕێنموماییەکەی هەر بۆ خۆیەتی (لە دنیاو قیامەتدا سوودی لێوەردەگرێت)، ئەوەش کە گومڕا دەبێت، تۆ پێی بڵێ: (من زۆرم لە سەرتان نییە) بێگومان من تەنها یەکێکم لە بێدار کەرەوەکان)، (النمل: ٩٢)، بانگەشەش بۆ داڕشتنی ڕێبازەکەی پێویستی بە عەقڵ نییە بە بوونی دەقی قورئانی.

٤. لە تایبەتمەندییەکانی قورئان بەسبوونیەتی بۆ بەدیهێنانی ڕێنموویی بۆ نەوەی ئادەم:

أـ ئەم ئایەتە پیرۆزە: (طس تِلْكَ آيَاتُ الْقُرْآنِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ)، (واتە: طس، ئەوە ئایەتەکانی ئەم قورئانەن و فەرمانی کتێبێکی پیرۆز و ئاشکرا و ڕوونە)، (النمل:١)، ئاشکراکردنێکە بۆ ڕێبازی قورئان بەو وەسفەی ئاشکرا و ڕوونە، بە شێوەیەك کە مرۆڤ دەتوانێت ئەوەی تێیدایە بە ئاسانی وەری بگرێت.

ب ـ قورئانی پیرۆز ئەو شتانە دەگرێتەخۆ کە خەڵکی لە مەبەستی خوای گەورە لە دابەزاندنی تێدەگەیەنێت، هەروەها داوای خوای گەورە لەوان لە کاتی شوێنکەوتنیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ الإِنْسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلا)، (واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو جۆرە نموونەیەکمان هێناوەتەوە بۆ خەڵکی (تا پەند و ئامۆژگاریی لێ وەربگرن) لە کاتێکدا ئینسان لە هەموو شتێك زیاتر موجادەلە دەکات و لە شت دەکۆڵێتەوە)، (الكهف: ٥٤)، بۆیە لە قورئاندا ئەوە هەیە کە تێگەیشتنی حەقیقەتی ژیان و پێگەی یەکتاپەرستی تێیدا بۆ خەڵکی دەهێنێتە دی.

ج ـ له قورئانی پیرۆزدا به تێروتەسەلی بەشی تێگەیشتنی خەڵك هاتووە بۆ تێگەیشتن لە ناوەرۆکی بانگەواز و ڕێبازەکەی کە یەکتاپەرستییە، بەڕاستی ئایەت و بەڵگە ئیعجازییەکانی قورئانی پیرۆز باڵاترن لەو ئایەت و بەڵگانەی کە بۆ نەتەوەکانی پێشوو هاتوون، لە ڕووی حەقیقەتەکەی و ئەوەشی کە تێیدایە، هەروەها لە ڕووی بەردەوامبوونی وەك بەڵگەیەك کە شوێنەوارەکانی بەسەر خەڵکەوە بەردوامەو ناشارڕێتەوە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (أَوَ لَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِم إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)، (واتە: ئایا بەس نییە بۆیان کە بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆت و بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، بێگومان ئا لەو قورئانەدا ڕەحمەت و یادەوەری ئاشکرا هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمان دەهێنن.)، (العنكبوت: ٥١)، بەپێی ئەوەش کە بەیزاوی هێناویەتی.[٨٠]

ج. قورئان ئەوە لەخۆ دەگرێت کە تێگەیشتنێکی مەنهەجیی جیهانیی بۆ هەموو خەڵك بهێنێتە دی، بۆ نموونە لە دیاردەکانی ڕەحمەتی خوا بەرامبەر خەڵك: هێنانەبوونیانە، لە دیاردەکانی ڕەحمەتیش پاش هێنانەبوون (تاقیکردنەوەیان)ـە، هەروەها لە دیاردەکانی ڕەحمکردن بەوان دوای (تاقیکردنەوە) یان (دابەزاندنی ئەوەی لە قورئاندا هەیە لە زانست)، ڕەحمەتەکە بۆ خەڵکی، بە تاقیکردنەوەیان و هێنانەبوونیان پێش ئەوە بە هاتنەخوارەوەی قورئان تێیاندا و گوتار ئاراستەکردنیان پێی دێتە دی، بە هۆی ئەو ڕێنموویییەی کە تێیدایە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزانە: (الرَّحْمَنُ * عَلَّمَ القُرْءانَ * خَلَقَ الإِنْسَانَ * علَّمَهُ البيان)، (واتە: خوای میهرەبان، کانگای سۆز و ڕەحمەت. قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە (فێربوون و زانینی قورئان و تێگەیشتن لە فەرموودەی خوای میهرەبان، پیرۆزترین ناز و نیعمەتە کە ئیماندار لێی بەهرەوەر ببێت لەم تەمەنە

---

(٨٠) البيضاوي، العنكبوت: ٥١.

کورتەی ژیانی دنیادا. هەر خوا ئادەمیزادی دروست کردووە، هەر ئەویش فێری گوفتار و ئاخاوتنی کردووە)، (الرحمن: ١-٤).

٥. پەیوەندیی قورئان بە هەموو دابەزێنراوەکانەوە:

أ- قورئان پارێزراوە لە شێواندن، ئەمەش وای لیٚ دەکات دوور بێت لە شێواندنی بەیانی و لە شێواندن لە ناوەرۆکەکەیدا، ئەمەش لە پێداویستییەکانی جیهانیبوونی گوتارەکەی و پاراستنێتی لە ناکۆکی: خوای گەورە دەفەرموێت: (أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ القُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافًا كَثِيرًا)، (واتە: ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتییەکی زۆریان تێدا دەدۆزییەوە)، (النساء: ٨٢)، قورئان پارێزراوە لە ناکۆکی، چونکە سەرچاوەکەی (الله)یە، هیچ شتێکی تر نییە پارێزراو بێت لە ناکۆکی لەوانەی کە سەرچاوەکانیان گوتاری تر بێت، هیچ دابەزێنراوێکی تریش لە شێواندن ڕزگاری نەبووە تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی داوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)، (واتە: بەڕاستی ئێمە هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تیٚ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە)، (الحجر: ٩).

ب ـ قورئان تەسدیقی هەموو دابەزێنراوەکانی پێش خۆی دەکات: خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ هَذَا القُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الكِتَابِ لا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ العَالَمِينَ)، (واتە: وەنەبێت ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە داڕێژرا بێت و هەڵبەسترا بێت جگە لە خوا، بەڵکو ڕاستی و ڕەوانیی کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها ڕوونکەرەوەی بیرو باوەڕ و ئەرکەکانە، بەڕاستی هیچ گومان لەوەدا

نییە کە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە ڕەوانەکراوە)، (یونس: ٣٧)، بەمەش تەصدیقەکەی دەبێتە سنوورێکی جیاکەرەوە لە نێوان ئەوەی کە شێوێندراوە و ئەوەی نە شێوێنراوە لە دابەزێنراوەکان، ناوەڕۆکی قورئانیش دەبێتە ناوەڕۆکی پەڕاوە ئاسمانییەکانی پێشوو، لە پەیوەندییەك کە وەك پەیوەندیی بەش وابێت بە گشتەوە، و هاوشێوەی پەیوەندیی جیهانییەکی سنووربڕەوە، بە ئومەمییەك و نەتەوەییەکی سنووربەزێنراو.

ج. قورئان هەژموونی بەسەر هەموو دابەزێنراوەکانی پێش خۆیدا هەیە، بەپێی ئەم ئایەتە: (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الكِتَابَ بِالحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِيمَا آتَاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ)، (واتە: ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستییەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا (کاتێك خاوەنانی کتێب لە گاور و جوو گیروگرفتیان دەهێنن بۆ لای تۆ) بەو بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی داوەریی بکە لە نێوانیانداو شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوەو لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانە کراوە، بۆ هەرلایەکتان (موسڵمانان و خاوەنانی کتێب) بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوە خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هەر هەمووتانی دەکردە یەك ئوممەت و گەلێکی یەك پارچە، بەڵام (ویستی وایە بەو جیاوازییە) تاقیتان بکاتەوە لەوەی پێی بەخشیوون (تا بەهۆی عەقڵ و ژیریتانەوە شوێنی پێغەمبەری ئیسلام بکەون)، دەی کەواتە زۆر بەپەلەبن و پێشبڕکێ بکەن بۆ هەموو خێر و چاکەیەك، دڵنیاش بن کە هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەو کاتە هەواڵی تەواوتان دەداتێ دەربارەی ئەو شتانەی کە کێشەتان لەسەری هەبوو.)، (المائدة: ٤٨)،

قورئان چاودێرە بەسەر گشت پەڕاوەکاندا، دەیانپارێزت لە گۆڕان و گەواهیی دروستی و جێگیریی بۆ دەدات، لە شوێنەوارەکانی هەیمەنەی قورئان: توانای لە گێڕانەوەی ئەوەی لە ڕاستی لایداوە، لەوانەی کە پەڕاوەکانیان شێوێندراوە، بۆ ئەو ڕێبازی یەکتاپەرستییەی کە توانای پاککردنەوەیانی هەیە لەو لادانانەی کە تووشی بیروباوەڕیان بووە، گۆڕینیان بە شێوەیەك کە بیانگێڕێتەوە بۆ ئایینی یەکتاپەرستی، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ)، (واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە زۆربەی زۆری ئەو شتانەی کە نەوەی ئیسرائیل جیاوازی و کێشەیان لەسەری هەیە، باسی دەکات و لێی دەدوێت و ڕوونی دەکاتەوە)، (النمل: ٧٦).

د. قورئان ناوەرۆکی ڕەحمەت و ئاسانکارییە، کە ئەهلی کیتاب تامەزرۆی دابەزینی بوون، چاوەڕێی نێرراوێکی شیاویان کردووە بۆ هەڵگرتنی پەیامەکەی و گەیاندنی، بەپێی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە: (وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ*الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ المُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ المُفْلِحُونَ)، (واتە: داواکارین کە لە دنیادا چاکەمان بۆ پێش بهێنیت و لە قیامەتیشدا، ئێمە بەڕاستی ڕێنموویی کراوین بۆ لای زاتی تۆ، (خوای گەورە لە وەڵامیاندا) فەرمووی: سزا و تۆڵەم تووشی کەسێك دەکەم کە بمەوێت و (شایستە بێت)، ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتووەتەوە، جا لەمەودوا ئەو ڕەحمەت و میهرەبانییەم تۆمار دەکەم و بڕیار دەدەم بۆ ئەو کەسانەی کە تەقواو پارێزکاری دەکەن و زەکات دەدەن و ئەوانیش کە باوەڕی

تەواو بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەهێنن. ئەوانەی کە شوێنی ئەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە (گاور و جوو، ناو و نیشانیان) دەستیان دەکەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بە چاکە و قەدەغەی گوناه و خراپەیان لێدەکات و هەرچییەك پاك و چاكە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەر شانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو، لای دەبات (وەك خۆكۆشتن لە كاتی تەوبەدا... هتد)، جا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە و پشتیوانییان لێکردووە و پشتگیرییان کردووە و شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کە قورئانە) و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانە کراوە، هەر ئەوانە سەرفراز و ڕزگارن)، (الأعراف: ١٥٦-١٥٧).

٦. بەڕاستی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) قورئانی بەوە وەسف کردووە کە: (فيه نبأ من كان قبلكم، وخبر ما بعدكم، وحكم ما بينكم، وهو الفصل ليس بالهزل، من تركه من جبّارٍ قصمه الله، ومن ابتغى الهدى في غيره اضلَّه الله، وهو حبل الله المتين، وهو الذكر الحكيم، وهو الصراط المستقيم، وهو الذي لا تزيغ به الأهواء، ولا الألسن، ولا يشبع منه العلماء، ولا يخلق من كثرة الردِّ، و لاتنقضي عجائبه، هو الذي لم تنته الجنُّ إذ سمعته حتّى قالوا: "إنَّا سمعنا قرآناً عجباً، يهدي إلى الرشد"، من قال به صدق، ومن دعا إليه هدي إلى صراط مستقيم).[٨١] (واتە: هەواڵی ئەوانەی پێش ئێوە و هەواڵی دوای ئێوە و حوکمی نێوانیشتانی تێدایە، هەروەها ئەو قورئانە جیاکەرەوەیە و گاڵتە نییە، هەر خۆبەزلزان و بێ عەقڵێك وازی لێ بهێنێت، خوای پشتی دەشكێنێت، هەر کەسێکیش لە غەیری قورئاندا بەدوای ڕێنموویيدا بگەڕێت، خوا گومڕای دەکات، ئەو پەتی بەهێز و توندوتۆڵی

(٨١) جلال الدين السيوطي، الدرّ المنثور، دار الفكر، بيروت: ١٩٩٣م، ج٦، ط٣٧٦.

خوایە، ئەو زیکری حەکیمە، ئەو ڕاستە ڕێگەیە، ئەو ئەوەیە کە نە ئارەزووەکان و نە زمانەکانی پێ لاڕێ ناچێت و زانایان لێی تێر نابن، چێژ و خۆشییەکەی بە زۆر دووبارەکردنەوەی کۆتایی نایەت و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی تەواو نابن، ئەو ئەوەیە کاتێك کە جنۆکە گوێبیستی بوون خێرا وتیان بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست . هیدایەت دەدات بۆ ڕێبازی ژیری و تێگەیشتن"، هەرکەسێك بەو وتەیە قسە بکات ڕاستی کردووە، هەر کەسێکیش بانگەوازی بۆ بکات ئەوا ڕێنموویی کراوە بۆ ڕێگەی ڕاست).

**سێیەم:** پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە گوتاری قورئانی و گوتاری پێغەمبەریدا: نە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە چوارچێوەی بەندایەتیی بۆ خوای بەرز و بڵند دەرچووە، نە بۆیشی هەبووە لێی دەربچێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ)، (واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: بەڕاستی من فەرمانم پێدراوە هەر خوا بپەرستم و لە هەموو ژیانمدا ملکەچ و فەرمانبەرداری دین و ئایین و بەرنامەی ئەو بم)، (الزمر: ١١). ئەشتوانین لەم خاڵانەی کە دێن بەدواداچوون بۆ ئەو شتانە بکەین کە پێگەی ئەو ڕوون دەکەنەوە:

خوای گەورە فەزڵی داوە بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکانیدا، بەوەی کە لە پەڕاو و حیکمەت و دانایی فێری کردووە، تەزکییە و پاکییەکەشی هەر بەو دووانە بووە بە ویستی خوای گەورە، دەکرێت لەمانەدا ئەمە بەرجەستە بکەین:

أ. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ لَهَمَّت طَّائِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُّضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلاَّ أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِنْ شَيْءٍ وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا)، (واتە: خۆ ئەگەر فەزڵ و ڕەحمەتی خوا نەبوایە بەسەرتەوە، خەریك بوو هەندێکیان سەرت لێ بشێوێنن، بێگومان ئەوان بەو کارەیان هەر سەر لە خۆیان دەشێوێنن،

دڵنیابە کە ناتوانن لە هیچ شتێکدا زیانت پێبگەیەنن، خوای گەورەش قورئان و دانایی بۆ دابەزاندوویت و فێری ئەو شتانەی کردوویت کە جاران نەتدەزانی، بەردەوامیش فەزڵ و ڕێزی خوا لەسەر تۆ (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) زۆر و فراوان و ئاشکرا و دیارە و (نایەڵێت تووشی هەڵە ببیت)، (النساء: ١١٣).

ب ـ زوهری دەڵێت: موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعەم لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) هەواڵی دامێ، وتی: لە پێغەمبەری خوام بیستووە (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "إن لي أسماءً أنا محمد، وأنا أحمد، وأنا الماحي الذي يمحو الله تعالى بي الكفر، وأنا الحاشر الذي يحشر الناس على قدمي، وأنا العاقب الذي ليس بعده نبـي".[٨٢] (واتە: بەڕاستی من چەند ناوێکم هەیە، من (موحەممەد)م، من (ئەحمەد)م، من (ماحی)م ئەوەی کە خوای گەورە بێباوەڕیی پێ لادەبات، من (حاشر)م ئەوەی کە خەڵکی لەسەر دەستی دینەکەم کۆدەکرێنەوە، من (دوایین) پێغەمبەرم ئەوەی کە هیچ پێغەمبەرێك لە دوایەوە نییە).

ج. ئیمامی ئەحمەد لە فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە گێڕاویەتەوە، کە وتوویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) وەك ماڵئاواییکەر هاتە لامان و فەرمووی: (أنا محمّد النبي الأمي، أنا محمّد النبي الأمي، أنا محمّد النبي الأمي، ولا نبي بعدي، أوتيت فواتح الكلم وخواتمه وجوامعه، وعُلِّمتُ كم خزنةُ النار، وحملةُ العرش، وتُجُوِّزَ بي، عوفيتُ وعوفِيَتْ أمتي، فاسمعوا وأطيعوا ما دمت فيكم، فإذا ذُهِبَ بي فعليكم بكتاب الله، أحِلُّوا حلالَه وحرِّموا حرامَه).[٨٣] (واتە: من موحەممەدم پێغەمبەری نەخوێندەوار، من موحەممەدم

---

(٨٢) صحيح مسلم، مصدر سابق، ج٧، مجلد ٤، ص ٨٩، باب في أسمائه عليه الصلاة والسلام، رقم الحديث ٢٥٢٦.

(٨٣) أحمد بن حنبل، مسند أحمد بن حنبل، مؤسسة قرطبة، القاهرة، ج٢، ص٢١٢، رقم الحديث ٦٩٨١.

پێغەمبەری نەخوێندەوار، من موحەممەدم پێغەمبەری نەخوێندەوار، پێغەمبەر لە دوای منەوە نییە، کلیلی وتەکان و کۆتاییەکانی و کۆکەرەوەکانیم پێ دراوە، فێرکراوم کە فریشتەکانی سەر ئاگری دۆزەخ و هەڵگرانی عەرش چەندن، بەهۆی منەوە چاوپۆشی کراوە، لێخۆشبوون من و ئوممەتەکەمی گرتووەتەوە، کەواتە گوێ بگرن و گوێڕایەڵ بن مادام من لە نێوتاندام، ئەگەر من برامەوە بۆ لای خوا ئەوا دەستبگرن بە پەڕاوی خواوە، ئەوەی بە حەڵاڵی داناوە حەڵاڵی بکەن و ئەوەشی بە حەرامی داناوە حەرامی بکەن).

٣ـ ئەو مرۆڤە، لەم ئایەتە پیرۆزەدا جەخت لە مرۆڤبوونی کراوەتەوە: (وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَّنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَن يَّضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ)، (واتە: (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بكات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە)، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟! (لەو دین و ئایینەی کە پێی ڕاگەیاندوون) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بە خوا ناگەیەنێت، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە)، (آل عمران: ١٤٤)، لەمەش ئەمانە هەڵدەهێنجێنرێت:

أ. ئەو لە گرۆی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، کە ئەوان مرۆڤی پیاون، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ)، (واتە: ئێمەش پێش تۆ جگە لە پیاوانی (ڕاستگۆ و چاك و پاك نەبێت) کەسی ترمان ڕەوانە نەکردووە و وەحیمان بۆ نەناردووە، ئەگەر هەر بڕوا ناکەن و نایزانن، دە ئێوە لە شارەزایان بپرسن؟ (کە ڕەوانەکراوانی ئێمە پیاوانێکی ناسراو بوون لەناو قەومەکانیاندا)، (النحل: ٤٣).

ب. ئەو دەمرێت، مردنیش لە تایبەتمەندییەكانی مرۆڤە، لەبەر ئەوەی ئەوان زیندوون، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ)، (واتە: بەڕاستی تۆش دەمریت و ئەوانیش دەمرن و كەس نامێنێت)، (الزمر:٣٠).

ج. ئەو هۆكارەكان دەگرێتە بەر، لەوانەش هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی سەركەوتن.

د. ئەو كوشتار دەكات و دەكوژێت یان دەكوژرێت، ئەوانەش لە تایبەتمەندییەكانی مرۆڤن.

هـ. بەڕاستی مانەوەی یەكتاپەرستی لە نێو خەڵكدا باشتر و خۆشەویستترە لە مانەوەی پێغەمبەران، یان نەمرییان، چونكە پێگەی ئەوان لە پێگەی یەكتاپەرستییەوە لای خەڵك سەرچاوە دەگرێت، چونكە یەكتاپەرستی شتێكە تەنها پەیوەندیی بە خوای بەرز و بڵندەوە هەیە.

٣. لەم ئایەتە پیرۆزەشدا: (مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا)، (واتە: موحەممەد وەنەبێت باوكی هیچ كەس لە پیاوانتان بێت، بەڵكو پێغەمبەری خوایە و دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشە و بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێك زانایە)، (الأحزاب: ٤٠)، چەند شتێك هەیە، دیارترینیان:

أ. پێگەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە زۆریی منداڵە پیاوەكانییەوە نایەت، بەڵكو بەرزی و بڵندییەكەی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە كە ئەو پێغەمبەرێكی نێرراوەو كۆتا پێغەمبەرە.

ب. مەسەلەی كۆتا پێغەمبەرایەتی و كۆتا پەیامی واتە: ئەو باشترینیانە، مرۆڤایەتی هەر لە نێرانییەوە تا هەستانی ڕۆژی دوایی پێویستیان بە پێغەمبەرێكی نێرراو نابێت، چونكە پەیامی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر

بێت) گەیشتووەتە ئاستێکی جیهانی، ئەویش بە جیهانیبوونی ڕێبازی پەیامە بە بەهاکەی.

٤. دەکرێت لە دیارترین لە ئەرکەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەمەمەی خوارەوە کە دێت، کورت بکەینەوە:

أ. بەڕاستی ڕۆڵی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە ویستی بەرزی خوای گەورە بریتییە لە گەیاندنی ئەوەی کە بۆی دابەزیوە بە خەڵکی، بۆ ئەوەی کە باوەڕ بهێنن و کردەوەکانیشیان تەسدیقی بکات، ئەویش بە هەوڵدانی بۆ ڕاگەیاندنی ئەوەی کە بۆی دابەزیوە –کە بە "ڕاستی" وەسف کراوە و فەزڵ لە ڕێنموویيکردنیاندا بۆ خوایە– بە گەڕانەوەیان لەوەی کە لەسەری بوون، خوای گەورە لە تاوان و خراپەکانیان خۆش دەبێت، ئەو تاوانانەی کە پێش ناسینی ئەم ئایینە و باوەڕهێنانیان پێی و کارکردن بەپێی خواستەکانی، ئەنجامیان داوە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ)، (واتە: ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوەو باوەڕیان هێناوە بەو قورئانە کە بۆ محەمەد (صلی الله علیه وسلم) دابەزێنراوە، هەر ئەویش ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارەوە نێردراوە، ئەوانە خوا چاوپۆشیی کردووە لە هەموو گوناهەکانیان، چاکەشی ڕواندووە لە دڵ و دەروونیاندا و بۆچوونیانی ڕێکوپێك کردووە)، (محمد: ٢).

ب. خوای گەورە گێڕاویەتی بەوەی کە منەتی پێکردووە بەسەر باوەڕدارانیدا لە بەندەکانی خۆی، بە ناردنەکەی و بە پەیامەکەی و بە سووربوونیشی، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)، (واتە: سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر

ئیمانداران کاتێك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچووبوون)، (آل عمران: ١٦٤).

ج. ئەو دەرهێنەری خەڵکییە لە تاریکییەکانەوە بۆ ڕووناکی، بەو پەڕاوەی کە خوای بەرز و بڵند بۆی دابەزاندووە، کاتێك کە خوای گەورە دەفەرموێت (إليك: واتە: بۆ لای تۆ)، وا لە دوو شت دەکات کە تێکەڵی یەك ببن، یەکەمیان شوێنەواری قورئان لە بەدیهێنانی ڕێنموویی لە خەڵکیدا، بە دەرهێنانیان لەو تاریکییانە. دووەمیان ئەو ڕوونکردنەوە و گەیاندنەی قورئانە کە پێغەمبەری خوا پێی هەڵدەستێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (الر * كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ)، (واتە: چەند پیتێك لە سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون ژمارەیان (١٤) پیتە، نیوەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی (اعجاز) و مەزنی و گرنگیی قورئان کە لە توانای هیچ کەسدا نییە بەو پیتانە کتێبێکی ئاوا بێ وێنە دابنێت، بەڕادەیەك هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەو مەبەستە، بێگومان ناتوانن، هەروەها چەندەها نهێنیی تریشی تێدایە، زاناکان لە هەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتوویانە: هەر خوا خۆی زانایە بە نهێنیی ئەو پیتانە. ئەم قورئانە کتێبێکە دامانبەزاندووە بۆت ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) تا خەڵکی لە تاریکییەکانی (بێ باوەڕی و نەزانی و سەرلێشێواوی) دەربهێنێت، بەرەو نوور و ڕێبازی ڕۆشنایی ئیمان، بە ویستی پەروەردگاریان، تا دەگەنە ڕێبازی ڕاستی خوای باڵادەست و شایستەی سوپاسگوزاری)، (إبراهيم: ١).

د. هەروەها ئەو ڕاگەیەنەری دابەزێنراوەکەیە بۆ خەڵکی، ئەوەش کە تێڕامانیان بۆی کاریگەریی لەسەر بەدیهاتنی هیدایەتەکەیان دەبێت، بەوەی کە کرداری بەدیهاتنی هیدایەت تێیاندا دەدرێتە پاڵ، بەهۆی بیرکردنەوەیان، بەشێوەیەك کە ئەمجارەیان بەرپرسیارێتیی ڕێنموویەکە دەربخات، ئەمەش تەنها بۆ پێغەمبەر نییە، بەڵکو بۆ هەر مرۆڤێکە کە پێغەمبەر ئەوەی پێگەیاندووە کە "بۆیان/ إلیهم"ی –نەك "بۆ سەری/علیە" یان "بۆی/ إلیە"– ناردووەتە خوارەوە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (بِالبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ)، (واتە: ئێمە ئەوانمان ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگە و نیشانە و (موعجیزە)ی زۆر و کتێبی ئاسمانیدا، ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بیرێك بکەنەوە و تێفکرن)، (النحل: ٤٤).

هـ. هەروەها لەو شتانەی کە حەقیقەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕوون دەکاتەوە، ئەو کاریگەرییەیە کە بە فەزڵی خوای گەورە و بەهۆی دابەزاندنی قورئانەوە، نیگا، ڕاگەیاندنی کاریگەرییەکەی لە پێغەمبەر و فێرکردنی، هەیبووە، هەروەها لەوەی کە هەردووکیانی (کاریگەری و فێرکردنی لەسەر پێغەمبەر) گێڕاوە بە هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی ڕێنموویی بۆ خەڵك، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وكذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِن أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدرِي مَا الكِتَابُ ولا الإِيمَانُ ولَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهدِي بِهِ مَن نَشَاءُ مِن عِبَادِنَا وإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ)، (واتە: ئەی موحەممەد (صلى الله علیه وسلم) ئا بەوشێوەیەی کە وتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە (کە ژیانبەخشە بە ڕوح و گیان و عەقڵ)، تۆ نەتدەزانی قورئان چییە و ئیمان چییە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردە ڕووناکی و نورێك کە هیدایەت و ڕێنموویی هەر کەس کە بمانەوێت لە بەندەکانمانی پێ دەکەین، (ئەوانەی دڵی بۆ دەکەنەوە و بە چاکی

گوێی بۆ دەگرن)، بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێنیشان دەریت و ڕێنمووی دەکەی بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست)، (الشوری: ٥٢).

٣. هەروەها ئەوەی کە لەم ئایەتانەدا هەڵدەهێنجێنرێت: (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا * مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا)، (واتە: خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ڕەوانەکردووە، هاوڕێ لەگەڵ ڕێنموویی و پەیامی ڕاست و دروستدا، بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو پەیام و بەرنامەیەکی تردا، خوا خۆیشی بەسە، بۆ شایەتدان و ئاشکرا کردنی ئەو ڕاستییە. موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لەخزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنۆش و سوژدە دەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی و پایەبەرزییە لەلای خوا، نیشانەی چاکی و پاکییان لە ناوچەوانیاندا دیارییە و دەدرەوشێتەوە لەئەنجامی سوژدەبردن و خواپەرستییاندا، جا ئەو بەڕێزانە ئەوە نموونە و پێناسەیانە لە تەوراتدا، نموونە و پێناسەشیان لە ئینجیلیشدا وەك ڕووەکێك وایە کە لەسەرەتاوە چەکەرە بکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور ببێت و ڕابوەستێت لەسەر قەدەکەی، ئەوەندە زوو پێ بگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت: چۆن وا پێگەیی؟! چۆن ئاوا خۆی گرت؟! ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە خوا کافران داخ لەدڵ بکات، جا خوای بەدەسەڵات

بەڵێنی بەوانەداوە کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە لەوان: کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورەو بێ سنووریان پێببەخشێت)، (الفتح: ٢٨-٢٩)، چەند شتێکە، لەوانە:

أ- بەڕاستی فەزڵ و گەورەیی هەر بۆ خوای گەورەیە لە ناردنی پێغەمبەرەکەی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت): بە هیدایەت و ڕێنموویی، لە سەردەمی گومڕاییدا و بە ئایینی ڕاست لە سەردەمی شێواندنی ئاییندا، کە بە هاتنی ئیسلام بەتاڵ بوونەوە.

ب - بەڕاستی ئامانجی ناردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بریتیی بووە لە سەرخستنی ئایینی ڕاست بەسەر هەموو ئایینەکاندا، بە شێوەیەك کە ڕێگە بە ویستی مرۆیی نەدات لە بەرپەرچدانەوەی ویستی خوای گەورە لەو سەرخستنەدا، واتە ئەو سەرخستنە جۆرێکە لە تەحەددای دەسەوسانکەر و موژدەیەك بە فەتح و ڕزگارکردن، بۆ ئەوانەی کە شوێن کۆتا پێغەمبەر کەوتبوون، لە کاتێکدا کە نە سەرکەوتنەکە بەدی هاتبوو، نە سەرەتا و پێشەکییەکانیشی دەرکەوتبوو.

ج - بەڕاستی خوای گەورە شاهیدە لەسەر ئەوەی کە: ئەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی هاتووە، ئایینی ڕاستە، خوای گەورە شاهیدە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئایینە بە دڵنیاییەوە هەر سەردەکەوێت.

د- بەڕاستی سەرکەوتنی ئاین یەکێکە لە واتاکانی جیهانیبوونی.

هـ - بەڕاستی موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەو و هاوەڵەکانیشی لە تەورات و ئینجیلیشدا وەسف کراون، بۆیە هیچ بوارێك نییە بۆ نکوڵیکردن لەو ئاینە ڕاستەی کە پێی هاتووە.

٦. بەڕاستی ئەو پێغەمبەرێکی جیهانییە، بەپێی ئەم خاڵانەی دێن:

أ. ئەوەش ئەوەیە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل داوایان کرد، بۆ ئەوەی کە پەیامەکە لە بەنو ئیسرائیلەوە بگۆڕڕێت بۆ پەیامێکی جیهانی، ئەویش بە ناردنی لە نێو نەوەکانی ئیسماعیلدا، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ)، (واتە: پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی کە لە ئایندەدا دێن پێغەمبەرێك لە خۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئان) و داناییان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاك بکاتەوە، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت)، (البقرة: ١٢٩).

ب. بەڕاستی ئەوە موژدەی عیسایە (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، (وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَقَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولَ اللَّهِ إِلَيْكُم فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَاللَّهُ لا يَهْدِي القَوْمَ الفَاسِقِينَ * وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِن التَّورَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ)، (واتە: بیریان بخەرەوە، کاتێك کە موسا بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و هۆزم ئێوە بۆچی ئازاری ڕۆح و دڵم دەدەن، لە کاتێکدا بێگومان دەزانن کە من پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوام بۆتان، جا کاتێك ئەوان گوێیان بۆ ڕاستی نەگرت و لە حەق لایاندا، خوایش دڵەکانیانی لەخشتە برد و مۆری پێدا نا، چونکە خوا ڕێنموویی قەوم و هۆزی تاوانکار و تاوانبار و لەسنوور دەرچوو ناکات. بیریان بخەرەوە، کاتێك عیسای کوڕی مەریەم بە نەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کە لە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواو و موعجیزەی ئاشکراوە

پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە)، (الصف: ٥-٦)، هۆکاری نێررانی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) بریتی بوو لە لادانی بەنو ئیسرائیل، کە ڕێککردنەوەی ئەوە دەخوازێت کە: ئەوە بە ڕاست بزانێت کە موسا پێی هاتووە و موژدە بە نێررانی کۆتا پێغەمبەری جیهانیی بدات، کە ڕەحمەت و ئاسانکەرە، ئەمەش لە خواست و پێداویستییەکانی بەجیهانیبوونێتی.

ج. ئەو فەرمانپێکراوە بە گەیاندنی پەیامەکەی بۆ هەموو جیهان، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ)، (واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەر و فرستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی، ئەو خوایەی کە هەر بۆ ئەوە خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی، هیچ خوایەك نییە جگە لەو زاتە، دەژێنێت و دەمرێنێت، جا کەوابوو باوەڕی پتەو بهێنن بەو خوایە و بەپێغەمبەرەکەی، کە هەواڵدەرێکی نەخوێندەوارە، (تا هیچ کەس نەڵێت پیاوێکی خوێندەوار بووە و خۆی قورئانی داناوە) ئەو پێغەمبەرەی کە خۆی باوەڕ دەهێنێت بە خوا و بە فەرموودەکانی، دە ئێوەش شوێنی بکەون، بۆ ئەوەی ئێوە ڕێنموویی وەرگرن)، (الأعراف: ١٥٨).

٧. بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە باشترینی بەدیهێنراوەکانی خوایە، فەزڵدراوە بەسەر پێغەمبەراندا، هەر کاتێکیش زانییان کە ئەو نێرراوە، جگە لە شوێنکەوتنی شتێکی تریان لەدەست نایەت، چونکە ئەو پەیامەی ئەوان پێی هاتوون باشتر نییە لەو پەیامەی ئەم پێی هاتووە، بەپێی ئەم خاڵانەی دێن:

أ. ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ

الشَّاهِدِينَ)، (واته: (یادیان بێنه) کاتێك خوا پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت کاتێك کتێب و دانایی پێبەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردن و بەڕاستدانەری ئەوەی ئێوەش بوو، ئەوە دەبێت باوەڕی پێ بهێنن و پشتگیری بکەن، ئینجا خوا فەرمووی: ئایا بڕیارتانداو پەیمانی منتان بەو جۆرە وەرگرت کە پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بڕیارمان دا و (هەروا دەکەین) ئەوسا خوا پێی فەرموون: دە بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان)، (آل عمران: ٨١).

ب. وەسفکردنی خۆی بۆ خۆی (دروودی خوای لەسەر بێت): لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمویەتی: "فضلت على الأنبياء بست: أعطيت جوامع الكلم، ونصرت بالرعب وأحلت لي الغنائم، وجعلت لي الأرض مسجداً وطهوراً، وأرسلت إلى الخلق كافة، وختم بي النبيون".[٨٤] (واته: بە شەش شت فەزڵم دراوە بەسەر پێغەمبەراندا: کۆکەرەوەی وتەکانم پێ بەخشراوە، بە ترس و بیم سەرکەوتنم پێ بەخشراوە، غەنیمەم بۆ حەڵاڵ کراوە، زەویشم بۆ گێڕراوە بە مزگەوت و پاکی، نێرراویشم بۆ هەموو بونەوەر، پێغەمبەرانم پێ کۆتا هێنراوە).

**چوارەم:** ئوممەت لە گوتاری قورئان و سوننەتدا:

١. بنیاتنانی کیانی ئوممەت و فاکتەرەکانی: ئوممەت لە گوتاری قورئانی و گوتاری پێغەمبەردا بنیات دەنرێت و کیانەکەشی لەسەر چەند فاکتەرێکە، کە دوورن لەو شتانەی کە پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرێت وەك ئەوەی کە دەڵێن لەسەر ڕەچەڵەك و نەتەوە بنیات دەنرێت، ئەمەش پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

([٨٤]) صحيح مسلم، باب الغنيمة، ج ٤، مجلد ٢، ١٢٣، رقم الحديث ١١٩٥.

أ. کیانی ئوممەت لەسەر بنچینەیەك لە مەسەلەی تەكلیف و تاقیكردنەوە بنیات دەنرێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالقِسْطِ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ)، (واتە: بۆ هەموو قەوم و گەلێك پێغەمبەرێك هەبووە، جا كاتێك (لە گۆڕەپانی مەحشەردا) ئەو پێغەمبەرەیان ئامادە دەبێت، لەسەر بنچینەی دادپەروەری داوەری دەكرێت لە نێوانیاندا و هیچ جۆرە ستەمێكیان لێناكرێت.)، (یونس: ٤٧)، هەر كاتێك پێغەمبەر لە نێو قەومەكەیدا نێررا ئەوا دەبن بە ئوممەت، بەمەش قەومەكەی دەبن بە ئوممەت دوای ئەوەی ئاگاداركردنەوە و موژدەدانی ئەو قەومە بە پێغەمبەرەكەی هاتە دی، بە ئاگاداركردنەوەشیان گوتاری بانگەواز دەستپێدەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِنْ مِّنْ أُمَّةٍ إِلا خَلا فِيهَا نَذِيرٌ)، (واتە: بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانەكردووە بە حەق و ڕاستییەكی تەواوەوە، تۆ مژدەدەری (ئیماندارانیت)، ترسێنەری (بێبڕواكانیت) هیچ گەل و نەتەوەیەكیش نەبووە كە فرستادە و بێداركەرەوەیەكی بۆ ڕەوانە نەكرابێت.)، (فاطر: ٢٤).

ب. ڕێكخەری ئوممەت یەكتاپەرستییە، بەو وەسفەی ئەمە ڕاستییەكە واقیع سەلماندوویەتی، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ أُمَّةً وَّاحِدَةً فَاخْتَلَفُوا وَلَوْلا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ)، (واتە: خەڵكی لە سەرەتای پەیدابوونیاندا بەش بەش نەبوون، بەڵكو تەنها یەك پارچەبوون، یەك ئایین بوون، یەك بیرو باوەڕ بوون، جا كە (زەمان تێپەڕی و زۆر بوون و لە سەرچاوەی نووری پێغەمبەرایەتی دووركەوتنەوە) ناكۆكی و جیاوازی لەنێوانیاندا پەیدا بوو و بەش بەش بوون، خۆ ئەگەر بڕیاردادەی پێشتر لەلایەن پەروەردگارتەوە نەبوایە، ئەوە دادپەروەری هەر لە دنیادا لەنێوانیاندا ئەنجام دەدرا، (حەق و ڕاستی ڕوون دەكرایەوە) لەو شتانەدا كە كێشە و جیاوازی تێدا دەكەن)، (یونس: ١٩)، كەواتە ئوممەتی یەكگرتوو بریتییە لە ئوممەتی

یەکتاپەرستیی فیتری و بە دوورکەوتنەوەی ئەو ئوممەتەش لە یەکتاپەرستی دەبێت بە چەند نەتەوەیەك، بە ئوممەتێك نامەێنێت کە بتوانێت مەرجەکانی شیاوبوونێکی دروست هەڵبگرێت، مەگەر بە تەصدیقکردنی پێغەمبەرەکەی، ئەگەر لەلایەن کۆمەڵێکیشەوە بێت.

٢. دروستبوونی ئوممەتی مەحەممەدی:

أ. گۆڕانی عەرەب لە وەچەیەکەوە کە نەسەبی دەدرایە پاڵ نەسەبی ئیبراهیمی، بۆ ئوممەتێك کە دەدرێتە پاڵ بیروباوەڕی ئیبراهیمی یەکخواپەرستی، بەپێی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە: (رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ * رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ)، (واتە: پەروەردگارا، هەردووکمان وا لێ بکە تەنها فەرمانبەردارو ملکەچی تۆبین و لە نەوەکانیشمان ئوممەتێکی موسوڵمان و فەرمانبەردار بۆ خۆت فەراهەم بهێنە و چۆنیەتی ڕێبازی بەندایەتیمان فێربکە و نیشانمان بدەو تەوبە و پەشیمانیمان لێ وەربگرە، بێگومان تۆ خوایەکی زۆر تەوبە وەرگر و میهرەبان و دلۆڤانیت. پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی کە لە ئایندەدا دێن پێغەمبەرێك لە خۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئان) و داناییان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاك بکاتەوە، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت)، (البقرة: ١٢٨–١٢٩)، دوعای ئیبراهیم و ئیسماعیل (سەلامی خوایان لەسەر بێت) بە گێڕانی بەشێك لە وەچەکانیان بە ئوممەت، واتە دوعای گۆڕینیان لە وەچەیەکەوە، کە دەدرێنە پاڵ پشت و نەسەب، بۆ ئوممەتێك کە بنێررێن بە پێغەمبەرێك لە خۆیان، کە هەستێت بە ئەرکی مژدەدان و ئاگادارکردنەوە، لێرەشەوە ئوممەتەکە شوێن پێغەمبەرەکەی دەکەوێت، ئەمەش ئەوەیە کە

دوعاکە لەخۆی دەگرێت، ئەو دوعایەیەی کە تەنها بەوەوە ناوەستێت کە مژدەدان و ئاگادارکردنەوە تەنها وەچەکان بگرێتەوە، بەڵکو درێژ دەبێتەوە بۆ بەدیهاتنی شوێنکەوتن.

ب. گۆڕان لە نەخوێندەوارییەوە بەو نەزانییەوەی کە دیاردەکەی هاوبەشپەیداکردنە، بۆ بوون بە خاوەن پەڕاو، کە دیاردەکەی زانستە بە یەکخواپەرستی و ڕێبازە یەکخواپەرستی، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمْيِينَ رَسُولا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِم آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمْ الكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبَيْنٍ)، (واتە: هەر ئەو زاتەیە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گوامڕایی و سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو)، (الجمعة: ٢)، هەر دوو ڕووەکەش لە هەردوو خاڵی (أ) و (ب) دا یەکتری تەواو دەکەن، بەوەی کە ئەو شوێنکەوتنە گریمانەکراوەی کە لە دوعاکەی ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە هەڵێنجێنراوە، دوای زانست بەو ڕێبازی یەکخواپەرستییە بەدی دێت، کە خاڵ (ب) باسی کردووە.

٣. بەرزبوونەوەی ئوممەتی موحەممەدی لە ئوممەتی یەکخواپەرستییەوە بۆ ئوممەتی ئیسلام:

أ. ئوممەتی یەکخواپەرستی ئیمان بەخوا بوون دەخوازێت، ئەگەر بۆ یەکەمجاریش بێت، چونکە یەکخواپەرستی دەروازەی بنیاتنانی ئوممەتە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ المُكَذِّبِينَ)، (واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و

نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورەپەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیر و هۆش و ژیری خۆی خستەکارو بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکردو بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو)، (النحل: ٣٦)، کەواتە ئوممەتی یەکخواپەرستی هەر لە سەرەتاوە بە ناسینی یەکتاپەرستی دەبێت.

ب. ئوممەتی ئیسلام باوەڕهێنانیان لێ دەخوازێت وەك بەڕاستدانانێك بۆ هەموو ئەوانەی پێشتر موسڵمان بوون، بۆ ئەوەی بچنە چوارچێوەی (هەستکردن بە ئینتیمای ئیسلامیی گشتی) ئەمەش ئەوەیە کە پشتیوانی لە گریمانەی دروستبوونی ئینتیما لەسەر یەکخواپەرستی و لەسەر تەکلیف لە چوارچێوەی تاقیکردنەوەدا دەکاتەوە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ)، (واتە: (ئەی پەیڕەوانی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئێوە) بڵێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا هێناوەو بەو قورئانەش کە دابەزیوە بۆمان و بەوەش کە دابەزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب، هەروەها بەو پەیامەی کە بۆ موسا و عیسا هاتووە و بەو پەیامانەی کە بۆ پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە کراوە لە لایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانەدا، ئێمە هەموومان تەنها تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارین)، (البقرة: ١٣٦)، بەدیهاتنی ئەمەش ناسینی هەموو ئەوانە

دەخوازێت کە لەسەر یەکخواپەرستین و هەروەها ناسینی پێغەمبەرەکانی، بەپێی فێربوونی ڕێبازی یەکتاپەرستی بە دوور و درێژی.

٤. (فاکتەرەکانی نێررانی ئوممەت): کاریگەریی پەیام و پەیامبەر لەسەر نێررانی ئوممەت، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە بەرجەستەی دەکات: (رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ)، (واتە: پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی کە لە ئایندەدا دێن پێغەمبەرێك لە خۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئان) و داناییان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاك بکاتەوە، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت)، (البقرة: ١٢٩)، لەوانەش:

أ. پەیام: نە گۆڕان لە وەچەوە بۆ ئوممەتی یەکخواپەرستی و نە بەرزبوونەوە لە یەکخواپەرستییەوە بۆ ئیسلام و نە کیانیش بۆ ئوممەت دروست دەبێت و نە تەزکیەبوونی بەدی دێت، تەنها بە خوێندنەوەی ڕێبازی یەکخواپەرستی نەبێت، لە چوارچێوەی ئایەتەکانی خوای گەورە و ئەو حیکمەت و داناییانەی کە تێیاندایە.

ب. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت): ئەمەش هەمووی بەوە دەبێت کە پێغەمبەرەکەیان (دروودی خوای لەسەر بێت) بەسەریاندا دەخوێنێتەوە، بەوەش پەڕاویان فێر دەکات و حیکمەت و داناییشان فێر دەکات.

ج. خوێندنەوەی قورئان و فێربوون بەو وەسفەی پرۆسەیەکی خۆپاککردنەوەو خۆ چاککردنە، بەهۆی ئەو هەوڵەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەیدات، بۆ گەیاندنی پایامەکەو مەبەستە فێرخوازییەکانی، بە هەموو ئەمانەش تەزکییە بەدی دێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمْيِينَ رَسُولا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِم آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمَهُمْ الكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا

مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبَيْنٍ)، (واتە: هەر ئەو زاتەیە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گوامڕایی و سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو)، (الجمعة: ٢).

٥. بەردەوامبوونی ئومەت و پێویستییەکانی کاریگەربوونی:

أ. پارێزگاریکردن لە پاکوبێگەردیی یەکخواپەرستی: ئەمەش ئەوەیە کە بیروباوەڕ لە لادان دەپارێزێت، و ئوممەت و یەکڕیزییەکەی لە پارچە پارچە بوونێك دەپارێزێت کە دەرەنجامی لادان بێت لە بیروباوەڕ، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزانە: (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّيْنُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ * مُنِيبِيْنَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَلا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ * مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِيْنَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ)، (واتە: (ئەی ئینسان بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە) ڕوو بکەرە بەرنامە و ئایینی خوا و ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆك و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لا مەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخشەو دروستکراوێکی خوادا نییە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستییانە نازانن. خەڵکینە: ڕوو بکەنە پەروەردگارتان، بەملکەچی بگەڕێنەوە بۆ لای، لەو بترسن و خۆتان لە سزای بپارێزن، نوێژەکانیشتان بە چاکی ئەنجام بدەن، مەبن بەو کەسانەی کە شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن. لەوانەی کە ئایینەکەیان بەش بەش کردووە و بوونەتە چەندەها گرۆ و دەستە (بڕوایان بە هەندێکی هەیە و بڕوایان بە هەندێکی نییە و کوێرانە شوێن ڕابەرەکەیان دەکەون) هەر گرۆ و پارتێکیش دڵخۆش بە بەرنامە و نەخشە و

پلانی خۆیان (وا دەزانن چاکترین ڕێبازیان گرتووەتەبەر)، (الروم: ٣٠-٣٢)، کەواتە بەرهەمی پابەندبوون بە یەخواپەرستیی ڕاست بە ئەنجامدانی پەرستش بۆ خوا، بریتییە لە یەکڕیزیی ئوممەت لە دووبەرەکی و ناکۆکی و پارچەپارچەبوون، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ)، (واتە: خەڵکینە! بەڕاستی ئەم ئایینەی کە ئەم پێغەمبەرانە هێناویانە، ئایینەکەی ئێوەیە، کە یەك ئایینە و منیش پەروەردگارتانم، تەنها من بپەرستن)، (الأنبياء: ٩٢)، شوێنەواری بەدیهاتنی پەرستراوێتیی ڕاستەقینەی خودا (الألوهية)، لە بەدیهاتنی تەقواو لەخواترساندا بەدی دێت، کە جێگاکەی دڵە، بۆیە یەکێتییەکەیان بە یەکێتییەکی هەست و شعوریان دەبێت، کە لەسەر لەخواترسان بنیات نرابێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ)، (واتە: هەر ئەمەشە دین و ئایین و بەرنامەی تاك و تەنهای ئێوە، (بەرنامەی یەکخواناسی)و من پەروەردگارتانم، پارێزکاربن و خۆتان لە نافەرمانی من بپارێزن)، (المؤمنون: ٥٢)، پارچەپارچەبوون بە هیچ پەیوەندییەك ناگاتەوە بە ئایین، بەڵکو بە دەرچوون لێی (الفسق) و گێلبوون لێی، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ)، (واتە: (هەوڵ بدەن) هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئایینی خواوە و پەرت و بڵاو مەبن، یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، (چونکە) کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر (هەروەها ئەو کاتە) ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستا بوون و (خەریك بوو بکەونە ناوی)، بەڵام خوا (بە ڕەحم و

میهرەبانیی خۆی) لەو ئاگرە ڕزگاری کردن، ئابەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن)، (آل عمران:١٠٣).

ب. بە حەکەم دانانی شەریعەتی پەڕاو لە چوارچێوەی ئوممەتدا:

لەوانەش ئەوەیە کە لە چوارچێوەی ئەم ئایەتەدا دێت: (وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَى هَؤُلاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدَىً وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ)، (واتە: ڕۆژێك دێت لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك دەنێرین لە خۆیان بۆ سەریان، تۆشمان هێناوە (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) کە شایەت بیت لەسەر ئەو خەڵکە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتەو مزگێنیشە بۆ موسوڵمانان)، (النحل: ٨٩)، کەواتە پەڕاوەکە دەبێتە ڕوونکەرەوەی ئەحکامەکان، ئەو ئەحکامانەی کە کاروباری کۆمەڵی موسڵمان ڕێك دەخەن، لە چوارچێوەی بازنەی بە حەکەم دانانی شەریعەت، جگە لەمە ئەم ئایەتە پیرۆزەش هەر لەسەر ئەوەیە کە دەفەرموێت: (لِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنْسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلا يُنَازِعُنَّكَ فِي الأَمْرِ وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَى هُدًى مُّسْتَقِيمٍ)، (واتە: بۆ هەر میللەتێك بەرنامە و پرۆگرامێکمان دیاری کردووە پەیڕەوی دەکەن و لەسەری دەڕۆن (بەگوێرەی کات و شوێن و بارودۆخیان، ئەم بەرنامەیەشمان ناردووە بۆ هەتا هەتایی) کەواتە با خاوەن ئایینەکانی تر نەکەینە کێشە و ئاژاوە لەگەڵتدا لەبارەی ئەم ئایینەوە، ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەردەوام بەنگەوازی خەڵکی بکە بۆ لای پەروەردگارت، چونکە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕێگە و ڕێباز و هیدایەتێکی ڕاست و دروستیت)، (الحج: ٦٧)، لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوا لە هەردووکیان بێت) گێڕراوەتەوە، کە وتوویەتی: وشەی: (منسكاً): واتە شەریعەتێك کە ئەوان کاری پێ دەکەن.[٨٥]

---

(٨٥) البغوي، في تفسيره "الحج: ٦٧".

ج. کاریگەریی بەهاکان لەسەر پاراستنی یەکڕیزیی ئوممەت: کە لەسەر ڕێزگرتنی پەیوەندیی برایەتی لە دیندا وەستاوە: بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَالمُؤْمِنُونَ وَالمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ المُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)، (واتە: (لەو لاشەوە) ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیر و هاوکاری یەکترن (کە ئەمەش سیفەتیانە): فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن و زەکاتیماڵیشیان دەبەخشن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە لە ئایندەدا خوا ڕەحمیان پێ دەکات و سۆزی دەبێت بۆیان، بەڕاستی خوا باڵادەست و دانایە)، (التوبة: ٧١)، هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزە: (إِنَّمَا المُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ واتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ)، (واتە: لەڕاستیدا هەر ئیمانداران برای یەکن، کەواتە هەرکاتێك لەنێوان دوو براتاندا ناکۆکی پەیدا بوو، ئێوە نێوانیان چاك بکەن و ئاشتیان بکەنەوە، هەمیشە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێ بکرێت.)، (الحجرات: ١٠)، هەروەها لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (لا تحاسدوا ولا تناجشوا ولا تباغضوا ولا تدابروا ولا يبع بعضكم على بيع بعض، وكونوا عباد الله إخوانا، المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يخذله ولا يحقره، التقوى هاهنا –ويشير إلى صدره الشريف ثلاثاً– بحسب امرئٍ من الشرِّ أن يحقر أخاه المسلم، كل المسلم على المسلم حرام: دمه وماله وعرضه). (٨٦)

٦. ڕۆڵی خێریی بەهایانەی جیهانیی ئوممەت لە دەرەوەی کیانی خۆی:

أ. گەواهیدان لەسەر خەڵك بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا وَمَا جَعَلْنَا القِبْلَةَ الَّتِي

---

(٨٦) صحيح مسلم، مصدر سابق، ج٨، مجلد ٤، ص١٠، رقم الحديث: ٦٧٠٦.

كُنْتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَّتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَّنْقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَإِنْ كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلاَّ عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، (واته: بەو شێوەیەش ئێوەمان بە گەلێكی میانەڕەو گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەكەوە، لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستییەوە، لە ڕووی دنیا و قیامەتەوە، لە ڕووی داخوازییەكانی ڕۆح و نەفسەوە.. هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵكییەوە (تا بزانن ئەم ئایین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێر و سەربەرزییە بۆ تاك و كۆمەڵ لە هەموو سەردەمێكدا و لە هەموو بوارەكانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی پێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستاو ڕابەری ئێوە بێت و لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی بدات (بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بەئەركی سەرشانی خۆیان هەستاون) و ئەو قیبلەو ڕووگەیەش ڕووت تێكردبوو (كە بیت المقدس بوو) گۆڕانكاریشمان بەسەردا هێنا تەنها بۆ ئەوە بوو بزانین و دەربكەوێت، كێ شوێنكەوتەی پێغەمبەر دەبێت و كێش پاشە و پاش هەڵدەگەڕێتەوە، هەرچەندە (گۆڕینی قیبلە) بوو بەهۆی ناڕەحەتییەكی گەورە، مەگەر لەسەر ئەوانەی خوا دڵیانی دامەزراندبوو و ڕێنموویی كردبوون، بێگومان خوا ئیمان و باوەڕداریی و (نوێژتان) زایە ناكات، چونكە بەڕاستی خوا بۆ خەڵكی، زۆر بەسۆز و بە بەزەییە)، (البقرة: ١٤٣)، گەواهیدانیش ئامادەبوونە لە نێو خەڵكیدا، ئەویش بە دەستگرتنی ئومەت دەبێت بە ئایینەكەیەوە، بۆ ئەوەی ببێت بە نموونە بۆ خەڵكانی تر، بە ڕەنگدانەوەی شوێنەوار و كاریگەرییەكانی ئایین لە جوانكردنی ئاییندارییەكەیان و بەو شایستەكردنەی كە ئایین لە ڕێگەی زانست و مەعریفەوە پێیان دەبەخشێت، هەروەها بە پاككردنەوەی دەروونەكانیان، كە پاڵیان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی بەرگی وەسەتییەت لەنێو خەڵكدا بكەنە كاڵای باڵایان.

ب. بانگەوازكردنی خەڵكی بە فەرمانكردن بە چاكە و بەرگریكردن لە خراپە، بەو وەسفەی ئەمە لە دیاردەكانی خەیری بوون و چاكبوونە، بەپێی ئەم

ئایەتە پیرۆزە: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ المُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ المُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الفَاسِقُونَ)، (واتە: (بەڕاستی) ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بە خوا دەهێنن، خۆ ئەگەر خاوەنانی کتێب باوەڕیان بهێنایە (بە ئایینی ئیسلام) ئەوە چاکتر بوو بۆیان، هەیانە ئیماندارن، بەڵام زۆربەیان گوناهبار و تاوانکارن)، (آل عمران:١١٠).

## تەوەری دووەم:

## چەمکە بنچینەییەکانی بنیاتنانی ستراتیژییەتی بەرپەرچدانەوەی سەرپێچیکەرانی ڕێبازی یەکخواپەرستی

مەبەست لەم تەوەرە دیاریکردنی ئەو چەمکە بنچینەییانەیە، کە بەشداریی لە گەڵاڵەکردنی ڕێبازێکی فیکریدا دەکەن، کە فیکری ئیسلامی – بەبیرمەندەکانیەوە– دیاریی دەکەن، ئەو فیکرە ئیسلامییەش خۆی بۆ بەرگریکردن لە ئیسلام و پەیام و پەیامبەر و ئوممەتەکەی تەرخان دەکات، ئەو ئوممەتەی تایبەتمەندییەکانی جێگیری و دامەزراوی دەکاتە کاڵای باڵای خۆی کە وەریگرتووە لە دامەزراوی و جێگیریی سەرچاوەکانی ئیسلام و ئەوانەی لەخۆی گرتووە، کە نە بە تێپەڕبوونی کات بەسەردەچن، نە کاریگەرییان بە هاتنەپێشی ئەو پێشهاتە نوێیانە بەسەر دەچن، کە لەبەردەم ڕێڕەوی فیکری ئیسلامیدا لەلایەن ئەوانەی کە دژی ئیسلام سەنگەریان گرتووە، دەخوڵقێنرێن، هەر ئەمەشە جارێکی تر وا لە توێژەر دەکات پشت بە مەرجەعییەتە ئیسلامییە جێ متمانەکان ببەستێت، کە لە نیگادا چڕ دەبێتەوە: بە قورئان و سوننەتەوە.

دەخوازرێت ئەوەی کە بنیاتنانی ڕەهەندی چەمکگوزاری لەم چوارچێوەیەدا بەدیی بهێنێت، بریتی بێت لە بنیاتنانی مەرجەعییەتێکی فیکریی واقیعی، کە توانای مامەڵەکردنی خێرای لەگەڵ واقیعدا هەبێت، ئەو واقیعەی کە هەوڵگەلێکی فیکریی گومانئامێز بەخۆوە دەبێنێت بەرامبەر بە مەرجەعییەتی جێمتمانەی ئیسلامی و مەعالیمە سەرەکییەکانی ئیسلام لە پایەکانی–مەبەستم مەرجەعیەتی فیکریی واقیعییە–، کە بە دابەزاندنی دەق بۆ سەر واقیع بنیات دەنرێت، دوای پرۆسەگەلێکی فیکری، کە عەقڵی موسڵمان پێی هەستێت، لە پۆلێنکردنی ئەوەی کە واقعی سەرپێچیکەران و بۆسەدانەرە گومانکەرەکان لە ئیسلام دروستی دەکەن، ئەویش بە پابەند بوون بەوەی کە لە گوتاری قورئانیدا هاتووە، لە خستنەڕووی هاوشێوەی ئەوانە، کە بانگەوازی موحەممەدی ڕووبەڕووی بووەتەوە و بانگەوازەکانی پێغەمبەرانی پێشووش بەهەمان شێوە بوون، کە لە ئەنجامیدا ئەو پوختە فیکرییە دەرکەوتووە، کە لە گفتوگۆ و دیالۆگیی بانگەشەکاراندا بەکارهاتووە، هەروەها لە جیدالی بانگەوازکاران بۆ ئەو جۆرە خەڵکانە، بۆیە سیستمە فیکرییەکە بە پتەوی و جێگیری ماوەتەوە، ئەو دەقانە بەسەر چوون و ئاوا بوون، کە بناغەی ئەو بیروبۆچوونانەیان دادەنا، ئەگەر بە کارێکی مەبەستداریش نەبووبێت، ئەوا دۆخە دەروونییەکەی پرۆسەی جەدەلەکە و گفتوگۆ خێراکە لەو چوارچێوەیەدا بەهانەن بۆ ئەوە.

دواتر، دەکرێت دیارترینی ئەو مەسەلە چەمکگوزارییانە دیاریی بکەین –کە مەرجەعییەتی فیکریی دروست دەکەن، بۆ هەر کەسێك بیەوێت بەرگریی لە ئیسلام بکات، بەڵکو –پێش ئەوە–بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، مەعالیمەکانی ئیسلام لە چوارچێوەیەکی فیکریدا ڕابگەیەنێت– بەپێی ئەم مەسەلانەی کە دێن:

**یەکەم:** ڕەچاوکردنی پەنهان و دیار (الغيب والشهادة):

لەم چوارچێوەیەدا چەند مەسەلەیەك ڕەچاو دەکرێن، کە بەشداریی دەکەن لە ڕێکخستنی مەرجەعییەتی فیکری و گەڵاڵەکردنیدا، ئەو مەسەلانەش لەم چەند خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

زاتی ئیلاهی: (الذاتُ الإلهيَّةُ): خوای گەورە لە ئەنجامی پەروەردگارێتیی خۆی و ئەو نیگایەی کە ناردوویەتی بۆ سەر پێغەمبەران و نێرراوەکانی (دروودی خوایان لەسەر بێت) ناسراوە، پەروەردگارێتیی خوا و نیگاش فیترەتی دروست بە ڕاستیان دادەنێت، ئەو فیترەتەی کە ڕاستی خوای ناسیوە و مەیلی بۆ پەرستراوێتیی خوای گەورە هەیە و بەڕاستیی خوای گەورە بە پەروەردگاری خۆی دەزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نە ناسینی یەکخواپەرستی، نە ئەو تەکلیف و پەرستشەش کە لەبەرەنجامییەوە دروست دەبێت و نە ئەو بەرپەرسیارێتییەش کە لێیان دەکەوێتەوە، بە پەیامێکی دابەزێنراو نەبێت دروست نابن، بەپێی ئەوەی کە زانایان فەرموویانە. (٨٧)

پێویستە لە بنەڕەتدا بیرکردنەوە لە خوای گەورە بیرکردنەوە بێت لە کردارەکانی، ئەو کردارانەی کە لە بەڵگەکانی پەروەردگارێتیی ئەودا دەرکەوتوون، هەروەها پێویستە تێفکرین و ڕێنماخوازی بە ئاراستەی سیفاتەکانی خوای گەورە بێت، ئەو سیفاتانەی کە شوێنەوارەکانی لە بەدیهێنراوەکانی ئەودا ڕەنگی داوەتەوە، بۆ ئەوەی ببن بە بەڵگە لەسەر تەصدیقکردنی ئەو سیفاتە زاتییانەی خوای گەورە، کە نیگا ڕوونی کردووەتەوە، لە (ئیبنو عەباس)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر

---

(٨٧) النابلسي، عبد الغني بن إسماعيل، حقائق الإسلام وأسراره، دراسة وتحقيق: عبد القادر أحمد عطا، القاهرة: ط١، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م، ص٩٢-٩٣.

بێت) فەرمویەتی: «تفكَّروا في كلِّ شيء ولا تفكَّروا في ذاتِ الله»،[88] (واتە بیر لە هەموو شتێك بكەنەوە، و بیر لە زاتی الله مەكەنەوە)، (غەزالی) جەخت لەوە دەكاتەوە كە ناسینی زاتی (الله)ی بەرز و بڵند بوارێكی بەرتەسكی هەیە بۆ توێژینەوە، بیركردنەوەش لێی كارێكی گرانە و كەمیش یاد خراوەتەوە، لە قورئانیشدا تەنها لە بواری پیرۆزڕاگرتنی الله دا هاتووە، وەك ئەوەی كە دەفەرموێت: (.. لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ..)، (واتە:.. هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت (چونكە خوایە و بەدیهێنەرە، چۆن لە بەدیهێنراوەكانی دەچێت)..)، (الشورى: ١١)، هەروەها دەفەرموێت: (..سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ * بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ..)، (واتە: ..پاكی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە كە دوورە لەو سیفەتە ناقۆڵا و نادروستانەوە كە ئەوانە خوای پێی پێناسە دەكەن * بێگومان ئەو زاتە بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە لە جوانترین و ڕێك و پێكترین شێوەدا..)، (الأنعام: ١٠٠-١٠١)، بەڵام قسەكردن لە سیفاتەكان فراوانترە و باسكردن و یادكردنی كردارەكان زۆرن[89]، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) تەنها بە ڕێنموویی نیگا باسی لە زاتی بەرزی الله كردووە.

باوەڕهێنان بە خوای بەرز و بڵند: لە ڕووی زات و بوونەوە، باوەڕبوون بە هەموو ئەو سیفاتانە دەخوازێت، كە نیگا باسی كردوون[90]، باوەڕبوونێك كە هەموو ئەو سیفاتانە جێگیر بكات، بەبێ ئەوەی بیانخاتە تەرازووی ماددییەت و

---

([88]) البيهقيّ، كتاب الأسماء والصفات، مرجع سابق، ص٣٦٠.وينظر" الغزاليّ، أبو حامد محمّد بن محمّد. جواهر القرآن، تحقيق: محمّد رشيد رضا القبانيّ، بيروت: دار إحياء العلوم، ط١، ١٩٨٥م، ج١، ص٢٥-٢٧.

([89]) الغزاليّ، أبو حامد محمّد بن محمّد، المصدر السابق نفسه.

([90]) الدارمي، عثمان بن سعيد. الردّ على الجهميّة، قدّم له وخرّج أحاديثه: بدر البدر، الكويت: الدار السلفيّة، ط١، ١٤٠٥ه/١٩٨٥م، ص١٣-١٤.

ڕەهەندەكانییەوە" چونكە ناكرێت سیفاتەكانی خوای گەورە لەگەڵ شتی تردا بە بەراورد بگونجێنرێن (التكييف)، هەروەها ناكرێت بچوێنرێن (التشبيه)، هەروەك چۆن ناكرێت بشێوێنرێن (التحريف)، یاخود لەكار بخرێن (التعطيل).

لە قورئانی پیرۆزدا ئەوە هاتووە كە جەخت لە جیاكردنەوەی هەردوو پێگە و مەنزیلەتی: پەرستراو (الإله) و هەموو شتەكانی تری غەیری ئەو، بۆ ئەوەی نە عەقڵ و نە زمانەكان هەڵنەخلیسكێن، لە باسكردنی خوای گەورەو زاتی بەرزی، سیفات و كردارەكانیشی، بەشێوەیەك كە ئەو جیاكارییە نەهێڵێت، بۆیە شوێننەكەوتنی ئەو مەسەلانەی كە قورئان لەم بوارەدا ڕوونی كردووەتەوە، جورئەتكردن لە قسە دروستكردن لەسەر خوای گەورە (التقوُّلِ) حەرامە (المحظور).[٩١]

هاوەڵە بەڕێزەكانیش بە بەڵگەی قورئان موحاجەجەی ئەهلی كیتابیان كردووە لە سەلماندنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و ڕوونكردنەوەی پێگەكەی، بۆیە نە زیادیان كردووە لەوەی قورئان هێناویەتی، نە زۆریان لە خۆشیان كردووە بۆ ئەوەی پێوەری عەقڵی بهێنن، چونكە ئەو كارە خراپە (الفتن)ی لێ دەكەوێتەوە،[٩٢] هەروەها لەپێناو شوێنكەوتنی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە پەلەی نەدەكرد لە وەڵامدانەوەی هەر مەسەلەیەك كە خوای گەورە زانیاریی لەبارەوە نەدابێتێ، تا ئەو كاتەی نیگای لەلایەن خوای گەورەوە بە فەرمانی خۆی بۆ دەهات.

---

(٩١) چونكە سەرچاوەی ناسینی ناو و سیفاتەكانی خوای گەورە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاكە. انظر: النابلسي، عبد الغني بن إسماعيل، مصدر سابق، ص٩٢-٩٣.

(٩٢) الصلاّبي، عليّ محمّد. صفات ربّ البريّة على العقيدة السلفيّة، الشارقة: مكتبة الصحابة، ط١، ١٤٢٢هـ/٢٠٠١م، ص١٤٨-١٥٨.

٢. هەڵوێست لەسەر هێنانەبوون (خلق)ی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت): پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ڕێبازی یەکخواناسی دەرنەچوو، کە بریتی بوو لە —ئەمە لە کاتێکدا کە لە کاتی پێویستدا قورئانی بۆ دادەبەزی— وەڵام یان ڕەت نەدانەوە تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە لەلایەن خوای گەورەوە نیگای بۆ دابەزیبێت و ئەویش گەیاندوویەتی، ئەوەتا لە باسی هۆکارەکانی دابەزینی قورئاندا هاتووە کە: دوو قەشە (راهب)ەکەی نەجران پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا کرد (دروودی خوای لەسەر بێت) لەبارەی عیساوە (سەلامی خوای لەسەر بێت)، وەڵامی نەدانەوە تا ئەم ئایەتانە دابەزێنرانە سەری: (إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ *الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلا تَكُن مِّنَ الْمُمْتَرِينَ)، (واتە: بەڕاستی نموونەی دروستبوونی عیسا لەلایەن خواوە، وەك نموونەی ئادەم وایە کە لە خاك دروستی کرد و لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو، (عیسا دایکی هەبوو، ئادەم دایك و باوکیشی نەبوو). (٥٩) حەقیقەت و ڕاستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، کەواتە نەکەیت بچیتە ڕیزی ئەوانەی کە گومان کارکردی هەیە لەسەریان)، (آل عمران: ٥٩ ، ٦٠) [٩٣] واتە پێغەمبەری بەڕێز (دروودی خوای لەسە بێت) لەوەسفی عیسا وەستا تا خوای گەورە نیگای بۆ نارد، ئەمە لە کاتێکدا کە بەدڵنیاییەوە ئەوەی دەزانی کە عیسا مرۆڤە، تەنها ئەوە نەبێت کە چۆن هاتووەتە بوون.

٣. ڕۆح: پابەندبوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە ڕێبازی یەکخواناسییەوە، کە پابەندبوون بە قورئانەوە دەخوازێت، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) هیچ وتەیەکی لەسەر ڕۆح نەفەرموو لەو کاتەدا کە هەندێك لە جولەکەکان پرسیاریان لێ کرد، ساتێك وەستاو، سەری بەرزکردەوە،

---

(٩٣) السيوطي، جلال الدين. لباب النقول في أسباب النـزول، بذيل تفسير الجلالين، مراجعة وضبط: أحمد خالد شكري، دمشق: دار ابن كثير، ط٩، ١٤١٩ه/١٩٩٨م، ص١١١-١١٤.

چاوەڕوانیی ئەوەی دەکرد کە خوای گەورە لەوبارەیەوە بۆی دادەبەزێنێت، خوای گەورەش نیگای ئەم ئایەتەی بۆ کرد: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ العِلْمِ إِلاّ قَلِيلا)، (واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چییە و چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چییە و چۆنە) و هیچتان پێنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتێکی کەم نەبێت)، (الإسراء: ٨٥)، [٩٤]بەمەش بڕیاردان لەسەر وەسفکردنی زانستی مرۆڤ بە کەم، تەنانەت پێغەمبەریشی گرتەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە ئەو زاناترین کەس بووە سەبارەت بە پەروەردگارەکەی و لە هەموو کەسیش زیاتر پەرستشی بۆ خوا کردووە و لە هەموو کەسیش زیاتر لێی ترساوە و سنوورەکانی پاراستووە، ڕۆحیش بووە بە یەکێك لە مەسەلەکانی ئیعجاز و تەحەددا پێکردن. [٩٥]

٤. ڕۆژی دوایی (الساعة): ڕۆژی دوایی و کاتەکەشی هەر بەپێی ڕێبازی یەکخواناسییە، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وەڵامی ئەوانەی نەدایەوە کە تەحەددایان دەکرد بەوەی بتوانێت کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی دیاری بکات، تا ئەم ئایەتە پیرۆزەی بۆ دابەزی: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَّسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ)، (واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی قیامەت: کەی بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی کاتی بەرپابوونی هەر لای پەروەردگارمە، لەکاتێکدا کەس لە سات و کاتی خۆیدا دەری ناخات و بەرپای ناکات زاتی پەروەردگار نەبێت، بەرپابوونی قیامەت زۆر گرانە و زۆر

---

([٩٤]) المرجع السابق، ص٢٠١، ص٢٥٨.

([٩٥]) إقرأ: الواقعة: ٨٣-٨٧.

دەکەوێت لەسەر دانیشتووانی ئاسمانەکان و زەوی (چونکە شیرازەی هەمووی تێکدەچێت و لێکهەڵدەوەشێت) ڕۆژی قیامەت بەرپا نابێت کوتوپڕ نەبێت، لە پڕ یەخەتان پێدەگرێت، وا پرسیارت لێدەکەن هەر وەك تۆ زۆر عەودالّی زانینی هاتنی ڕۆژی قیامەت بیت و پرسیاری زۆرت لە بارەیەوە کردبێت!! پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی بەرپابوونی قیامەت تەنها لای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکیش (ئەمە) نازانن)، (الأعراف: ١٨٧).

**دووەم:** جیهانێتیی پەیام و داخوازی و پێویستییەکانی (عالمية الرسالة ومقتضياتها): لێرەدا مەبەستمان لە پەیام جیهانێتیی گوتارەکەیەتی، واتە هەموو مرۆڤێکی عاقڵ -واتە عاقڵ بێت بە پێوەری هەستەکان نەك بە پێوەری شوێنکەوتن- شیاویی خوێندنەوەی گوتاری قورئانیی هەیە، بەڵکو پێویستیشە لەسەری کە بیخوێنێتەوەو لە ئایەتەکانیشی ڕامێنێت، چونکە قورئان لە ڕوونکردنەوە ڕاگەیاندن هێندەی تێدایە کە بەس بێت، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالقُرْءانِ مَنْ يَخَافُ وَعِيدِ)، (واتە: ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئێمە چاك ئاگادارین بەوەی کە دەیڵێن و چۆن دژایەتی ئەم ڕاستییە دەکەن!... خۆ تۆ زۆردارنیت بەسەریانەوە تا باوەڕیان بەسەردا بسەپێنیت.. کەواتە تۆ تەنها ئەوەت لەسەرە کە بە قورئان یاداوەریی ئەو کەسانە بکەیت کە لە هەڕەشەکانی ئێمە دەترسن)، (ق: ٤٥)، قسەی ئەوان سەبارەت بە نیگا و پێغەمبەر و پەیام هەرچییەك بێت، خوای گەورە ئەوەی خستووەتە نێو قورئانەوە کە یادخستنەوە لە دڵەکاندا دروست بکات، لەبەر ئەوەی کە ڕۆژهەڵاتناسەکان و غەیری ئەوانیش لە جۆرێك لە تێڕامانەوە دروست بووە، ئەوا ئەوان لە حاڵەتێکی خوێندنەوەی تێڕامانانەدان، کە قورئان فەرمانی پێداوە و مرۆڤی بۆ هەڵناوە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا)، (واتە: ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە

قورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن؟! یان ئەوەیە دڵەکان لەئاستی ڕاستیدا قفڵ دراوە؟!)، (محمد: ٢٤)، بەڵام ئەوەی کە پەیوەندیی بە نییەتەکانەوە هەیە، ئەوا خوای گەورە بەو نییەتانەو بە دڵەکانیشیان زاناترە، تێڕامانی تەندروست و دروست بۆ بیرکدنەوە لەدوای ڕوونبوونەوە، نیشانەکەشی بەدیهاتنی هیدایەتە، بەڵام هەرکەسێك قورئان یادخستنەوەی بۆ دروست نەکرد ئەوە دەچێتە چوارچێوەی زۆرلێنەکردنەوە.

**سێیەم:** چاکترینبوون (الأقوميَّة): [٩٦]چاکتریبوون ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی کردووەتەوە: (إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا)، (واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە هیدایەت بەخشە بۆ چاکترین ڕێگە و ڕێباز و بەرنامە، مژدەیش دەدات بەو ئیماندارانەی کە کار و کردەوك چاکەکان دەکەن کە بێگومان پاداشتی زۆر و بێ سنوور چاوەڕێیانە)، (الإسراء: ٩)، ئەوەی جێی تێبینی کردنە لێرەدا چەند مەسەلەیەکە، لەوانە:

١. جەختکردنەوە لەوەی کە ئەوەی کە هیدایەت بەدی دەهێنێت بریتییە لە قورئان، ئەمەش جەختکردنەوە لە توانای بەدیهێنانی هیدایەت لەلایەن خوای گەورەوە دەردەخات کە لەو بەرنامەی یەکخواپەرستیدا هەیە، کە قورئان هێناویەتی.

٢. هیدایەت بۆ باشترین (الأقوم) دەبێت لە چوارچێوەی کردەوەی چاکدا، چونکە ئەو ئایەتە وای داناوە کە ئەوەی لە گوتاری قورئانی ڕامێنێ و خۆی لە یەکەمینی پلەکانی هودادا دابنێت، ئەوە بڕوادارە، بە بەڵگەی ئاماژەکردنی ئایەتەکە بۆ بڕواداران.

---

[٩٦] چاکترینبوون (الأقومية) بەو وەسفەی چەمکێکە بۆ یەکەمجار لە سەرپەرشتیاری دکتۆراکەمەوە (أ. د. سیف الدین عبدالفتاح إسماعیل) بەرگوێم کەوت، کە ئاراستەکەریشم بوو لە چوارچێوەی ڕێنماییەکانی لە کاتی دیراسەمدا.

٣. ئاماژەکردن بۆ بڕواهێنان بە کۆ، ئەمەش بە ناڕاستەخۆ ئاماژەیە بەوەی کە تێڕامان لە قورئان و دواتر دروستکردنی هودا و هەنگاونانن بەرەو کردەوەی چاك لە چوارچێوەی ئەوەدا نابێت کە بە باشترین وەسف بکرێت، تەنها لە چوارچێوەی کۆمەڵ (الجماعة)دا نەبێت، هەروەها هیچ سوودێکی نییە لە ڕزگارکردنی مرۆڤدا، لە باوەڕهێنان و ئامۆژگاریکردنی یەکتر بە حەق و ڕاستی، ئایا نابینیت پاداشتی گەورە بەستراوەتەوە بە بانگەوازکردن و سەرکەوتن بە هاوشێوەی پاداشتی ئەوەی کە بەهۆی بانگەوازەکەی تۆوە هیدایەتی وەرگرتووە؟

٤. لە زمانی عەرەبیدا (أقوم) (اسم فضیل)ـە، واتە بۆ تەفزیلە، بنچینەش لە شێوازی تەفزیلداندا لە زماندا لە نێوان دوو لایەندا دەبێت، وەك ئەوەی بڵێیت: نوێژ خێرتر و باشترە لە نووستن، بەڵام ئەو ناوی تەفزیلانەی بەبێ مەفزوڵ دێن (واتە لە نێوان دوو لایەندا نییە) ئەوە لە ڕەوانبێژییەوەیە بەشێوەیەك فەزڵدراوەکە لە هەر شتێکی غەیری خۆی باشتر و فەزڵدار تر بێت، ئەمەش بە (استدعاء التفاضل) وەسف دەکرێت، بەڵکو ڕێگە بۆ هەوڵدان بۆ فەزڵدان خۆش دەکات، وەك متمانەبوون بە باشترینبوون ڕێبازی یەکتاپەرستی، هەروەها بۆ هەماهەنگی لەگەڵ ئەرکی بانگخواز، لە بەدیهێنانی جیهانێتی گوتاری قورئانی، کە بە بەتاڵکردنەوەی بانگەشەی سەرانی کوفر و شوێنکەوتوانی گومڕایی دێتە دی، هەروەها بە دانانیان لە چوارچێوەی بانگەشە و گوتارەکەیدا.

بە گەڕانەوە بۆ سەرەتا، هەر لە چوارچێوەی خاڵی پەیوەست بە جیهانیبوونی گوتار، دوو خاڵ دێن، کە کارایی و جموجوڵ دەبەخشن بە چاکترینبوون (الأقومية)، ئەو دوو خاڵەش بریتین لە:

١. بوونی دوو لایەن یان دوو ڕوو بۆ باوەڕ و کوفر، کە سێهەمیان نییە، کە دوای ئەنجامدانی خوێندنەوەیەکی تێڕامانانە بۆ گوتاری قورئانی دەردەکەون، ئەو دوو ڕووەش بریتین لە:

أ. بێباوەڕبوون بە تاغووت و باوەڕبوون بە الله، ئەوەش ڕاستەڕێیەك و بەردەوامبوونێکە لەسەری کە خوای گەورە ئەنجام و چاکیی پاداشتەکەی ڕوون کردووەتەوە.

ب. هەروەها بێباوەڕبوون بە الله و باوەڕهێنان بە تاغووت. ئەم لادانەش قورئان، لە چوارچێوەی ئایەتەکانی زۆرنەکردن (اللاإكراه)دا تەرازووی خۆبەباشترین زانین و باشترینبوون (التقاوم والأقومية)ی لەنێوانیاندا بە دیاریکردنی سەرەنجام و ئاکامەکەیان ڕوون کردووەتەوە، هەروەها لایەنەکانی کەموکورتیی تێدا ڕوون کردووەتەوە کە بریتییە لە گێلیی دڵەکان و داخرانیان بەو قوفڵەی کە لەسەریانە، مامەڵەکردنیش لەگەڵ ئەم مەسەلەیە پێویستیی بە ماندووبوونی زۆر نییە لە لایەن بانگخوازان و بەرگریکاران لە ئیسلام و ڕێباز و پێغەمبەر و ئوممەتەکەی، چونکە خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە و لە تەرازووی (التقاوم والمقاومة)دا دایناوە، بە شێوەیەك وای لێبکات کە لە پاداشتەکەیان، بەڵکو لە نموونەنەکانیان، چەند پێشینەیەکی شەرعی و بنچینەی فکری و نموونەی مەنهەجی لە بواری (الأقومية)دا دروست بکات.

٢. خاڵی دووەم پەیوەستە بە ئەنجامی خوێندنەوەی تێڕامانانە لە لایەن ئەو کەسانەی کە بانگهێشت کراون بۆی، کە ئەنجامەکەی بەرهەمی باوەڕبوون بە (الله) نەدات بەدەستەوە، وای لێنەکات کە تەسلیمی ئەوە ببێت کە ڕێبازی یەکخواناسی ڕاستە ڕێبازێکە، کە قورئانی پیرۆز هێناویەتی، لەو کاتەدا شتێکی سروشتی دەبێت بڕوبیانوو بۆ بەدینەهاتنی باوەڕەکەیان بهێننەوە، هەروەها شتێکی سروشتییە کە لەژێر چەند بڕوبیانوویەکدا بەهانە بۆ وەڵامنەدانەوەکەیان

بهێننەوە، بەهانەگەلێك كە ئەوان بە عەقڵانیەت وەسفی دەكەن، یاخود دەڵێن شوێنكەوتنی ڕێبازی باووباپیررانمانە وەك ئەمەكدارییەك بۆیان، ئەمانەشیان وەك یاخیبوونێكە لە پەروەردگاریان، ئەمەش بەبێ گومان جیابوونەوەیە لە ڕاستەڕێیی، بەرەو هەڵدێر و لادان و گێلێتی ڕۆیشتنە، بنەماكانی مامەڵەكردنیش لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا لەلایەن ڕێبازی یەكخواناسییەوە دیاری كراون، بۆ هەڵگرانی مەشخەڵی بانگخوازی، هەروەك چۆن بنچینەكانی بنیاتنانی گفتوگۆی دارِشتووە، بە ئامانجی چوونە نێو تەرازووی (التقاوم والمقاومة) پێكەوە، بۆ هەر كەسێك كە لە دوای خوێندنەوە تێڕامانییەكەشی ئیمانی نەهێنابێت و چووبێتە نێو بازنەی "زۆركردن لە ئاییندا نییە" (االلا إكراه في الدين).

**چوارەم:** زۆرنەكردن و دیسپلینەكانی گفتوگۆی ئاشتییانە و سنوورەكانی (اللاإكراه وضوابط الحوار السلاميّة وحدوده): زۆرنەكردن بنەمایەكی بنچینەییە لە بانگەوازدا، زۆرنەكردن چەمكێكی قورئانییە و سنووری خۆی هەیە لە گوتاری قورئانیدا، كە لەسەر چەندین بەڵگە بنیات دەنرێت، لەوانە ئەم ئایەتە پرۆزانە: (لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَّشَاءُ...)، (واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیدایەت و ڕێنموویی و موسوڵمان كردنی ئەو خەڵكە لەسەر تۆ نییە (چونكە تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەكەت لەسەرە) بەڵام خوا هیدایەت و ڕێنموویی هەر كەسێكی بوێت دەكات، (بە مەرجێك ئەو كەسەش ڕووی دڵی بكاتە ئیمان)، (البقرة: ٢٧٢)، هەروەها (وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكُوا وَمَا جَعَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ)، (واتە: خۆ ئەگەر پەروەردگارت (بیویستایە و شایستە بوونایە هیدایەتی دەدان) هاوەڵگەر نەدەبوون، خۆ ئێمە تۆمان نەكردووەتە چاودێر بەسەر ئەوانەوە و تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نییە (تا بە زۆر هیدایەتیان بەسەردا بسەپێنیت)، (الأنعام: ١٠٧).

مەرجی داننانی بانگخوازان بە بنەمای (زۆرنەکردن)دا مافێکی سەپێنراوە —بۆ ئەوانەی کە بانگکراون و باوەڕیان نەهێناوە— کە "دوای بەجێهێنانی تەواوی ڕاگەیاندن (البیان) و ڕوونکردنەوەی (التبیین) کامڵ بێت"، بەرجەستەکردنی ڕاگەیاندنیش بە خوێندنەوە دەبێت، ڕوونکردنەوەش بە دیاریکردنی چارەنووسی ئەوەی کە خوێندنەوە لەسەر دڵی مرۆڤ جێی دەهێڵێت، ئەویش یەکێك لەو دوو ڕێگەیە هەڵ دەبژێرێت: ڕێگای ڕێنمووی و سەرفرازی، یان ڕێگای سەرلێشێواوی و گومڕایی، هەروەها ئاکامەکەشی بۆ ڕوون دەبێتەوە، جا ڕووناکی دەبێت، یان تاریکی، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّـهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّـهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)، (واتە: بە هیچ جۆرێك زۆر کردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بە زۆر نابێت بکرێت و دین بە زۆر نادرێت بەسەر کەسدا)، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاك و دروست، ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابووەتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغووت ـ (کە بریتییە لە: هەموو ڕێگە و ڕێباز و هێز و بەرنامە و لادان و بتێك)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە خوا، جا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەر و زانایە)، (البقرة: ٢٥٦)، کەواتە هەڵبژاردنەکە دوای ئەوە دێت کە لێکۆڵینەوە لە ڕاگەیاندنەکە (البیان)دا دەکات: ئیقرارکردنی بەرپرسیارێتی لەسەر کردار لە چوارچێوەی تەکلیفدا، و ئیقرارکردنی باشترینبوونی (أقومیة)ی هیدایەتی قورئانی پیرۆز و پەیوەستبوونیان و بەهانەهێنانەوەیان بۆ مافی هەڵبژاردن و لێپرسینەوە لەسەری، ئەم ئایەتە پیرۆزە پشتگیریی دەکات و ڕوونی دەکاتەوە: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي

لِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ)، (واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی حەق و ڕاستیتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەوەی ڕێبازی هیدایەتی وەرگرتبێت ئەوە سوودی بۆ خۆیەتی، ئەوەش گومڕا بووبێت و ڕێی ون کردبێت، ئەوە گومڕاییەکەی لەسەر خۆی دەکەوێت و من لێپرسراو و چاودێر نیم بەسەر کار و کردەوەی ئێوەوە) (یونس: ١٠٨).

هەرچی ئاشتیبوونی گوتاریشە (السلاميّة الخطابيّة)، مەسەلەیەکە کە بنیاتنانی گوتاری بانگەوازی تێدا ڕەچاودەکرێت، کە وتەی ئاشتی (قول السلام) وەسف کراوە، کە لەسەر تایبەتمەندییەکانی پەیامەکە، و تایبەتمەندییەکانی بانگەوازەکەی و زۆرنەکردن و باشترینبوون و جیهانیبوون پێکەوە بنات نراوە. بۆیە ئاشتیبوون (السلاميّة) دەبێتە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بەندەکانی خوای بەبەزەی و میهرەبان، تەنانەت لە کاتی ڕەتکردنەوەی بانگکراو بۆ گوتاری بانگەوازەکەدا و سووکسەیرکردنیان و گاڵتەکردنیان بە بانگخوازان، لە نەزانی و لادانی خۆیانەوە، ئەمەش دوای ئەوەی بنەمای زۆرنەکردن دەخرێتە گەڕ و کارا نابێت و ئەنجامەکەی دەبێتە ڕەتکردنەوەی بانگەوازەکە و ئەوەی کە بانگکراوەکان دەچنە چوارچێوەی ئاشتییانەبوونی گوتارەوە، دوای ئەوەی بە زیادەڕەوی و ستەمی خۆیان هەڵبژاردنەکەیان ئەنجام دا و بانگەوازەکەیان ڕەتکردەوەو چوونە بۆسەوە بۆ گاڵتەکردن بە بانگخوازان، ئەمەش قۆناغێکە ڕێگە بۆ پێکدادانی ماددی خۆش دەکات، ئەگەر زیاد بکات و دووبارە ببێتەوە، بنەمای ئاشییانەبوونیش لەسەر ئەم ئایەتە بنیات نراوە: (وَعِبَادُ الرَّحمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَونًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الجَاهِلُونَ قَالُوا سَلامًا)، (واتە: بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسە و قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا

دەڵێن: سڵاو (ڕەوشتبەرزی خۆیان دەنوێنن) (الفرقان: ٦٣)، ئەمەش گرەنتیی مانەوەی خەڵكانی تر لە بارێكی ئاشتی دەكات، ئەو ئاشتییەش ڕێگە بە بەردەوامبوونی گوتارەكەیان بۆ بانگەوازكردن بۆ ڕاستی دەدات، ئەو گوتارەی كە بەردەوام لە نوێبوونەوەدایە، هەروەها دەبێتە ئەستۆپاكی، بۆ ئەوانەی كە پێویستە بانگەواز بكەن و لە هەمان كاتدا جەختكردنەوەیەكیشە لەسەر ڕەحمەتی گوتارەكەو ئەو مەبەستانەی كە لە ئایین و تایبەتمەندییەكانی پەیامەكەی و لە زۆرنەكردن، وەردەگیرێن، بەو وەسفەی شێوازی پەیوەندییكردن بە خەڵكانی تری غەیری موسڵمانەوە دیاریی دەكەن.

لە دیسپلینەكانی گفتوگۆ (الحوار) و سنوورەكانی، كە لە چوارچێوەی ئاشتییانەبووندا دەخولێنەوە، ئەوەیە كە پەیوەستە بە گوتاری موسڵمانان و بانگخوازانەوە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە، (وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ مَرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)، (واتە: (ئەی ئیمانداران) نەكەن جوێن بدەن بەو بت و شتانەی كە (نەفامان) هاواری لێدەكەن و دەیپەرستن بێجگە لە خوا، نەوەكو ئەوانیش بە ناحەق و بە نەفامی جوێن بدەن بە خوا، (چونكە ئەوانە) نایناسن و قەدری نازانن، ئا بەو شێوەیە ئێمە بۆ هەر گەل و ئوممەتێك كردەوەكەیانمان ڕازاندۆتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەیان هەر بۆ لای پەروەردگاریانە، ئەوسا ئاگاداریان دەكاتەوە بەو كاروكردەوانەی كە دەیانكرد) (الأنعام:١٠٨)، لەو دیسپلینانەش كە پەیوەندیی بە گوتاری سەرپێچیكارانەوە هەیە ئەم ئایەتە پیرۆزە دیاریی دەكات: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا)، (واتە: بەڕاستی (خوای گەورە) لە قورئاندا ئەم بڕیارەی ناردووە بۆ سەرتان كە: هەر كاتێك لە جێیەكدا گوێتان لێ

بوو کوفر و گاڵته بەئایەتەکانی خوا دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسەو باسەکەیان بگۆڕن (ئەگەر دابنیشن و گوێ نەدەنێ) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەك ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا دووڕووەکان و بێ باوەڕەکان هەموویان لە دۆزەخدا کۆدەکاتەوە) (النساء:١٤٠).

**پێنجەم:** بەها گشتییەکان، و مەبەستەکانی خیلافەت (القیم الكلية، ومقاصد الخلافة): بەها گشتییەکان ڕەهەندگەلێکی بەهایین کە گوتاری قورئانی لەخۆی گرتوون، کە بۆ ئەوە شیاون ببن بە بوارگەلێکی چەمکەکان، کە ڕەنگە هیچ شتێك لە بازنەی دەرنەچێت لەو شتانەی کە پەیوەستن بە جێنشینکردنی مرۆڤەوە لە زەویدا، یان پەیوەستن بە کرداری مرۆڤەوە لە ژیاندا، هەر بۆیە بەهاکان بە حاکم و بڕیاردەری شتەکانی پێشوو دانراوە، لەوەدا کە بنچینەی مەنزومەی مەبەستەکان دادەڕێژێت، کە شەریعەی ئیسلامی دایناوە: کە لە: یەکخواپەرستی، تەزکیە و پاکڕاگرتنی دەروون و ئاوەدانکردنەوەدا کورت هەڵدێن.[٩٧] یەکخواپەرستی پێگەی بناغەداڕێژەری ئەو مەنزومەیەی هەیە —کە ڕەهەندی بەهایی و ڕەهەندی مەبەستەکان پێکەوە گرێ دەدات— بەمەش یەکخواپەرستی دەبێتە دایك و پێشەوای بەهاکان، چونکە هەر لە هەستکردنەوە دەستپێدەکات تا ئەو کاریگەرییەی کە کردەوەی مرۆڤ ڕێك دەخات، لە بازنەی تەکلیف و بەرپرسیارێتیدا، بە شێوەیەك کە بیروباوەڕ و نییەتەکان و کردەوە پێکەوە گرێبدات.

---

(٩٧) د.طه جابر العلواني، التوحيد والتزكية والعمران، محاولات في الكشف عن القيم والمقاصد القرآنية الحاكمة، ط١، دار الهادي، بيروت: ١٤٢٤هـ/٢٠٠٣م. وينظر: مصطفى جابر العلواني، القيم السياسية العالمية في الخطاب القرآني، مدخل منهاجي لدراسة العلاقات الدولية، دراسة تحليلية مقارنة، رسالة دكتوراه، جامعة أمدرمان الإسلامية، ٢٠٠٨م، ص١٣.

کەواتە ئەو مەنزومەیەیە کە پێودانگێك دێنێتە ئاراوە کە کردەوەی وەرگیراوی مرۆڤی پێ بپێورێت لە چوارچێوەی جێنشینیدا لەسەر زەوی، ئەو کردەوەیەی کە بەسەر سێ ئاراستەدا دابەش دەبێت: کردەوەی یەکخواناسیی تایبەت بە حەقیقەتی ئیلاهی، کردەوەی تەزکییە و پاککردنەوەی دەرونیی تایبەت بە دەروونی مرۆڤ و کۆمەڵگەکەی و کردەوەی ئاوەدانیی تایبەت بە ژینگە و شوێنی حەوانەوەی مرۆڤ.

کەواتە یەکخواناسی و مەنزومە بەهایی و مەبەستییەکانی، وەڵامی جێگیری سێ پرسیاری فەلسەفی فەراهەم دەکەن: لە کوێوە هاتووین؟ بۆچی هاتووین؟ چارەنووسمان بۆ کوێیە؟

**شەشەم:** تایبەتمەندییەکانی شەریعەتی ئیسلامی و مەبەستەکانی:

لەو مەسەلانەی کە پەیوەندیی هەیە بە بنچینەکانی فکری سیاسیی ئیسلامی بۆ بنیاتنانی ستراتیژییەتی وەڵامدانەوەی ڕۆژهەڵاتناسان و غەیری ئەوانیش، بریتییە لە جەختکردنەوە لە تایبەتمەندییەکانی شەریعەتی ئیسلامی و مەبەستەکانی، بە شێوەیەك کە بتوانرێت چەند مەسەلەیەك دەربخرێت: نەمریی ئیسلام و گونجان و شیاویی بۆ جێبەجێکردن لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا.

سەبارەت بە شیاویی ئیسلام: لە ڕووی ڕێباز و شەریعەت و بنەماوە، بۆ هەموو سەردەم وشوێنێك، جیهانێتی ئیسلام دەسەلمێنێت، بەمەش ئیسلام دەبێتە خاوەن ئەرکێکی جیهانیی ژیاریی کە ئەدای بکات، لەوانە باسکردنی گەواهییەکانی ڕاستێتیی جیهانیبوونی ئیسلام، کە نیگا: لە ڕێگەی قورئان و سوننەتەوە داویەتی، ئەمە جگە لە گەواهیی مێژوو و گەواهیی خاوەن ویژداندروستەکان لە غەیری موسڵمانان داویانە لەسەر ڕەسەنیی شەریعەی ئیسلامی و زیندوویەتییەکەی، پێشینبوونی لە باسکردن و چارەسەرکردنی مەسەلە مرۆییە نوێیەکان، کە ئەم تایبەتمەندییە بەدی دەهێنن: ڕەببانیبوون،

مرۆییبوونی جیهانی، دادگەریی ڕەها، هاوسەنگییکردن لە نێوان تاك و کۆمەڵدا، گونجاندنی جێگیری و نەرمی پێکەوە (الثبات والمرونة). [٩٨]

هەرچی مەبەستەکانی شەریعەشە، ئەوا زانایان بەمانە دیارییان کردووە: پاراستنی ئایین، نەفس، عەقڵ، ماڵ سامان و وەچە، وەك ئەوەی کە شەریعەتی ئیسلامی و ئەحکامەکانی لە بازنەی ئەو مەبەستانە دەرناچێت، کە بە دەرەنجامی ئەو بەها گشتییانە دادەنرێن، کە جێنشینیی مرۆڤ لەسەر زەوی دەیهێنێتە بوون، بۆ ئەوەی ببن بە وێستگەیەکی فکریی بنچینەدارێژ بۆ توێژینەوە لە بابەتگەلێکی زۆر، کە پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەیەو لە مەسەلەکانیسشییەوە دەستپێدەکەن، لەوانەش: لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و بنیاتنانی ستراتیژییەتی وەڵامدانەوەیان. [٩٩]

**حەوتەم:** ڕەچاوکردنی ڕەهەندی بەهایی پەیوەندییەکان: پەیوەندییە مرۆییەکان بە مەزومەیەکی بەهاییەوە دەبەسترێنەوە، کە جێنشینی مرۆڤ لەسەر زەوی دیاریی دەکات، ڕەگو ڕیشەکەشی لە قورئاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە: (فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ)، (واتە: شەیتان (فرسەتی لێهێنان) و لە خشتەی بردن (وای لێکردن لە بەروبوومی درەختە قەدەغەکراوەکە

---

([٩٨]) القرضاويّ، يوسف. شريعة الإسلام: خلودها، وصلاحها للتطبيق في كلِّ زمان ومكان، بيروت ودمشق: المكتب الإسلامي، ط٤، ١٤٠٧هـ/١٩٨٧م.

([٩٩]) ينظر" العالم، يوسف حامد. المقاصد العامّة للشريعة الإسلاميّة، فرجينيا- الرياض: الدار العالميّة للكتاب الإسلاميّ، المعهد العالميّ للفكر الإسلاميّ، ط٢، ١٤١٥ه/١٩٩٤م. هەروەها بگەڕێرەوە بۆ نووسینەکانی مامۆستا و سەرپەرشتیاری لێکۆڵینەوە پسپۆڕییەکەم: أ.د. سيف الدين عبد الفتاح إسماعيل، ومنها: إسماعيل، سيف الدين عبد الفتاح. العلاقات الدوليّة في الإسلام: مدخل القيم: إطار مرجعيّ لدراسة العلاقات الدوليّة في الإسلام، القاهرة: المعهد العالميّ للفكر الإسلاميّ، ط١، ١٤١٩ه/١٩٩٩م.

بخۆن) و لەو شوێنە (خۆش و پڕ لە نازو نیعمەتە) بەدەرکردنی دان، ئەوسا پێمان وتن: (مادەم سەرپێچیتان کرد ئیتر لێرە جێتان نابێتەوە)، دەبێت دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، جا (لەوێ) هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شەیتان دوژمنی ئێوەیە و بەردەوام هەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوانتاندا بەرپا بکات)، تا ماوەیەکی دیاریکراو نیشتەجێ دەبن لە زەویداو لە نازو نیعمەتەکان سوود وەردەگرن و بەهرەوەر دەبن)، (البقرة: ٣٦)، هەروەها ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)، (واتە: ئینجا وتمان: هەمووتان دەبێ دابەزن (بۆ سەر زەوی) جا ئەگەر هەرکاتێك لە لایەن منەوە ڕێنومایيتان بۆهات، هەرکەس شوێن ڕێنوومایی من بکەوێت، ئەوە نە ترس و بیمیان لەسەر دەبێت، نە غەمگین و دڵتەنگ دەبن)، (البقرة: ٣٨)، لێرەوە مەنزومەی بەهاکانی پەیوەندییە مرۆییەکان خۆی لە جێگیری و تەمەتتوعکردن و ئیستیقامة (الاستقرار، والاستمتاع، الاستقامة)دا خۆی دەبینێتەوە.

لێرەشەوە توێژینەوە لەسەر ڕاگەیاندنی شیاوبوونی، بۆ دیسپلینکردنی کرداری مرۆڤ، لە چوارچێوەی جێنشینیی مرۆڤ لەسەر زەوی، مەشهەدی دابەزینی مرۆیی بۆ سەر زەوی دەری دەخات، بەمەش ژیانی کارلێککگوزاریی نێوان خەڵك، لە چوارچێوەی ئەو بەهایانەدا، دەسوڕێن و پێشیان ڕێك دەخرێن.

بەمەش، ژیان لە بازنەی بێهودەیی دەردەچێت، بەرەو بازنەی کردەوەی بونیاتنەری بەرپرسیارانە، تا گەیشتن بەو جێگیریی سەلامەتی و خۆشبەختیەی، کە پلەبەرزیی تەزکییە و ئاوەدانکردنەوە بەرهەم دەهێنێت، بەو شێوەیەی کە یەکخواپەرستی ڕێبازی جێنشینی دیاریی دەکەن، ئەوەی کە نیگا: بە قورئان و سوننەتەوە، هێناویەتی.

# کۆتایی

سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، دروود و سەلام بۆ سەر گیانی سەروەرمان موحەممەد و هەموو ئەهل و یاوەرانی، پاشان:

ئیسلام لە دێر زەمانەوە دوچاری چەندین تەحددیی سەخت بووەتەوە، هەندێکیان لە شێوەی گومانی مەبەستداردا بوون، یان بەهۆی خراپ تێگەیشتن، یاخود کەمیی تێڕامانەوە بوون، ئەمەش پاڵمان پێوە دەنێت بە ئاراستەی بەدواداچوونی سەرچاوەکانی، بەتایبەت نیگا: بە قورئان و سوننەتەوە، ڕێنموویی وەرگرتن لێیان، بە شێوەیەك كە تێگەیشتنێكی ڕاستمان بۆ ڕێبازی یەكتاپەرستی پێ بدەن، ئەو ڕێبازەی كە نیگا هێناویەتی، هەروەها بە شێوەیەك بێت كە ببێتە شارەزاییەك بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو گومان و خراپتێگەیشتن و كەموكووڕییانە، دواتر دەرمانبهێنێت لەو شتانەی كە ڕەخنەی پێ دەگرین لە ڕۆژهەڵاتناسان، لە نەزانینی نیگا و جیهانی پەنهان و شاراوە، ئەمەش –دواتر– دیارترین فاکتەرەكانی بنیاتنانی ستراتیژییەتی بەرپەرچدانەوەیان فەراهەم دەكات، لە هەموو ئەو شتە پەیوەندیدارانەی كە بەشدار دەبن لە بونیاتنانیدا، تەنها ئەوە نەبێت كە پەیوەندیی بە تێگەیشتنی واقیعەوە هەیە، هەروەها ئەوەی كە پەیوەندیی بە دابەزاندنی ئەو مەسەلانەی كە لە نیگاوە وەرگیران بەسەر واقیعدا، ئەو واقیعەی كە قورئان و سوننەت فەرمانمان پێ دەكەن كە خوێندنەوەی بۆ بكەین، چونكە كاری بەرپرسیارانەی مرۆڤ لە چوارچێوەی چاكسازیدا پشت بەو واقیعە دەبەستێت، بەو وەسفەی كە ئەم كارە یەكەمین ئەركە لە جێنشینیی مرۆڤدا لەسەر زەوی.

ڕۆژهەڵاتناسان لەو هەڵوێستەیاندا بە تەنها نین، بەڵكو هەموو ئەوانەی كە هاوچەرخی ئیسلام بوون هەر لەسەرەتایەوە و تا ئەوكاتەشی كە خوای گەورە

زەوی و هەموو ئەوەشی کە لەسەریەتی دەکاتە میراتی باوەڕداران ڕووبەڕووی ئیسلام بوونەتەوە، چونکە ئیسلام بە غەریبی سەری هەڵداو بە غەریبیش دەگەڕێتەوە.

بەرپەرچدانەوەی ڕۆژهەڵاتناسیش وا دەخوازێت کە جەخت بکەینەوە لەسەر چەند مەسەلەیەك، دیارترینیان: دیاریکردنی پاڵنەرەکانی، ڕوونکردنەوەی ڕەگوڕیشە جولەکەیی و گاوری و عەلمانییەکەی، ئەمەش ستراتیژییەتەکانیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئیسلامدا ئاشکرا دەکات، هەروەك چۆن تەکتیك و کارە وردەکانیان لەو چوارچێوەیەدا ئاشکرا دەکات، بەهۆی ئەوەی ئەوان خاوەن پەڕاون هەوڵی ئاراستەکردنی گوتاری بانگەواز بۆیان سوومەند دەبێت، ئەویش بە هەڵبژاردنی چەند مەسەلەیەك لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەکرێت باوەڕ بهێنن لەو مەسەلانەی کە نیگا گرنگییەکەی ڕوونکردووەتەوە، لەوانە:

بانگکردنیان بۆ وتەیەکی هاوبەش و هاوسەنگ (كلمة سواء)، وتەیەك کە لەسەر یەکخواپەرستی و تەنها بۆخوابوون بنیاتنراوە، بەو شێوەیەی کە سەرچاوەکانیان پێش شێواندنیان لەخۆی گرتووە، بانگکردن بۆ وتەیەکی هاوبەش و هاسەنگ هەڵوێستێکی ناوەند لە جەدەلەکە ئاشکرا دەکات، کە ڕەچاوی فاکتەرەکانی هاوبەشبوون دەکات، پرۆسەی گفتوگۆ لە مەسەلەکانی پێکداداندا دەست پێدەکات، بۆ وەڵامدانەوەو بەرپەرچدانەوەی ئەو شتانەی کە لە سنووری تەندروستی لایانداوە و وتەی یەکلاکەرەوە لەو مەسەلانەدا لە ڕێبازی یەکخواناسییەو دەخرێتە ڕوو، ئەو ڕێبازەی کە سنوورەکانی وتەی هاوبەش و هاوسەنگی داڕشتووە و هەموو ئەوانەش لادەبات کە لەو وتەیە دەردەچن، ئەمەش وا لە توێژەر دەخوازێت کە لە مەسەلەکانی ڕۆژهەڵاتناسیدا سەیری ئەو شتانە بکات کە لە کتێبە پیرۆزەکانیاندا هەیە، هەروەها وردبێتەوە لەوەی کە وتوویانە، لەوەی کە ڕێبازی ڕاست و دروست قبووڵی دەکات.

جەختکردنەوە لە مەسەلەی بەڕاستدانانی قورئان بۆ تەورات و ئینجیل، ئەمەش یەکێتیی دابەزێنراوەکان و سەرچاوەکەشیان ئاشکرا دەکات، جگە لەوەی ڕاستێتیی قورئانی پیرۆز خۆی ئاشکرا دەکات، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَآمِنُوا بِمَا أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ)، (واتە: هەروەها ئیمان بهێنن بەو قورئانەی کە ناردومەتە خوارەوە کە پاڵپشتی پەیامەکەی لای ئێوەیە (تەورات و ئینجیلی دەستکاری نەکراو)، (البقرة: ٤١)، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە باوەڕهێنانیان بە قورئان هاوکات دەبێت لەگەڵ دۆزینەوەی ئەوان بۆ ئەوەی کە قورئان پەڕاوەکەی ئەوانی بەڕاست داناوە.

جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە لە میانەی (الأعراف: ١٥٥–١٥٧)دا هاتووە، لە مەسەلەی ڕەحمەت و لابردنی ئەرکە قورسەکان و کۆت و زنجیرەکان لەسەریان (وەك خۆکوشتن لە کاتی تەوبەدا..)، ئەمانەش مەسەلەگەلێك بوون کە بەنو ئیسرائیل بەتاسەوە بوون بۆی و جگە لە قورئان هیچ شتێکی تریش بۆی بەدی نەهێنان.

جەختکردنەوە لە پاراستنی قورئانی پیرۆز و شێواندنی هەموو دابەزێنراوەکانی پێشووی، جا لە چوارچێوەی ڕاگەیاندن و بانگەوازی بەراوردکارانەدا بێت، یاخود لە چوارچێوەی ئیعجاز دەسەوسانکردن و تەحەددیدا بێت.

لە نێو ئەو شتانەشی کە ڕێگە بە حیوارکردن دەدەن لەگەڵیاندا، بەڵکو داوای هەوڵدانیشی بۆ دەکەن، بریتییە لە مەسەلەی چاکتریبوون (الأقومية)، کە جەخت دەکاتەوە لە: پێویستیی دەستپێکردن لە قورئانی پیرۆزەوە، جەخت لەسەر حەتمییەتی باڵایەتیی تێدا دەکاتەوە بە تەرجیحکردنی ئەوەی کە ڕێنموویی دەکات بۆ ئەوەی کە باشترینە، بەمەش ئەوەی کە لە غەیری ئەوەیە – جا سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت– مەرجوحە.

کەواتە ئێمە لەبەردەم ستراتیژییەتێکداین کە بەرگریکردن و بەرپەرچدانەوە و وەڵامدانەوە (الدفاع والتصدي والرد) تێدەپەڕێنێت، تا دەگاتە بنیاتنانی گوتارێکی بانگەوازکاریی مرۆیی بنیاتنراو لەسەر گوتاری قورئان و سوننەت، ئەمەش وا دەخوازێت کە ڕەچاوی توێژینەوە لە چەند مەسەلەیەکی سەرنجڕاکێش بکرێت —کە سەرنجی مەعریفییانەی بانگکراوەکان ڕابکێشێت— وەك:

١. ڕەهەندی مەبەستی (البعد المقاصدي): چونکە قورئانی پیرۆز و ئیسلام چەندین مەبەستی باڵای هەیە.

٢. ڕەهەندی بەهایی (البعد القيمي): بەو وەسفەی قورئان ڕێکخەری کردەوە مرۆییەکانە.

٣. ڕەهەندی جیهانی (البعد العالمي): بەو وەسفەی قورئان گوتارێکە ئاراستەی هەموو جیهانیان کراوە.

٤. ڕەهەندی تەشریعی موحکەم و دانا (البعد التشريعي المحكم الحكيم): بەو وەسفەی قورئان گوزارشتە لە ویستی شەرعیی ئیلاهیی، لە چوارچێوەی ئەوەی کە لەگەڵ ویستی کەونیدا دەگونجێت.

٥. هەروەها ڕەهەندی ڕێنموویی (البعد الإرشادي): بەو وەسفەی قورئانی پیرۆز ناوەرۆکێکی فێرکارییانەی پەروەردەییە.

پێویستە موسڵمانانیش ـ کە ئوممەتن ـ مامەڵ لەگەڵ بابەتی ڕۆژهەڵاتناسی و هاوشێوەکانی لە چوارچێوەی سێ ڕەهەنددا بکەن:

**یەکەم:** ڕەهەندی چاکەکاریی ئوممەت (البعد الخيريّ للأمة) و دەستپێکردن لەو خاڵەوە بۆ بانگکردنیان بۆ موسڵمان بوون.

**دووەم:** ڕەهەندی وەسەتیبوون (البعد الوسطي): بە بەدیهێنانی ئامادەیی ژیاری، بۆ تێگەیشتنی واقیعی ڕۆژئاوا و تایبەتمەندی و ئێش و ئازارەکانی.

**سێیەم:** ڕەهەندی جیهانی (البعد العالمي)، بۆ تێگەیشتن لە هاوبەشەکانمان لە: جێگیری و ئارامی و ئیستیمتاع، و ئیستیقامە (الاستقرار، والاستمتاع، والاستقامة).

ئەمەش —لەگەڵ ئەوەی کە باسمان کرد— لە مشتومڕ لەچوارچێوەی کردار و پەرچەکردار دەرمان دەهێنێت، بەشێوەیەك کە فیکر لە مەسەلە لاوەکی و بەشەکییەکاندا کورت هەڵدێنێت و بیٚ ئاگایان دەکات لە شتە گشتی و سەرەکی و گرنگەکان.

**سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لە سەرەتا و کۆتاییدا.**



# دیاردەی قورئانی... ئیعجاز و پەیام


نەشئەت غەفوور

سەرۆکی ناوەندی کوردستان

بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا

**بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان**

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درووود و سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران.

(إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً) (الإسراء: ٩).

## گەورەیی قورئان:

مامۆستا موحەممەد عەفیفی لە پەڕاوی (القرآن تفسير الكون والحياة)، لاپەڕە ٤٤دا دەڵێت: (ژیرەکانی دونیا بەڕاستی سەرسامن لەوەی کە چۆن لە دنیای خەڵکیدا قورئان هەیە و نایکەنە رووگەی خۆیان، تا باشتر لە ژیان تێبگەن و بتوانن تەفسیری ژیان بکەن و لە راستیی شارەزا بێن و کاری پێ بکەن).

## دیاردەی قورئانی:

زانایانی تەفسیر و فەرموودە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە پێنج ئایەتی یەکەمی سوورەتی (العلق) یەکەم جار دابەزیوەتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە کە خاتوو عائیشە فەرموویەتی: (أول ما بدئ به رسول الله ﷺ من الوحي الرؤيا الصادقة في النوم، فكان لايرى رؤيا إلا جاءت مثل فلق الصبح، ثم حبب إليه الخلاء، وكان يخلو بغار حراء فيتحنث فيه –وهو التعبد– الليالي ذوات العدد، قبل أن ينزع إلى أهله، ويتزود إلى ذلك، ثم يرجع إلى خديجة فيتزود لمثلها، حتى جاءه الحق وهو في غار حراء، فجاءه الملك فقال: إقرأ، قال: ما أنا بقارئ، فأخذني فغطني الثانية حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني فقال: إقرأ، فقلت ما أنا بقارئ، فأخذني فغطني الثالثة ثم قال: – (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ

الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) (العلق: ١– ٥)، واته: (سەرەتای وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ بە بینینی خەوی راست دەستی پێکرد، هەر خەوێکی دەدی کتومت ئەهاتە دی، ئینجا تەنهایی و خەڵوەتی لا خۆشەویست کرا، دەچوو لە ئەشکەوت بە چەند شەو دەمایەوە و پەرستشی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە و توێشووی دەبرد و ئەوەندەی تر دەمایەوە، تا ئەو کاتەی هەقی بۆ هات لە ئەشکەوتی حەڕڕادا، جوبرەئیل هاتە لای فەرمووی: بخوێنە، فەرمووی: من خوێندەوار نیم، جوبرەئیل، پێغەمبەر ﷺ دەگوشیێ و ماندووی دەکات و ئینجا بەری دەدات و دەفەرموێ: بخوێنە، دەفەرموێ: من خوێندەوار نیم، ئینجا کە سێیەم جار دەیگوشێ بە خۆیەوە، بەری دەدات و دەفەرموێت: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ...).

پێغەمبەر ﷺ بە ترس و لەرزەوە گەڕایەوەماڵەوە، بە خەدیجەی فەرموو: دامپۆشن، دامپۆشن، دایانپۆشی تا هێور بووەوە. ئینجا فەرمووی: خەدیجە ئەوە چییە؟ مەسەلەکەی گێڕایەوە و فەرمووی: (ترسام تووشی بەڵایەك بووبم) فەرمووی: نەخێر مەترسە، دڵخۆشبە، بەخوا هەرگیز خوا تووشی شکستت ناکات، تۆ خزمایەتی دەفامیت، راستگۆیت، یارمەتیی داماو و لێقەوماو دەدەیت، ڕێز لە میوان دەگری، بە هانای بێنەوایانەوە دەچیت، ئینجا خەدیجە بردی بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی ئامۆزای ، کە لە زەمانی نەفامیدا بووبووە گاور، بە عەرەبی دەینووسی و بە عیبرانیش لە ئینجیلی نووسیبووەوە، پیاوێکی پیر بوو، کوێر بووبوو.

خەدیجە پێی وت: ئامۆزا، گوێ لە برازاکەت بگرە، وەرەقە وتی: فەرموو برازام چیت دیوە؟

پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بەسەری هاتبوو بۆی گێڕایەوە.

وەرەقە وتی: ئەمە ئەو نیگایەیە کە بۆ موسا نێردراوە، خۆزگە گەنج و بەتوانا بوومایە، خۆزگە لە ژیاندا دەبووم کاتێك قەومەکەت دەریان دەکردی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی دەرم دەکەن؟

وەرەقە وتی: بەڵێ، هەرکەسێ ئەوەی تۆی هێنابێ دوژمنایەتی کراوە، ئەگەر گەیشتمە ئەو زەمانە پشتت دەگرم و سەرتدەخەم.

پاش ماوەیەکی کەم لەم وتووێژە، وەرەقە کۆچی دوایی کرد.

ئەم فەرموودەیە لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە فەرموودەی زوهرییەوە[1].

ئەم بەسەرهاتە لە پەڕاوەکانی فەرموودە و تەفسیردا هاتووە بە شێوازی جیاواز، بەڵام هەر هەمان مەبەست و واتا دەدەن بە دەستەوە، هەرچەندە هەندێکیان زیاتر درێژەپێدانی تیایە، بەتایبەت لە سیرەی حەڵەبیدا پاش ڕیوایەتی گفتوگۆکە، دەفەرموێ: (فكأنما كتب فى قلبي كتاباً) هەروەك لە دڵمدا پەڕاوێك دانرابێت، جێگیر کرابێت[2].

١- مامۆستا مالیك بن نەبی، ئەم بەشەی ڕیوایەتەکە دێنێ و پاشان دەنووسێ: (ئیتر بەهۆی دابەزینی یەکەم ئایەت لە قورئانی پیرۆز، ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە، وا دەزانێ کە پەڕاوێکی گەورە لە دڵیدا چاپکراوە، بەڵام توانای پێدا گەڕان و تەماشاکردنی نییە، ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی شارەزا و ئاگاداری ببێت، چونکە دەبێ تەنها بە نیگا و سرووش بۆی بێت و بەگوێرەی پێویستیی پەیامی بەرنامەکە[3].

---

[1] في ظلال القرآن ، ج ٦، ص٣٩٣٥- ٣٩٣٦.

[2] السيرة الحلبية ، ج١، ص٤٠٤.

[3] الظاهرة القرآنية، ط٢- ١٩٦١، ص١٣٨.

هەروەها دەنووسێت: (ئەم چەند ئایەتەش، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، دەبێتە دیاردەی قورئان، کە بۆ پێغەمبەر دادەبەزێت، ئینجا بۆ ماوەی ٢٣ساڵی کۆتایی تەمەنی پێغەمبەر ﷺ، دیاردەی قورئان بەردەوام دەبێت و دادەبەزێت)[٤].

زۆر گەڕام بە پەڕاوەکانی تەفسیر و ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ، بەڵکو ڕێم بکەوێ لە باسێك دەربارەی ئەو شەوە پیرۆزە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کە سەرەتایی شۆڕشێکی کەونیی گەورە بوو بە هاتنی دوا پێغەمبەر و دوا پەیام کە بەرنامەیەکی تێروتەسەلی تەواوە بۆ ژیان، ئەو باسەم لای مامۆستا مالیك بن نەبی دەسکەوت، کە لێرەدا هێنام، بوو بە ڕێخۆشکەرێك و ڕەمزێك بۆ ئەوانەی دوای خۆی، هەروەك زانای هەڵکەوتوو موحەممەد مەحمود شاکر دەڵێت: (وا دەزانم کەس لە پێش ئەودا پەڕاوی وای نەنووسیوە)، واتە (دیاردەی قورئانی)، جا هەق وایە ئەم پەڕاوە لە بەردەستی هەموو بیریارێك و لێکۆڵەرێك لە قورئاندا بێت، کە بیەوێ بەدوای گەورەیی قورئان و ئیعجازەکەی و باڵادەستییەکەیدا بگەڕێت لە سەدەی بیستدا و تا ئەو کاتەشی کە خوا دەیەوێت[٥].

٢ـ لە نووسینەکانی مامۆستای شەهید حەسەن بەنناشدا ـ ڕەحمەتی خوای لێبێـت ـ دوو وتارم بینی کە باسی ئەم شەوە مەزنە دەکەن:

أـ لە وتاری (مِن وحي حراء)دا دەڵێت:

(اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق: ١)، ئەم ئایەتە دەستپێکردنێکی جوانی مەبەستەکانی پەیامەکەیە، هەروەها هەنگاوی یەکەم بوو بۆ ئەو گۆڕانکارییە

---

[٤] الظاهرة القرآنية، ص١٣٨. ص١٣٢ (دیاردەی قورئانی پیرۆز) لە بە کوردی کردنی: م. غەفور کانی سپیکەیی.

[٥] ژمارەی چاپەکانی ئەم کتێبە، تەنها لە میسردا گەیشتووەتە زیاد لە چل چاپ.

گەورەیەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕوویدا کە لە قۆناغی منداڵییەوە ڕۆیشت بەرەو قۆناغی لاوێتی و زانیاری، لێرە و لەم ئەشکەوتە موبارەکەی کێوی حەڕاوە لە سەروو مەککە، گەورەترین پێغەمبەر ﷺ مەزنترین پەیامی وەرگرت، کە هەتا دنیا دنیا بێت ڕۆڵی خۆی دەبینێ بۆ گشت گەل و نەتەوەکان، لە هەر کوێ بێت، ڕێکخەری ژیانیشیانە نەك هەر لە دنیا، بەڵکو لە ئاخیرەتیشدا.

بەڵێ: لە تایبەتمەندێکانی پەیامەکەی موحەممەد ﷺ کە لە ئەشکەوتی حەڕاوە سەری هەڵدا، ئەوەیە کە پەیامێکی جیهانیی گشتگیرە[٦].

ب ـ لە وتاری (لیلة)دا دەڵێت: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ) (القدر: ١): (ئەوە شەوێکی پیرۆزی پڕ ئاسایشە، قەدر و پلە و پایەی بەرزی هەیە، هەموو کارێکی دانایی تێدا جیادەکرێتەوە، بەوەش بووەتە چاکتر لە هەزار مانگ، خوای گەورە ئەم شەوەی پیرۆز کردووە بەوەی دیارییەکی لە ئاسمانەوە ناردووە، کە بریتییە لە نیزامێکی کۆمەڵایەتیی تێروپڕ لە پەڕاوێکی پیرۆزدا، بۆ خەڵکانی سەر زەوی کە لەو کاتەدا ڕێگایەکی تێکچوو بوو، بە سەرگەردانی لە چوار ڕێیانێکدا وەستابوون[٧]).

پاش ئەوەی باسی گرنگی و ڕۆڵی قورئان دەکات لە ژیاندا، بەوە کە ئازادیی گشتی و تایبەتی فەراهەم دێنێ بۆ ئادەمی، ئازادی لە کارکردندا و ئازادکردنی لە ترس و دڵەڕاوکێ، ئینجا دەڵێ: (لەم شەوەدا بەختەوەری دەدرەوشێتەوە لە دەروونی پەیڕەوانی ئەم بەرنامەیەدا، خەم و ئازاریش دەبارێ لە دەروونی ئەوانەی کە لێی هەڵدەگەڕێنەوە و حوکمی پێناکەن، ئەمە شتێکی کەمە لە بارەی ئەو شەوە پیرۆزەوە کە (فيها يفرق كل أمر حكيم)، جا

---

[٦] أحاديث الجمعة، ص١٤٣-١٤٤.

[٧] أحاديث الجمعة، ج٢، ص١٣٨.

هەرکەسێك زیاتری دەوێت با بچێتە لای قورئان، کە دەفەرموێت: (الَر، كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ) (هود: ١)[٨].

٣ـ مامۆستا سەید قوتبیش لە تەفسیری سورەتی (العلق) و (القدر)دا زۆر جوان باسی ئەو شەوە پیرۆزەی کردووە، بۆ نموونە دەڵێت:

(لە بەردەم ئەم ڕووداوەدا وەستام، کە زۆرجار خوێندومانەتەوە لە پەڕاوی سیرە و پەڕاوی تەفسیردا، بەسەریدا ڕۆیشتووین و بەجێمان هێشتووە، یان تۆزێك لەسەری وەستاوین و دواتر وازمان لێهێناوە، ئەوە ڕووداوێکی گەورەیە، زۆر گەورەیە تا دوا پلە، چەند بمانەوێت سنوورێك بۆ گەورەییەکەی بکێشین ناتوانین، چونکە زۆر لایەن هەیە کە پەی پێ نابەین.

ئەوە ڕووداوێکی گەورەیە بە ڕاستییەکانیەوە، بە دەلالەتەکانیەوە، بەو کاریگەرییە زۆرەیەوە کە هەیەتی لەسەر ژیانی هەموو مرۆڤایەتی. لەو چرکەساتەدا کە ئەو ڕووداوە ڕوویدا، بەبێ موبالەغە، گەورەترین چرکەساتە بەسەر ئەم زەوییەدا هاتبێ لە مێژووی کۆن و نوێدا).

پاشان دێتە سەر کاریگەرییەکانی ئەو شەوە (ڕۆڵ و کاریگەریی ئەو ڕووداوەش لە ژیانی بەشەرییەتدا هەر لە سەرەتاوە بەدەرکەوت، هەر لە سەرەتاوە دەستی کرد بە گۆڕینی ڕەوڕەوەی مێژوو، بەوەی کە ئیتر دیار بوو مرۆڤـ بەرنامەی ژیانی و بیر و باوەڕی لە کوێوە وەردەگرێ، لە هەوا و هەوەسی و دنیاوە؟ نا، بەڵکو لە ئاسمان و وەحیی خواییەوە).

تا دەگاتە ئەوەی دەڵێت: (بە ڕاستی ماوەیەکی سەیر بوو، بیست و سێ ساڵی ڕەبەق، پەیوەندی هەبوو لە نێوان مرۆڤـ و کۆمەڵی باڵادا (الملأ الأعلى)، ماوەیەك بوو کەس لە ڕاستییەکەی تێناگات مەگەر ئەوانەی کە تێیدا ژیاون،

---

[٨] هەمان سەرچاوە، ل١٤٢.

سەرەتا و کۆتاییان بینیوە، تامی شیرینی ئەو پەیوەندییەیان چەشتووە، ئەوان هەستیان بە دەستی خوا دەکرد کە لە رێدا هەنگاوی پێدەنان، ئەوان بینییان لە کوێوە دەستیان پێکرد و گەیشتنە کوێ..)[9].

٤- ئینجا ئەگەر بچینە لای نووسەری ئیسلامی دکتۆر عەبدولعەزیز کامل، لە پەڕاوەکەیدا (مواقف إسلامية[10]) لە بابەتی (الآيات الخمسة الأولى من سورة العلق من جانب تربوي) کە سەبارەت بەم چەند ئایەتەی سورەتی (العلق) دەنووسێت: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ).. (ئەوە خوێندنەوەیە، بەڵام بە ناوی ئەو پەروەردگارەی کە بەدیهێنەرە، ڕاستە ڕەنگە مرۆڤێك زانستێك بخوێنێتەوە یان بنووسێت، هەمووشی بۆ خزمەتی هەوا و ئارەزوی بێت، ڕەنگە لای گەلان و وڵاتان زانست هەبێت، بەڵام بە ناوی خواوە نایخوێننەوە، بەڵکو قۆرخی دەکەن بۆ خۆیان و نهێنییەکەی لای خۆیانە، پاشان بۆ ژێردەستەکردنی گەلان و ناهەقی بەکاری دێنن، لەبەر ئەوە قورئان جیاوازی دەکات لە نێوان دوو زانستدا، لە چیرۆکی قاروونیدا، یەکەمیان ئەو زانستەیە کە قاروون پێی غەڕڕا بوو هەرچەند گەلەکەشی ئامۆژگارییان کرد، بەڵام ئەو ملی نەدا بۆ هەق و وتی: (إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي) (القصص: ٧٨)، ئەو ئەو زانستەی نەگێڕایەوە بۆ خوا، کار و کردەوەشی لەبەر خوا و بۆ ڕەزامەندیی ئەو نەبوو.

ئەم زانستە کەڕە ناتەواوەش هەندێ کەسی لە گەلەکەی بە شەوارە خست و وتیان (يا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ) (القصص: ٧٩).

---

[9] في ظلال القرآن، ج٦، ص٣٩٣٦.

[10] سلسلة إقرأ، ٣٢٧، مارس/ ١٩٧٠، ص١٢-١٣.

لە هەمان کاتدا کەسانێك هەبوون کە راستیان پێکا و زانییان کە ئەوەی قاروون تەنها زرق و برقی دنیایە و زوو تێدا دەچێت، قورئان ئاماژەیان بۆ دەکات: (وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ) (القصص: ٨٠).

ئەو زانستەی کە فێری دەبین و دەیخوێنینەوە، دەبێ هەمیشە لەبارەیەوە ئەم فەرمایشتەی پەروەردگارمان لەبەرچاو بێت (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق: ١). لەم ئایەتەدا کردار و نیەتی تێدایە، هەوڵ و ئامانجی تێدایە، ئەو ئایەتەیە ئەخلاقیاتی توێژینەوەی زانستیی تێدایە، قورئان یادی مرۆڤی دەخاتەوە کە ئەسڵەکەی چییە و لە چی دروست بووە (خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ) (العلق: ٢).

هەروەك چۆن پەروەردگارت پەروەردەی کردوویت و چاودێریی کردوویت تا بوویت بە مرۆڤێکی تەواو، چاو و گوێ و دڵی پێبەخشیویت، نیعمەتی ئاشکرا و پەنهان بە سەریدا رِۆیشتوویت، دە تۆش زانست و خوێندنەوەکەت با بە ناوی پەروەردگارتەوە بێت، هەروەك چۆن دەستی رێزی لێناویت کە ئەو (وهو ربك الاكرم)، گەورەترین دەستی رێزیشی ئەوەیە کە (الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ * عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) (العلق: ٤ـ ٥) ئەمە گەشتێکی دوور و درێژە لە (خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ) تا (عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)، گەشتێك کە قودرەت و رەحمەت و رِێز و بەخششی تێدا دەردەکەوێت، لەوەوەیە سەرەتا و دەستپێکردن و گەڕانەوەش تەنها بۆ لای ئەوە).

٥- هەر پێغەمبەرێك و نێردراوێك ـ سەلامی خوایان لێبێت ـ سیفەتێکی تایبەتی بە خۆی هەیە، لە رِیوایەتەکاندا هاتووە کە سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەر و سێ سەد نێردراو لەلایەن خواوە نێردراوە بۆ بەشەرییەت، کە لەناو هەموویاندا وەك خەتیب ئەلبەغدادی دەڵێت: دوایین پێغەمبەر کۆکەرەوەی

سیفاتی هەمووانە و (گوایە لە کاتی لەدایکبوونیدا دەنگێك بیستراوە کە وتوویەتی: موحەممەد بگێڕن بۆ هەموو وڵاتان و ناو دەریاکان تا هەموو دنیا بناسێت، ئینجا ببیەن بۆ لای هەموو ئینس و باڵندە و ئاژەڵەکانە، پێی ببەخشن لە ئەخلاقی ئادەم، زانیاری شیپ، ئازایەتیی نوح، خۆشەویستیی ئیبراهیم، زمانزانیی ئیسماعیل، رازیبوونی ئیسحاق، بەلاغەتی صالح، دانایی لوط، توندیی موسا، ئارامیی ئەیوب، گوێڕایەڵیی یونس، جیهادی یوشەع، دەنگ و لەحنی داوود، خۆشەویستیی دانیال، ویقاری ئیلیاس، داوێنپاکیی یەحیا و زوهدی عیسا، هەڵی بێکێشن لە دەریای ڕەوشتی هەموو پێغەمبەران[11].

جا بەڕاستی ژیاننامەی پڕ بەرەکەتی، کۆکەرەوەی ڕەوشتی بەرزی گشت پێغەمبەرانە، کاتێك لە خاتوو عائیشەش پرسیاری ڕەوشتی سەروەرمان کرا، زۆر جوان پێکای و وتی: (کان خلقة القرآن) قورئانیشە وەصفی دەکات، دەفەرموێت: (الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ) (العلق: ٤).

٦ـ لە گەورەیی دیاردەی قورئانییە کە کاتی دابەزینەکەی لە ئەشکەوتی حەڕڕا ئاشکرایە و لە سێ شوێندا قورئان ئاماژەی بۆ دەکات:

أـ شەوێکی پیرۆزە، هەروەك لە سەرەتای سورەتی (الدخان)دا هاتووە: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ، فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ، أَمْراً مِّنْ عِندِنَا إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ) (الدخان: ١ـ ٥).

ب ـ شەوێکی بە قەدر و ڕێزە، شەوی یەکەم پەیوەندیی بە دوا پەیامەوە: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ * وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ * لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ * تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ * سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ)

---

[11] الرسالة المحمدية، سليمان الندوي، ط١، ص١٢٤.

(القدر: ١– ٥)، ئەو شەوە یەکێکە لە شەوەکانی مانگی رەمەزان، کە موسڵمانان گرنگیی تەواوی پێ دەدەن و مانگەکەشی هەمووی بەڕۆژوو دەبن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (التمسوها في العشر الأواخر من رمضان، ليلة القدر في تاسعة تبقى، وفي سابعة تبقى، وفي خامسة تبقى)[١٢]، لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بۆی بگەڕێن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرموودەکان باسی شەوە تاکەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزان دەکەن، هەندێ زانا بەلایانەوە وایە کە ئەو شەوە مەرج نییە پەیوەست بێت بە مانگێکی تایبەتەوە[١٣].

بەڵام ئایەتی ١٥٨ی سورەتی (البقرة) جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە لە مانگی رمەزاندایە (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ) (البقرة: ١٨٥)، بەمەش دەردەکەوێت کە ئەو شەوە لە ڕەمەزاندایە، هەرچەند هەموو شەوەکانی ڕەمەزان پیرۆز و پڕ فەڕ و بەرەکەتن، لە هەندێ ریوایەتیشدا هاتووە کە هەموو شەوەکانی ڕەمەزان شەوی قەدرن بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت (هي في كل رمضان) کە ئەبو داوود ریوایەتی کردووە، ژمارە ١٣٨٧، سەنەدەکەشی دروستە[١٤].

٧- زانایانی کەلەپوور و گەردووناسی جەختیان کردووەتە سەر چوار رۆژ لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ [١٥]، رۆژی لەدایکبوونی کە رۆژی دووشەممە، ٩ی رەبیعی یەکەمی، ساڵی فیلە، کە بەرواری ٢٠ی نیسانی ٥٧١ی زایینییە.

---

[١٢] أخرجه البخاري في الصحيح، كتاب فضل ليلة القدر، ٤/ ٢٦٠، وأبوداود، رقم ١٣٨١.

[١٣] المجموع للإمام النووي، ٦/ ٤٥٨، وقد نقله من شرح مسلم للقاضي عياض.

[١٤] بنوارە: ليلة القدر، د. فاروق حمادة، ص٤١- ٧٨.

[١٥] الشيخ محمود عرونوس، أربعة أيام إسلامية. گۆڤاری: لواء الإسلام، ژمارە: ٧، ٨، ٩، ساڵی دووەم، ١٩٤٩.

ڕۆژی ناردنی بە پێغەمبەر: بوخاری و موسلیم و زۆربەی مێژوونووسان، کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە دوای چل ساڵییەوە نێردراوە، بۆ ئەحمەد موختار پاشای گەردوونناس دەرکەوتووە کە ٢٠ی نیسانی ٥٧٠ی زایین بووە، ئەگەر حسێبی چل ساڵی قەمەری بکەین، یان ١٤١٧٤ ڕۆژ، لەو ڕۆژەی کە دیاری کراوە، ئەوا دەگەینە ئەوەی کە ڕۆژی ١ی شوباتی ساڵی ٦١٠ی زایین بووە (پاشا ئەم ڕایەی پێ پەسەندە).

ڕۆژی سێیەمیش، ڕۆژی کۆچکردنیەتی: ئەحمەد موختار پاشای تورکی لە کتێبەکیدا (إصلاح التقاويم)، دەڵێت: ئەگەر بگەڕێیین بە دوای ئەو کاتەی کە کۆچکردن تێیدا ڕووی داوە، ئەوا پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای مانگی ڕەبیعی یەکەمەوە لە ئەشکەوتی (ثور) دەرچووە.. موختار پاشای میسری لە کتێبی (التوقيفات الإلهامية)دا جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە یەکی ڕەبیعی یەکەمی کۆچی بەرامبەر ڕۆژی دووشەممەی ١٦ی (توث)ی قیبتییەکانە، کە بەرامبەر ١٣ی ئەیلولی ٦٢٢ی زاینییە.

ڕۆژی گەیشتە مەدینەشی ٢٠ی ئەیلولی ٦٢٢ زاینییە، کە لەم ڕۆژەشدا بوو موسا (سەلامی خوای لەسەر) لە دەست فیرعەون ڕزگاری بوو، پێی دەوترێت عاشورا لای جولەکەکان.

دوایین ڕۆژیشی بە ڕێوڕەسمی حەج دیاری دەکرێت لە ساڵی دەیەمی کۆچی.. دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو ڕۆژانەی مابوو لە مانگی زیلحیججە لە (قباء) بەسەری برد، پاشان بەرەو مەدینە بەڕێکەوت و دەستی کرد بە ئامادەکردنی سوپای ئوسامە، تا نیشانەکانی نەخۆشییەکەی تێدا دەرکەوت لەو چەند شەوەی کە مابوو لە مانگی سەفەر، یان لە سەرەتای مانگی ڕەبیعی یەکەم، ئیبن سەعد دەڵێت: نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی چوارشەممە دەستی پێکرد، دوا شەوی مانگی سەفەر و سیانزە شەوی خایاند، ڕۆژی

دووشەممەی دووانزەی ڕەبیعی یەکەم کۆچی دووایی کرد و ڕۆژی سێ شەممە لە ماڵی دایکی موسڵمانان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) ناشتیان.

ڕۆژی کۆچی دواییشی بەپێی پێداچوونەوەی مەحموود پاشای گەردوونناس، ئەوەیە کە دوانزەی ڕەبیعی یەکەم دەکاتە ڕۆژی یەکشەممە، ٧ی حوزەیران، بەپێی کۆکردنەوەی ڕاستەقینەی نێوان خۆر و مانگ، بەهەرحاڵ وەفاتەکە لە دووەم دووشەممەی مانگی ڕەبیعی یەکەم بووە و بە خاکسپاردنەکە لە ڕۆژی سێشەممەدا بووە.

دکتۆر موحەممەد حسێن هەیکەل جەخت لەوە دەکاتەوە کە ڕۆژی وەفاتی دەکاتە ٨ی حوزەیرانی ٦٣٢ی زاینی[١٦].

٨ـ لە قورئاندا ئامانج لە ژیان، پەرستنی خوای تاك و تەنهایە، سورەتی (الذاريات) ئایەتی ٥٦ فەلسەفەی ژیان دیاری دەکات کە دەفەرموێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ).

عیبادەت بە مانا فراوانەکەی هەموو چالاکی و جووڵەیەکی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە، بە مەرجێك مەبەستی خوا بێ و بەپێی بەرنامەی خوا بێت، موسڵمان بەردەوام لە پەیوەندییەکی ئیجابیدایە لەگەڵ خوا، لە هەموو کاتێکدا بە جۆرێك لە جۆرەکان بەندایەتیی خۆی ڕادەگەیەنێت.

موحەممەد ئیقباڵی شاعیر دەڵێت:

**إذا الإيمان ضاع فلا أمان ... ولا دنيا لمن لم يحيي دينا**

**ومن رضي الحياة بغير دين ... فقد جعل الفناء لها قرينا**[١٧]

---

[١٦] د. محمد حسين هيكل، حياة محمد، ط٢، ص٣١٤.

[١٧] حديث الروح، شعر محمد إقبال، وەرگێڕانی: الصاوي شعلان، ل٨٦.

زۆر لە زانایانمان جەختیان لەم ڕاستییە کردووەتەوە و چەندین پەڕاو لەم بوارەدا نووسراون، کە باسی کاری شەوانە و ڕۆژانەی موسڵمان دەکات، کە هەمیشە خوای لە یادە، وەك:

أ ـ الأذكار للإمام النووي.

ب ـ عمل اليوم والليلة للإمام النسائي.

ج ـ عمل اليوم والليلة للإمام أبى بكر السني.

د ـ المأثورات للإمام البنا.

موسڵمان بەردەوام لە پەیوەندییەکی پۆزەتیڤدایە لەگەڵ خوای خۆی و لە هەموو کارەکانیدا لە پەرستشی خوادایە.

لە هزری ئیسلامیدا پەرستش مانایەکی بەرفراوانی هەیە:

زانایەك کە سەرقاڵی بواری زانستەکەیەتی، کاتێ نیەتی بۆ خوایە، بە کارەکەی لە عیبادەتدایە.

فەرمانبەر لە فەرمانگەکەیدا لە پەرستشی خوادایە.

قوتابی لە خوێندنگەکەیدا لە پەرستشی خوادایە.

جووتیار لە کێڵگەکەیدا لە پەرستشی خوادایە.

کرێکار لە کارگەکەیدا لە پەرستشی خوادایە.

مرۆڤ لە ژیاندا لە پەرستشی خوادایە.

گشت بەندەی خودایەکی تاك و تەنهان، بەرەکەت دەخاتە کار و چالاکی و دڵسۆزییانەوە، پاداشتی گەورەی ئەوانە دەداتەوە کە بە عارەقی نێوچەوانیان نان پەیدا دەکەن، عیبادەت ئەگەر رووبەرێکی بەرفراوانی لە ژیانی مرۆڤ داگیر

کرد، ئەو کات هەموو ژیانی پەرستش و پاداشت و لێخۆشبوونە.. (فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) (الكهف: ١١٠)[١٨].

له گەڕانەوە بۆ ناونیشانی بابەتە نەگۆڕەکانی کتێبەکانی (الأذكار)، دەبینین کە ژیانی پێغەمبەر ﷺ، لە ناومالّ و کۆمەلّگە و دەولّەت، بریتی بووە لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەگەلّ خوای گەورەدا، بە پاڕانەوە و موناجات و پەیوەندیی ڕووحی:

أ. چیی وتووە و چیی کردووە کاتێك لە خەو ڕابووە.

ب. چیی وتووە و چیی کردووە کاتێك جلێکی پۆشتووە، یان فڕێی داوە.

ت. چیی وتووە و چیی کردووە کاتێك لە مالّ دەرچووە، یان گەڕاوەتەوە.

پ. چیی وتووە و چیی کردووە لە کاتی دەستنوێژ شتن و غوسل کردندا.. هتد.

ج. چیی وتووە و چیی کردووە کاتێك چووەتە مزگەوتەوە، یان دەرچووە لێی.

ح. نزاکانی نوێژ.

خ. چیی وتووە و چیی کردووە لە کاتی سەردانی کەسوکار و نەخۆش و ماتەمینی و.. هتد.

د. چیی وتووە و چیی کردووە لە کاتی ڕوودانی کارەساتی سروشتیدا.

ژ. چیی وتووە و چیی کردووە لە کاتی سەفەرکردن و گەڕانەوەدا.

ر. چیی وتووە و چیی کردووە لە بۆنەکان و کاتی خواردن و خواردنەوەدا.

---

[١٨] بابەتێکمان لە گۆڤاری (التربية الإسلامية)دا نووسیوە، بە ناوی (العبادة أداة لسلوك المسلم وغاية)، هەردوو ژمارەی ٧ و ٨، سالّی ١٧، ل٢٥.

ز. چیی وتووه و چیی کردووه له پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا و لەگەڵ هاوڕێیان و خزماندا.

س. چیی وتووه و چیی کردووه له یادەکانی ژنهێنان و منداڵبوون و.. هتد.

ش. چیی وتووه و چیی کردووه له کاتی ئەمر کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە.

ص. چیی وتووه و چیی کردووه له کاتی وازهێنان و دەست بەکارکردندا.

ئەمەش سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ کە دایکی موسڵمانان عائیشە لە بارەیەوە دەفەرموێت: (كان رسول الله ﷺ يذكر الله على كل أحيانة)[19] ئەمەش فەرمانی خوایە بۆ ژیانی مرۆڤی موسڵمان: (قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ * لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ) (الأنعام: ١٦٢-١٦٣).

٩- (القرآن) لە بنەڕەتدا چاوگە، وەکو (کفران) و (رُجحان)، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ) (القيامة: ١٨).

ئیبن عەباس دەڵێ: ئەگەر کۆمان کردەوە و لە سنگتدا چەسپاندمان، کاری پێ بکە، کە تایبەت کراوە بەو کتێبەی کە نێردراوە بۆ موحەممەد و بووەتە نیشانەیەك بۆی، هەروەك چۆن تەورات بۆ موسا و ئینجیل بۆ عیسا نێردراوە - سەلامی خوایان لێ بێت - هەندێ زانا دەڵێن: (ئەم کتێبە ناونراوە قورئان، لەبەرئەوەی کۆکەرەوە و پاڵفتەی هەموو پەڕاوەکانیەتی) بەڵکو کۆکەرەوەی هەموو زانستەکانی تێدایە، خوای گەورە ئاماژەی پێ دەکات: (وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ) یوسف: ١١١، هەروەها: (تِبْيَاناً لِّكُلِّ شَيْءٍ) النحل: ٨٩، هەروەها: (قُرآناً عَرَبِيّاً غَيْرَ ذِي عِوَجٍ)، الزمر: ٢٨، هەروەها: (وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ) الأسراء: ١٠٦،

---

[19] رواه مسلم، وأبوداود، والترمذي.

هەروەها: (فِي هَذَا الْقُرْآنِ) الروم: ٥٨، هەروەها: (وَقُرْآنَ الْفَجْرِ) الإسراء: ٧٨، أي لقراءته، واتە بۆ خوێندنەوەی، هەروەها: (لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ) الواقعة: ٧٧، وأقرأت فلاناً كذا، واتە بە فلانە کەسم خوێندەوە، فەرمووی: (سَنُقْرِئُكَ فَلا تَنسَى) الأعلى: ٦، و (تقرأت: تفهمت، واتە: تێگەیشتم)، و (قارأتە: دارستە، واتە: خوێندمانەوە)[٢٠].

وشەی قورئان لە ٥٨ جێدا هاتووە لە قورئاندا کە دەکرێت دابەش بکرێت بۆ چەند بەند و بابەتێك[٢١] بەم جۆرەی خوارەوە:

| ت | دووبارەبوونەوە | ژمارەی سورەتەکانی | ناوی سورەتەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | یەك جار | ٢٤ | البقرة، النساء، المائدة، الأنعام، الأعراف، التوبة، یوسف، الکهف، النحل، القصص، الروم، سبأ، ص، الزمر، فصلت، الزخرف، الأحقاف، محمد، الرحمن، الواقعة، الحشر، الإنسان، الإنشقاق، البروج، |
| ٢ | دوو جار | ٥ | طه، الفرقان، یس، ق، المزمل، |
| ٣ | سێ جار | ٢ | یونس، الحجر، |
| ٤ | چوار جار | ٢ | النمل، القمر، |
| ٥ | دە جار | ١ | الإسراء، |
| کۆ | | ٣٤ | کاتی دابەزینی: ٢٠ی مەککی و ٩ی مەدەنییە، |

[٢٠] مفردات ألفاظ القرآن، الراغب الأصفهاني، ط١، ص٦٦٨- ٦٦٩.

[٢١] بابەتێکمان لە گۆڤاری (التربية الإسلامية)دا نووسیوە بە ناونیشانی (یوم ولیلة في حیاة المسلم)، ساڵی سیانزەهەم.

| ت | بابەتەکەی | ژمارەی دووبارەبوونەوە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | توانای خوا | ١ | |
| ٢ | تەحەداکردن بە قورئانەوە | ١ | |
| ٣ | بیرکردنەوە | ١ | |
| ٤ | چیرۆکی قورئان | ١ | |
| ٥ | ڕاستگۆیی قورئان | ١ | |
| ٦ | ژیان لەگەڵ قورئان | ١ | |
| ٧ | نوێژی بەیانی | ٢ | |
| ٨ | ڕێزی قورئان | ٢ | |
| ٩ | پەیامی قورئان | ٢ | |
| ١٠ | خوێندنەوەی قورئان | ٣ | تیلاوەی قورئان |
| ١١ | سوێند بە قورئان | ٣ | |
| ١٢ | سێ پەڕاوەکە | ٣ | تەورات و ئینجیل و قورئان |
| ١٣ | دابەزینی قورئان | ٤ | |
| ١٤ | ئیعجازی وێژەیی | ٥ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ | کاریگەرێتیی قورئان | ٧ | ئیجابیەت لە ژیاندا |
| ١٦ | دژایەتیی قورئان | ٩ | هەڵوێستی بێباوەڕان بەرامبەر قورئان |
| ١٧ | پێکهاتەکانی قورئان | ١٢ | |
| **کۆی گشتی** | | **٥٨** | |

وشەی (قرآناً) لە دە شوێندا هاتووە، وشەی (قرآنە)یش لە دوو ئایەتدا، بەم شێوەیە:

وشەی (قرآناً):

| ت | ژمارەیی جارەکان | ژمارەی سورەتەکان | ناوی سورەتەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | یەك جار | ٨ | یوسف، الرعد، الإسراء، طه، الزمر، الشوری، الزخرف، الجن، |
| ٢ | دوو جار | ١ | فصلت، |
| | کۆی گشتی | ٩ | کاتی دابەزینی: ٨ سورەتی مەکییە و ١ سورەتیش مەدەنی، |

ئینجا ئەگەر سەیری باس و بابەتەکانی ئایەتەکان بکەین، بەم جۆرەیە:

| ت | بابەت | ژمارەی دووبارەبوونەوە | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | عەرەبیەتی قورئان | ٧ | ئەو زمانەی قورئانی پیّ دابەزیوە |
| ٢ | کاریگەرێتیی قورئان | ٢ | |
| ٣ | خوێندنەوەی قورئان | ١ | |
| | کۆی گشتی | ١٠ | |

وشەی (قرآنه) دووجار لە سورەتی (القیامة)دا هاتووە و باسەکەشی کۆکردنەوەی قورئان و پاراستنێتی لەلایەن خواوە و دڵنیابوونی پێغەمبەر ﷺ بە مانەوەی قورئان بەم شێوەیە تا قیامەت.

١٠ـ دکتۆر موحەممەد عەبدوڵڵا دەڕاز، لە پەڕاوەکەیدا (النبأ العظیم)، لە بارەی ناوی (القرآن)ەوە دەڵێت: (ناونراوە قورئان، لەبەرئەوەی دەخوێنرێتەوە، ناونراوە (کتاب) لەبەرئەوەی بە قەڵەم دەنووسرێتەوە، ناونانی بەو دوو ناوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە حەقی خۆیەتی لە دوو شوێندا بپارێزرێت نەك یەك شوێن، واتە بۆ پاراستنی دەبێت بێجگە لەوەی لە دڵاندا بە لەبەرکردن و بە سەنەدی (صحیح) پشتاوپشت بگوێزرێتەوە، لە هەمان کاتدا دەبێت نووسرابێتەوە و پشتاوپشت گوازرابێتەوە.

بەم دوو ڕێگایە کە خوا خستییە دڵی ئومەتی موحەممەدەوە ﷺ، قورئان پارێزراوە و پەیمانی خوا هاتە جێ کە فەرموویەتی: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩).

ئەگەر ویستت پێناسەی قورئان بکەیت، پێناسەیەکی دیاریکراو، دەبێت ئاماژە بدەیت بەوەی کە لەناو دووتوێی موصحەفدا نووسراوە یان بە زمان دەخوێنرێتەوە، دەڵێیت: قورئان بریتییە لەوەی کە لە دووتوێی ئەم پەرتووکەدایە، یان دەڵێیت: (بسم الله الرحمن الرحيم (١) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضَّالِّينَ (٧)) الفاتحة.. تا: (مِنْ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ).

یان لە پێناسەیەکی تردا: (قورئان وتەی پەروەردگارە کە دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەر ﷺ و تیلاوەتەکەی عیبادەتە)[٢٢].

بەمەش قورئان جیادەکرێتەوە لە وتەی غەیری خوا و لەو پەڕاوانەی کە بۆ پێغەمبەرانی پێشتر نێردراون، دواتریش جیادەکرێتەوە لە وتە و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، تەنانەت لە فەرموودە قودسییەکانیش کە بە (یقول الله تعالی) دەستپێدەکات[٢٣].

وا باشە لێرەدا قسەی هەندێك لەوانە بێنین کە دیراسەیەکی زانستیی قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەریان ﷺ کردووە و گەیشتوونەتە ڕاستییە نەگۆڕەکانی پەیامەکەی و ئەو کتێبەی کە بۆی ڕەوانە کراوە:

---

[٢٢] النبأ العظيم، ط٢٠٠٤، ص١٣- ١٤.

[٢٣] النبأ العظيم، ط٢٠٠٤، ص١٥- ١٦.

أ ـ دکتۆر مۆریس بۆکای، جەڕاحی فەڕەنسیی بەناوبانگ دەڵێت: (ڕاستێتیی قورئان مشتومڕ هەڵناگرێت، دەقی قورئان پێگەی تایبەتی خۆی هەیە لە نێوان کتێبە ئاسمانییەکاندا و جیاوازە لە دەقەکانی تەورات و ئینجیل کە دەستکاری کراون).

هەروەها دەڵێت: (بە ڕای من ڕاڤەی دانراو (التفسیر الوضعي)ی بۆ نابێت)،

ب ـ کۆنت ئەدوارد کیوجا دەڵێت: (هەرچی ڕۆحی ئادەمی پێویستیەتی بۆ بەرزبوونەوە و خۆ تەواوکردن، لە قورئاندا هەیە).

ت ـ داڤید یود دەڵێت: (قورئان دەستوورێکی کۆمەڵایەتی، شارستانی، بازرگانی، حەربی، قەزائییە و لە سەروو هەموو ئەوانەشەوە یاسایەکی ئاسمانیی مەزنە).

پ ـ گۆستاف لۆبۆن دەڵێت: (قورئان لە ڕێی قەناعەتەوە بڵاوبووەتەوە نەك زۆر لێکردن و جەنگکردن، ئەمەش وای کردووە گەلانی دنیا بەرەو لای خۆی بهێنێ و بڕوای پێبهێنن).

ج ـ پۆشکین دەڵێت: (چەند جوان و قەشەنگە قورئان).

ح ـ تۆماس کارلیل دەڵێت: (هەرچەند خۆ لەوانە نییە و دوورە موسڵمان ببین، بەڵام هەق بڵێم ئەو هەموو درۆ و دەلەسەی کە دەمارگیریی لە پێناوی دینەکەماندا بۆ موحەممەدمان دروست کردووە، سەرەنجام هەر خۆمان زەرەرمەند دەبین).

خ ـ بەرناردشۆ دەڵێت: (پێش کۆتایی هاتنی ئەم سەردەمە، هەر دەبێ ئیمپراتۆریەتی بەریتانی پەیڕەوی ئیسلام بکات، ئەگەر موحەممەد لەم سەردەمەدا بێتەوە، سەرکەوتوو دەبێت لە چارەسەری هەموو کێشە جیهانییەکاندا و دنیا بەرەو بەختەوەری و ئاشتی دەبات).

د ـ دکتۆر مایکڵ هارت، له کتێبی (سه‌د که‌سه یه‌که‌مینه‌که‌)دا ده‌ڵێت: (ڕه‌نگه لای خوێنه‌ران سه‌یر بێت که موحه‌ممه‌دم وه‌ك یه‌که‌م که‌سایه‌تیی مێژوو داناوه‌، له ڕاستیدا ئه‌و تاقه پیاوه له مێژوودا، له بواری دین و دنیادا گه‌وره‌ترین سه‌رکه‌وتنی تۆمار کردووه‌).

(إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) (فاطر ٢٨).

زانایه‌کی موسڵمان به زانای بوونه‌وه‌رناس جیمس جێنز ده‌گات، کاتێك به‌ره‌و که‌نیسه به‌ڕێده‌که‌وت، لێی ده‌پرسێت: چی وا له زانایه‌کی به‌ناوبانگ ده‌کات که بچێ بۆ که‌نیسه‌؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: عه‌سر وه‌ره بۆ لام چاییه‌کیش ده‌خۆینه‌وه‌.

که عه‌سر پێکه‌وه داده‌نیشن، دکتۆر جیمس باسی گه‌وره‌یی بوونه‌وه‌ر و نیزامی وردی بۆ ده‌کات و ده‌ڵێت: هه‌رچه‌ند سه‌یری جوانیی دروستکراوه‌کانی خوا ده‌که‌م، هه‌موو له‌شم ده‌له‌رزێ و کاتێ سوجده بۆ خوا ده‌به‌م ده‌ڵێم تۆ گه‌وره و باڵاده‌ستی، هه‌موو خانه‌کانی له‌شم دان ده‌نێت به‌و ڕاستییه‌دا و هه‌ست به ئارامی و خۆشییه‌ك ده‌که‌م که زیاتره له هی خه‌ڵکی، ئینجا نازانم تێگه‌یشتی بۆ ده‌چم بۆ که‌نیسه‌؟

زانا موسڵمانه‌که‌ش وتی: ئایه‌تێك هه‌یه له‌و باره‌یه‌وه ده‌فه‌رموێت: (وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء) (فاطر ٢٨)، سێر جێمس هاواری کرد و وتی: چی؟ زانایان له خوا ده‌ترسن؟ سه‌یره‌، زۆر زۆر سه‌یره‌، ئه‌وه‌ی که من به هه‌وڵ و کۆششی په‌نجا ساڵ گه‌یشتومیه‌تێ، تۆ ئێستا وتت، کێ ئه‌مه‌ی به موحه‌ممه‌د وتووه‌؟ ئایا ئه‌مه له قورئاندایه‌؟ ئه‌گه‌ر وایه له منه‌وه ئه‌م شایه‌تییه بنووسه‌: قورئان له خواوه نێردراوه‌.

١١ـ قورئان كاریگەریی زۆری هەیە لەسەر ئەوانەی دوور لە هەوا و ئارەزوو و ڕق و کینە دەیخوێننەوە و دیراسەی دەکەن.. هەر وەك چۆن کاریگەریی هەبووە لەسەر عەرەب کاتێك کە دابەزیوە و لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوویانە، ئەم کاریگەرییە بە درێژایی مێژوو ماوەتەوە، بە تایبەتی لە نێو زانایاندا، ئەمەش تەسدیقی ئەو ئایەتەیە (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ).

ئەمانەش چەند نموونەیەکن لەم سەردەمەدا، کە بەرەو ئیسلام هاتوون دوای گوێبیستیان بۆ چەند ئایاتێك لە قورئان، یان دوای لێکۆڵینەوەی زانستی دەربارەی قورئان و ئیسلام..

## نموونەی یەکەم، کچە (مۆد) نمایشکاری فەرەنسی (فابیان):

(فابیان) کچە بیست و هەشت ساڵەی فەرەنسی، ماوەیەك لەمەوبەر ناسراوێکی بەناوبانگی مۆد و نمایشکاری جلوبەرگ بوو، کە کۆمپانیا گەورەکان بە بۆنەی جوانییەکەیەوە گرێبەستی گەورەیان لەگەڵدا ئەنجام دەدا.

وێنەی ئەو لە گۆڤار و کەناڵە جیاجیاکانی تەلەفزیۆندا پەخش دەکرا، بەڵام ئێستا لە گوندێکی دوورەدەستی ئەفغانستان سەرقاڵە بە تیمارکردنی نەخۆش و لە ژیانی خۆی زۆر ڕازی و خۆشحاڵە، بەهۆی ئەوەی کە ئەو ئێستا هیدایەتی ئیسلامی وەرگرتووە و کەسێکی موسڵمانە.

(فابیان) بە بڕوابەخۆبوونێکیٚ تەواوەوە وتی: (ئەگەر لوتف و ڕەحمەتی خوای گەورە نەبوایە هیچ کات نەمدەتوانی موسڵمان ببم و تا کۆتایی ژیان وەك ئاژەڵێك ژیانم بەسەر دەبرد.. من لەو ژیانەدا تەنها بەدوای تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆمەوە بووم، هیچ بایەخێکم بۆ خۆم نەهێشتبووەوە.. لە منداڵیدا ئارەزووم ئەوە بوو کە ببم بە پەرستار، ئێستاش کە موسڵمان بووم بەو ئارەزووەی خۆم گەیشتووم).

بەڵێ ئەو بە ئارەزووەکانی خۆی گەیشتووە و ئێستا ڕێگای هیدایەتی پەیدا کردووە، ئەو تا دوێنێ هەموو خواستەکانی دنیای هەبوو، سەروەت و سامان، هەوەس و ئارەزوو، بەڵام ئێستا حەقیقەت و ڕاستیی هەیە، ئارامیی هەیە، بڕوابەخۆبوونی هەیە، شتێکی هەیە کە پێشتر هیچ کات نەیبووە، ئەویش (ئیمان)ە.

## کچە نمایشکارێکی جلوبەرگی فەرەنسی موسڵمان دەبێت

### ئا: دایکی نێرگز

بە خەیاڵی کێدا دێت کچێك لەوپەڕی شۆرەت و ناوبانگیدا واز لە هەموو شتێك بهێنێت و لە فەرەنساوە بچێتە ئەفغانستان و ببێتە پەرستار و لە شاخە سنوورییەکاندا خزمەت بە موجاهیدان و لێقەوماوانی شەڕی ئەو وڵاتە بکات؟!

ئەمە ئەو واقیعەیە کە ئێستا (فابیان)ی کچە نمایشکاری فەرەنسیی تێدایە. ئەم خانمە ٢٨ بەهاری تەمەنیەتی و لە کاتێکدا لەناو ناوبانگ و تیشکی کامێراکاندا نوقم بوو، خوای گەورە هیدایەتی دەدا و ڕوو دەکاتە ئیسلام و دەست لە هەموو شتێك هەڵدەگرێت، لەو پێناوەشدا ناو و ناوبانگ جێ دەهێڵێت، دوای ئەوەش ڕوو دەکاتە ئەفغانستان و لەو بارودۆخە دژوارەدا وەك پەرستارێك خزمەت بە لێقەوماوانی ئەو وڵاتە دەکات.

(فابیان) بەم جۆرە باس لە موسڵمان بوونی خۆی دەکات و دەڵێت: ئەگەر فەزڵی خوای گەورە نەبوایە ژیانم تێدا دەچوو، چونکە لەو جیهانی ناوبانگەدا مرۆڤ تەنها ئاژەڵێکە و هەموو هەوڵ و مەبەستی تێرکردنی غەریزەکانیەتی، ئیتر نە مەبدەئی هەیە نە بەهایەك. ئەو دەڵێت: لە منداڵییەوە حەزم دەکرد ببمە پەرستار و خزمەت بە منداڵان بکەم، بەڵام لەگەڵ گەورەبوونمدا و دەرکەوتنی جوانیی ڕووخسار و لەشولارم، بەهاندانی ئەملاولا، بەتایبەت خێزانەکەم، ئەو

خەونەم لەباربرا و هانیان دام جوانییەکەم لە بوارێکدا بەکاربێنم سوودی ماددیی زۆری هەبێت، ئەوەی کە دەبێتە جێی سەرنجی خەڵکی و ناوبانگ پەیدا کردن، کە خەونی زۆر کچە لەو تەمەنە هەرزەدا، بێئاگا لەوەی کە ئەویش بەهای ئینسانی بوونە دەبێت وەك بوکەڵەیەکی بێ رۆح و بێ عەقڵ و بێ شەرم و حەیا، تەنها جەستەیەکی جوڵاو بێت، دەبێت برۆی بەجۆرێك خواردن و خواردنەوەشت بەدەست خۆت نەبێت، بەدەر لەمانەش دەبێت هەموو هەست و نەستێکت بەرامبەر بە ئینسانەکان لەدەست بدەیت و بە جوڵەکانت بیانوروژێنیت و گاڵتە بە عەقڵ و دڵیان بکەیت، ژیانم بەم جۆرە تێپەڕاند تا ئەو کاتەی لە سەفەرێکدا بۆ لوبنان چەند دیمەنێك سەرنجیان ڕاکێشام و لەیەك ساتدا هەموو ئەو دونیا ساختەیەی تێیدا دەژیام، لەبەرچاوم کەوت، بۆیە لەوێ مامەوە و لەوێوە چوومە ناوچە سنوورییەکانی ئەفغانستان و ئەو کاتە پەییم بە حەقیقەتی ئینسانی بوون بەرەو ڕێگای هیدایەت و ڕووناکیی ئیسلامی بردم، لە تێکەڵاوبوونی ئەوماڵانەی بەهۆی جەنگەوە ئاوارە بوون، لەو ناوچە سەختانەدا ئیسلامم وەك دین و دەستوور بۆ ڕێبازی ژیانم هەڵبژارد. دەستم کرد بە فێربوونی زمانی عەرەبی و قورئان و بنەماکانی ئیسلام، ئەو موسڵمانبوونەم بۆ خاوەنکارەکانم هەروا ئاسان نەبوو. زۆر هەوڵیاندا لە ڕێگای دیاریی گرانبەها و زیادکردنی مانگانەکەم بۆ سێ ئەوەندەی جاران، پەشیمانم بکەنەوە، بەڵام بێ سوود بوو، دواتر کەوتنە پڕوپاگەندە و بڵاوکردنەوەی وێنەکانی پێشووم وەك پۆستەر، بە شوێنە گشتییەکانی شارەکانی ئەفغانستاندا هەڵیانواسی، تاوەکو لەو ڕێگایەوە لە خشتەم بەرن، بەڵام ئەو هەوڵانەشیان ناکام و بێ ئەنجام بوو، چونکە من ئێستا بە موسڵمانبوونم و پۆشینی حیجابی ئیسلامی، وەك پۆڵایەك وەهام هیچ یەك لەو ڕەشەبایانە توانای لەرزاندنمیان نییە، ئەوە هێزی ئیمانە سەربەستی و هەست بەخۆکردن و ئیستیقامەتی پێ بەخشیوم.

ئەم خانمە لە کۆتایی قسەکانیدا دەڵێ: هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ئەو دەستانەی چەندین کاتژمێر کاتم بۆ جوان کردن و نەرم و بریقەداربوونی بەفیڕۆدەدا، ئێستا و لەم بارودۆخە سەخت و دژوارەدا بەم کارە قورسانەوە خەریکیان بکەم، بەڵام دەزانم ئێستا جوانی و درەوشاوەیی و پاکیی ڕاستەقینەیان هەیە، چونکە هەستیان تێدایە.

## تۆنی بلێر هەموو ڕۆژێك قورئان دەخوێنێت

تۆنی بلێری سەرۆکوەزیرانی پێشووی بەریتانیا، لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ گۆڤاری (ئۆبزیرڤەر ماکارین)دا دەڵێت: ڕۆژانە قورئان دەخوێنم بۆ ڕووناککردنەوەی هزر و مێشکم، بۆ تێگەیشتن لەوەی لە دەوروبەرم ڕوو دەدەن، سەرەڕای ئەوەی یارمەتیدەرێکی باشم دەبێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکەی پێم سپێردراوە، وەك نێردراوی تایبەت بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لەلایەن هەریەك لە یەکێتیی ئەوروپا و نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکا و ڕووسیاوە بۆ چارەسەری کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل هەوڵ دراوە.

لە درێژەی چاوپێکەوتنەکەیدا باس لە گەورەیی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەکات و بە جووڵێنەرێکی بەهێزی شارستانی و ڕۆشنبیری وەسفی دەکات و قورئانیش بە چاکساز و چارەسەرێکی گشتگیر دادەنێت، کە برەو بە زانست و زانیاری دەدات، هەموو خورافات و شتێکی پڕوپووچ ڕیشەکێش دەکات، هەروەها دەڵێت: قورئان کتێبێکی کردەییە و زۆر لە زەمەنی خۆی پێشکەوتووە، لە بواری یاسا و دەستوور، بەتایبەت بواری ئافرەت و هاوسەرگیری زۆر تێروتەسەلە و لەگەڵ عەقڵدا دەگونجێت.

ئەم هەڵوێستەی تۆنی بلێر لەوانەیە کاریگەریی لورینی خوشکی لورای خێزانیی لەسەر بێت، پارساڵ بە موسڵمانبوونی و دەرکەوتنی بە حیجابەوە لایەنگرانی سەرسام کرد.

# جاك ئيف كۆستو
# :(Jacques-Yves Cousteau)







## إسلام .. عالم البحار المشهور
## د، فاروق المناصير

جاك ئيف كۆستۆ له ١١ی كانونی دووەمی ساڵی ١٩١٠ لەدایك بووه، له ٢٥ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٧دا كۆچی دوایی كردووه، ئەفسەرێكی دەریایی بوو، زانایەكی گەورەی ژینگه و ناو دەریاكان و توێژەر و نووسەرێكی فەرەنسی بوو، ئەندامی ئەكادیمیای فەڕەنسی بوو.

له ساڵی ١٩٧٧دا ئەكادیمیەی زانستەكان له پاریس كه زیاتر له پێنج هەزار زانا ئامادەبوون له بوارەكانی زانست و زیندەوەرزانی و دەریاوانی، له سەرەتایی دەستپێكردنی وتارەكەیدا شایەتومانی هێنا و وتی: (أشهد أن لا إلة إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله).

بەڵێ.. جاك كۆستۆ گەورەترین زانای دەریاكان، له سەدەی بیستدا موسڵمان بوو، ناوبراو باسی موسڵمانبوونی خۆی بۆ ئامادەبووان كرد و وتی:

بەڵگە و نیشانەی گەورەیی پەروەردگارم بینی لە دەریاکاندا، کە ساڵانێکی زۆری تەمەنم لێکۆڵینەوەم لەسەر کردن، پاشان ئەوەی من گەیشتمێ بینیم لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە لەپێش چواردە سەدەوە.

ئامادەبووان لایان سەیر بوو، وتیان: وەك چی؟

وتی: ئەمە مەسەلەیەکە بۆ خۆم بینیم.

دیراسەی گەورەیی (جبل طارق) و (باب المندب)م کرد، (جبل طارق) دەریای سپیی ناوەڕاست و ئۆقیانووسی ئەتڵەسی بە یەك دەگەیەنێت، (باب المندب)یش دەکەوێتە نێوان دەریای سوور و دەریای عەرەب و ئۆقیانووسی هیندییەوە.

دەبوایە ئۆقیانووسە گەورەکە ئاوەکەی تێکەڵ بە دەریا بچووکەکە ببوایە، کەچی شتی وا ڕووی نەداوە و لە نێوانیاندا دەریایەکی تر هەیە کە جیایان دەکاتەوە، خاسیەت و سیفاتی تایبەتی خۆی هەیە لە گشت لایەنێکەوە کە جیاوازە لە ئۆقیانووسەکەش و لە دەریا بچووکەکەش، بۆ نموونە: پلەی گەرمیی ئاوەکەی و جۆری ماسی و ڕووەکەکانی و ڕێژەی خوێ و...هتد.

کە من ئەمەم دۆزییەوە پاش ساڵانێکی زۆری تەمەنم لە دیراسە و لێکۆڵینەوەی شەو و ڕۆژ، هاوەڵێکی دەریاوانی یەمەنیم پێی وتم: ئەمەی تۆ دەیڵێی لە قورئاندایە (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ، بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ) (الرحمن: ١٩-٢٠)، یان دەفەرموێ: (أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَاراً وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَاراً وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) (النمل: ٦١)، ئەم ئاماژە زانستییانە بەڵگەیەکی گەورەن کە ئەم قورئانە وەحییە و لە خواوە نێردراوە بۆ موحەممەد پێغەمبەر ﷺ، ئەگەرنا کێ هەواڵیدا بەو زاتە موبارەکە کە حەواجیز و جیاکەرەوە هەیە لە نێوان دەریاکان و ئۆقیانووسەکاندا؟ بە ڕاستی خوایە کە ئەوەی فێرکردووە.

بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر هۆڵەکەدا، دەرزیت هەڵدایە گوێت لە دەنگی دەبوو، هەموو لە وتەکانی ئەو زانایە ئەبلەق بووبوون.

کۆستۆ بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و وتی: ئایەتێکی تریش زۆر کاری تێکردم کە دەفەرموێت: (وَالطُّورِ * وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ * فِي رَقٍّ مَّنشُورٍ * وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ * وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ * وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ) (الطور: ١-٦)، بەڕاستی ئایەتێکی سەیر و ترسناکە (وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ) واتە: دەریای گڕگرتوو، ئەمەش ئێمە دۆزیمانەوە و وێنەشمان گرتووە، کە بنی دەریا و ئۆقیانووسەکان لە زۆر شوێندا بەهۆی بورکانەوە یەك پارچە ئاگرە، ئاگر و ئاو کە دژ بە یەکن چۆن کۆدەبنەوە؟ پێتان نالێم ئەم قورئانە لە خواوەیە و بۆ موحەممەد ﷺی ناردووە؟

ئینجا ئەم دیاردە سروشتییانەی پیشانی ئامادەبووان دا و بۆی شەرح کردن، (إسلام ..عالم البحار المشهور، د، فاروق المناصير).

## موسڵمانبوونی براون:

براون دەریاوانێکی بەریتانییە و ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: (أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ) (النور: ٤٠)، ئەم ئایەتە کە باسی تاریکیی ناو قووڵایی دەریا دەکات، لەم سەدانەی دواییدا زانایان دۆزییانەوە بەهۆی چوونە ژێر دەریاوە.

میستەر براون بە زانایەکی موسڵمانی هیندیی وت: ئایا پێغەمبەرەکەتان گەشتی دەریایی کردووە؟

لە وەڵام دا وتی: نەخێر.

براون وتی: کەواتە کێ زانستی دەریایی داوەتێ؟

زانا موسڵمانەکە لێ پرسی: مەبەستت چییە؟

براون وتی: ئایەتێکم لە پەڕاوی ئیسلامدا (قورئان) خوێندووەتەوە کە تەنها شارەزایانی بواری دەریاکان دەزانن چ ئاماژەیەکی مەزنی تێدایە، ئینجا ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە و وتی: موحەممەد زانیارییەکی لەبارەی دەریاکانەوە نەبووە و نەخوێندەوار بووە، لە هیچ زانکۆ و پەیمانگایەکیش نەیخوێندووە، کێ ئەو زانستە گەورەیەیی داوەتێ؟ دیارە ئەوە تەنها سرووشە و خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی، بۆیە من شایەتی دەدەم (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله).

## موسڵمانبوونی زانایەکی ئۆکرانی

## بە هۆی توێژینەوە زانستییەکانەوە:

موسڵمانانی بنکەی ئیسلامی لە (کییف) لە ئۆکرانیا، ڕاهاتبوون لەسەر بینینی کەسێك، پیاو بێت یان ئافرەت، کە دێت و لە مزگەوتەکەیاندا موسڵمان دەبێت... یەکێ لەوانەی کە موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند (دیمیتری بۆلیاکۆف) بوو کە لە ڕێی زانستی فیزیاوە قەناعەتی بۆ درووست بووە کە ئیسلام پەیامی خوایە و قورئان کەلامی خوایە.

دوای ئەوەی هاتە ناو مزگەوت و دوای نوێژ لە تەنیشت پێشنوێژەکەوە دانیشت، لەگەڵ یەکێك لە چالاکەوانی نووسینگەی ناساندنی ئیسلام لە مەڵبەندی ئیسلامی، مامۆستا هەندێك قسەی کرد و پاشان (دیمیتری) ئەم وشانەی دووبارە کردەوە (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله).. دیمیتری دەستی کرد بە باسکردنی گەشتەکەی بەرەو باوەڕ.

ناوبراو ئاماژەی بەوە دا کە کار دەکات لەگەڵ گرووپێکی توێژینەوەی زانستی لە بواری فیزیایی بۆشاییدا (vaccum physics)، بە سەرۆکایەتیی

پرۆفیسۆر (نیکۆلای کۆسینیکۆف)، کە یەکێکە لە زانا ناودارەکانی ئەو بوارە، هەستاون بە دروستکردنی چەند مۆدێلێك و تاقیکردنەوەیان لەسەر کردوون بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەسەر بیردۆزێکی نوێ، خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا لێکدەداتەوە، توانییان کە ئەو بیردۆزە بسەلمێنن، دواتر بیستوویەتی کە فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە لەو بارەیەوە و هەموو موسڵمانانیش دەیزانن و لە ناوەرۆکی بیروباوەڕیانە و تەئکیدی ڕاستێتی بیردۆزەکەیان دەکات، بێگومان بوو لەوەی تاکە سەرچاوەی ئەم زانیارییە کە تەمەنیان لە ١٤٠٠ ساڵ زیاترە، تەنها خوای بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرەیە.

ئەو بیردۆزەی پرۆفیسۆر (کوسینیکۆف) ڕایگەیاندووە، بە نوێترین و بوێرترین بیردۆز دادەنرێت لە لێکدانەوەی دیاردەی خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا، ئەم گرووپە هەستاون بە دیزاینکردنی ئەو مۆدێلە، کە بریتییە لە تۆپێکی پڕ لە ماددەی قەسدیری تواوە و دەخرێتە ناو بوارێکی موگناتیسی، تۆپە پڕ لە قەسدیرەکە دەستدەکات بە خولانەوە بە دەوری تەوەرەکەیدا.

ئەم دیاردەیەیان ناونا (کرداری تەواوکاری ئیلیکترۆماگنۆدینامیکی) کە لە شێوە گشتییەکەیدا لاسایی خولانەوەی زەوی دەکاتەوە بە دەوری تەوەرەکەیدا.. لە جیهانی ڕاستەقینەماندا وزەی خۆر وزەیەکی جوڵێنەرە و بوارێکی موگناتیسی دروستدەکات، پاڵ بە زەوییەوە دەنێت بە دەوری تەوەرەکەیدا بخولێتەوە، جووڵەی زەوی، خێرا بێت یان هێواش، دەگونجێت لەگەڵ چڕێتیی وزەی خۆر و پێگە و ئاڕاستەی جەمسەری باکوور بە پێی ئەوە دیاری دەکرێت.

تا ساڵی (١٩٧٠ز)، تێبینیی ئەوە کرابوو کە جەمسەری موگناتیسیی زەوی بە خێرایی کەمتر لە ١٠ کم لە ساڵێکدا دەجووڵێتەوە، بەڵام لە ساڵەکانی دواییدا خێراییەکەی زیادی کردووە تا گەیشتووەتە ٤٠ کم لە ساڵێکدا، بەڵکو لە ساڵی

(٢٠٠١ز)دا جەمسەری موگناتیسی زەوی بە یەك جار ٢٠٠ کم جوولا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ـ لەژێر کاریگەریی ئەم هێزە موگناتیسییانەدا ـ کە دوو جەمسەرە موگناتیسییەکەی زەوی شوێنەکانیان دەگۆڕنەوە، ئەوە دەگەیەنێت جوولەی زەوی بەرەو ئاڕاستەی پێچەوانە دەڕوات، ئەو کاتە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت!

ئەم زانیارییانە (دیمیتری) لە کتێبێکدا نەیخوێندووەتەوە و لە خەڵکیشی نەبیستووە، بەڵکو دوای گەڕان و تاقیکردنەوە پێی گەیشتووە، کاتێکیش دەگەڕا بە کتێبە ئاسمانییە جیاوازەکاندا، جگە لە ئیسلام، هیچ شتێکی چنگ نەکەوت ئاماژە بۆ ئەو زانیارییانە بکات.

جا کە (دیمیتری) ئەو فەرموودەیەی بیست، کە موسلم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوو هورەیرەوە ـ خوای لێی ڕازی بێت ـ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من تاب قبل أن تطلع الشمس من مغربها تاب الله عليه)، واتە: (هەر کەسێك تەوبە بکات پێش ئەوەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێت، خوای گەورە تەوبەکەی لێ قبووڵ دەکات)، ئەمە وای لێکرد بێت بۆ بنکەی ئیسلامی و موسڵمانبوونی خۆی رابگەیەنێت، ئایا کاتێك شایەتوومانی هێنا ئەو بیردۆزەی بە خەیاڵدا دەهات؟! بە ڕاستی نیشانەیەك بوو خوای گەورە بۆی ئاسان کردبوو تا ڕێگای هیدایەت بدۆزێتەوە و پێیشی گەیشت، ئەوەتا ئێستا لە بەردەم کانیاوێکی پڕدایە و خەریکە لێی هەڵچنێت و ڕووح و ئەقڵی لێ پڕ بکات.

## بۆچی و چۆن مامۆستای فیزیا و ئەندامی ئەکادیمیای پزیشکیی ڕووسی و کیت موور موسڵمان بوون؟

یەکێك لەو زانا بەڕێزانەی ئامادەی ئەو کۆنفرانسە بووبوو، دەڵێت: کە داوەتنامەی بۆ هات بەشداریی ئەو کۆنفرانسە بکەین، دوودڵ بووم لە چوون یان نەچوون، لە دڵی خۆمدا وتم: چی بکەین لە پایتەختی کوفر و ئیلحاد لە مۆسکۆ

که حەفتا ساڵە خەریکی چاندنی بێباوەڕییە، دوایی دۆستان پێیان وت: هەر دەبێ بڕۆین مادام داوەتنامەمان لە ئەکادیمیای پزیشکیی ڕووسییەوە پێگەیشتووە، بەشداریی کۆنفرانسەکەمان کرد و باسی هەندێ ئایەتی کەونی کرا، وەك (يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ) (السجدة: ٥)، یەکێك لە زانا موسڵمانەکان هەستا و وتی: ئەگەر هەزار ساڵ دوو بڕی جیاواز لە کات بگەیەنن ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر جیاوازیی خێرایی، پاشان دەستیکرد بە حیسابکردنی ئەو خێراییە و وتی: بێ گومان دەبێت هەزار ساڵی مانگی (قمري) بێت، چونکە عەرەبەکان کاتی خۆی مانگی خۆرییان (شمسي) نەدەزانی، ساڵی مانگییش دوانزە مانگە و ماوەی هەر مانگێك بریتییە لە خولی مانگ بە دەوری زەویدا، ئەم خولەش بە وردی حیساب کراوە و بریتییە لە ٤،٢ بلیۆن کم، ئینجا وتی: ٤،٢ بلیۆن کەڕەتی ١٢ بکرێت ـ کە بریتییە لە ژمارەی مانگەکانی ساڵ ـ ئینجا کەڕەتی هەزار ساڵ، پاشان ئەم ئەنجامە دابەش بکرێت بەسەر ٢٤ ـ دا کە بریتییە لە ژمارەی کاتژمێرەکانی ڕۆژ ـ پاشان بەسەر ٦٠ دا ـ خولەکەکان ـ پاشان ٦٠ ـ چرکەکان ـ، گەیشتووەتە خێراییەك خێراتر لە ڕووناکی..

ئەمەش وای کرد زانایەکی بواری فیزیا کە ئەندامی ئەکادیمیای ڕووسی بوو، هەستێ و بڵێت: من تا ئێستا وامدەزانی ـ پێش ئەم کۆنگرەیە ـ کە لە دەرکەوتووەکان و شارەزاکانی بواری فیزیا و خێرایی ڕووناکیم، کەچی وا ئێستا شتێك دەڵێن کە لە زانینەکەی من زیاترە، داوای لێبووردن دەکەم کە من نەمتوانیوە بگەمە ئەم زانستە تازەیە، بۆیە وا شایەتمان دێنم و دەڵێم: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)، بە دوای ئەمدا چوار وەرگێڕ، کە بە هیچ شێوەیەك قسەمان لەگەڵدا نەکردبوون، لە ژوورە شووشەکەدا دانیشتبوون قسەکانیان وەردەگێڕا لە عەرەبییەوە بۆ ڕووسی و بە پێچەوانەشەوە، موسڵمان

بوون، دواتریش پێیان ڕاگەیاندین کە پاش ئەوەی تەلەفزیۆنی ڕووسی ئەو کۆنفرانەسەی پیشاندا، ٣٧ زانای تری ڕووسی موسڵمان بوون.

لە کۆنفرانسەکەدا کیت مۆرمان لەگەڵ بوو کە پرۆفیسۆرە لە بواری کۆرپەلەزانیدا، زۆربەی پزیشکانی جیهان دەیناسن و، پەڕاوێکی هەیە بەناوی (The Developing Human) و بۆ زیاتر لە ٢٥ زمان وەرگێڕدراوە و لە زۆربەی کۆلێژە پزیشکییەکانی جیهاندا دەخوێنرێت.

ناوبراو لە کۆنفرانسەکەدا وتی: (دەستەواژە قورئانییەکان لە بارەی قۆناغەکانی کۆرپەلەوە ئەوەندە ورد و گشتگیرە، کە زانستی سەردەم هێشتا پێی نەگەیشتووە، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی خوایە و موحەممەد ﷺ پێغەمبەرە لەلایەن خواوە نێردراوە)، وتیان: کەواتە تۆ موسڵمان بوویت، وتی: ئێستا لەژێر فشارێکی زۆردام، بەڵام لاتان سەیر نەبێت کە موسڵمانبوونم راگەیاند[٢٤].

پرۆفیسۆر کیت مور یەکێکە لە گەورەترین زاناکانی توێکارزانی و کۆرپەلەزانی لە جیهاندا، ساڵی ١٩٨٤ دیارترین خەڵاتی کۆمەڵەی کەنەدیی بۆ تایبەتمەندیی توێکارزانی وەرگرتووە لە کەنەدا.

١٢- ئیعجازی قورئان: وشەی (الإعجاز) لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە، بەڵام ئەو وشانەی لە ٣ پیتی (ع، ج، ز) هەڵئەگۆزرێت، بریتین لە: أعجزت، نعجز، نعجزه، ليعجزه، يعجزون، عجوز ٢، عجوزاً ٢، أعجاز ٢، معاجزين ٣، بمعجز، معجزي ٢، معجزين ٩... هەمووشیان لە دەرەوەی مانای ئیعجازی قورئان یان

---

[٢٤] ئەوەبوو پاش ماوەیەك موسڵمانبوونی خۆی راگەیاند و لە بەرنامەی تەلەفزیۆنیدا باسی گەورەیی قورئان و ئیسلامی کرد و تەنانەت بۆ قوتابییەکانی خوێندنی باڵا کە خۆی سەرپەرشتییان دەکات، قۆناغەکانی کۆرپەلەی قورئانیان بە وانە پێدەڵێتەوە، کە بەلایەوە زۆر راستە و چاکترە لەو قۆناغانە کە زانست پۆلێنی دەکات بە هەفتەی یەکەم و دووەم و .. هتد. (وەرگێڕ).

موعجیزەی قورئانن، کەواتە مانای وشەی (موعجیزە) چییە و (موعجیزەی قورئان) لە کوێدا خۆی دەبینێتەوە.

موعجیزە واتە دەرچوون لە یاساکانی بوونەوەر، خوای گەورە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرەکانی لای خەڵکی، دەینێرێ، بۆ دامەزراندنی ئیمانیان، لەبەرئەوەی بۆ خەڵك بسەلمێت کە ئەوانە نێردراوی ئاسمانن و پشتیوانییان لێ دەکات و سەریان دەخات، کاتێکیش خوا پشتیوان بێت هەموو مرۆڤـ دەستەوسانن لە ئاستیدا[٢٥].

پێغەمبەریش ﷺ، لەو مانایەدا دەفەرموێت: (ما من نبی ولا رسول إلا أُوتي ما مثله آمن به البشر، وإنما كان الذي أوتيته وحياً أوحي به إليّ، وإنى لأرجو أن أكون أكثرهم تابعاً يوم القيامة)، (البخاري).

قورئان کاتێك باسی ململانێی نێوان پێغەمبەران و قەومەکانیان دەکات، ئاماژە بۆ موعجیزەی تایبەتی هەر کام لەو قەومانە دەکات. هەر پێغەمبەرێك ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ موعجیزەیەکی هەبووە کە بۆ ئەو رۆژگارەی خۆی دەست بدات و خەڵکی وا لێبکات بڕوا بێنن، هەر موعجیزەیەکیش سیفەتی تایبەتی خۆی هەبووە، گرنگترین ئەو سیفەتانەش:

أ- دەبێت موعجیزەکە دەرچوون بێت لە یاسا سروشتییەکان.

ب - دەبێت موعجیزەکە لە بابەتێکدا بێت کە ئەو قەومە تێیدا لێهاتوو و بەهێز بن، تا تەحەداکە بەهێز بێت:

١- کۆمەڵگای سیحر و فێڵ و پووچەڵکردنەوەی سیحر.

٢- کۆمەڵگای پێشکەوتنی پزیشکی و داوودەرمان و چارەسەر.

٣- کۆمەڵگای پەیکەر و بتەکان.. ڕزگاربوون لە ئاگر.

---

٢٥ محمد متولي الشعراوي، معجزة القرآن، ص٧.

٤- کۆمەڵگای ڕەوانبێژی.. زمانێکی قەشەنگ.

بەم شێوەیە هەموو پێغەمبەرێك موعجیزەیەکی تایبەتی خۆی هەبووە، تەحەدایان دەکات و ناتوانن نموونەشی بێنن.

ج- موعجیزە تایبەتییەکانی پێغەمبەران بۆ پشتگیریی پەیامەکەیان بووە و بەشێك نەبووە لە ئەسڵی پەیامەکە، موعجیزەی دەست و عەساکەی موسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ لە ئەسڵی ئایینی جولەکە و بنەمای دینەکەیانەوە نەبوو. هەروەها شێوازی لەدایکبوونی عیسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ و ئەو موعجیزانەی لەسەر دەستی ڕووی دەدا، وەك زیندووکردنەوەی مردووەکان ـ بە ویستی خوا ـ لە ئەسڵی ئایینی مەسیحی و بنەمای دینەکەیان نەبوو، بە پێچەوانەی موعجیزەی پێغەمبەرەوە ﷺ، (قورئانی پیرۆزە) بنچینەی ئایینی نوێ بوو، هەموو بوارەکانی ژیانی گرتەوە، ئەو دەمەی خۆری ئیسلام بە وشەی (إقرأ) هەڵهات، بە وشەی (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلامَ دِيناً) (المائدة: ٣) تەواو بوو.

ح ـ موعجیزەی ماددی ناگۆڕێت. دەرکەوتنی دەست لای موسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ ناگۆڕێت، هەروەها گۆڕانی عەساکەی بۆ مار. شارەزایانی ئەو سەردەمە چاك دەیانزانی کە ئەوە جادوو نییە و چاویان تێك نەچووە، بەڵکو ئەوانە ڕاستین. بۆیە کاتێك جادووکەران عەساکەی موسایان بینی بووەتە ئەژدیهایەك و مارەکانی ئەوانی هەموو قووت داوە، بۆیان ڕوون بووەوە ئەوە جادوو نییە، بەڵکو موعجیزەیەکی ڕاستەقینەیە خوای گەورە پێی بەخشیوە (فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ، قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ، رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ) (الشعراء: ٤٦- ٤٨).

خ- موعجیزەی دوا پێغەمبەریش ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ قورئانە، لە ژیانی خۆیدا تەحەددای ڕەوانبێژانی پێ کردووە کە وەکو ئەو بهێنن،

تەحەدداکەش لە سورەتە مەککییەکان و مەددەنییەکانیشدا هاتووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەحەداکە دەبێت تا قیامەت بڕ بکات.

ئەگەر وشەی (افتَرَاه) وەربگرین، دەبینین لە ٧ شوێندا هاتووە:

١- (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) (يونس: ٣٨) تەحەددایە.

٢- (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) (هود: ١٣) تەحەددایە.

٣- (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي وَأَنَاْ بَرِيءٌ مِّمَّا تُجْرَمُونَ) (هود: ٣٥) تەحەددایە.

٤- (بَلْ قَالُواْ أَضْغَاثُ أَحْلاَمٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ) (الأنبياء: ٥) تەشویش دروستکردنە.

٥- (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاؤُوا ظُلْماً وَزُوراً) (الفرقان: ٤) تەشویش دروستکردنە.

٦- (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْماً مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ) (السجدة: ٣) تەئیدی خوایە.

٧- (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئاً هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَى بِهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ) (الأحقاف: ٨) باسی صیدقی پێغەمبەرە ﷺ.

ئەم هەڕەشە جۆراوجۆرانەش لە قورئانی پیرۆزدا دژی ئەوانەی گومان دەخەنە ڕاستگۆیی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە، کە گوایە درۆی بە دەم خواوە کردووە، لە کۆمەڵێك ئایەتدا هاتووە، هەندێك نموونە دەهێنینەوە:

١- (قُل لَّوْ شَاء اللّهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلاَ أَدْرَاكُم بِهِ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُراً مِّن قَبْلِهِ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (يونس: ١٦).

٢ـ (وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ * لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ * ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ * فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ) (الحاقة: ٤٤ـ ٤٧).

٣ـ (وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلاً، إِلاَّ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ إِنَّ فَضْلَهُ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيراً) (الإسراء: ٨٦– ٨٧).

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکانی تەحەددا، دەبینین دابەشکراوە بەسەر سورەتە مەککی و مەدەنییەکاندا وەکو یەك:

١– (وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَنْ يُفْتَرَى مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ، أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنْ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ) (يونس: ٣٧– ٣٨)، سورەتێکی مەککییە.

٢– (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنْ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ) (هود: ١٣)، سورەتێکی مەککییە.

٣ـ (قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً * وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَـذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلاَّ كُفُوراً) (الإسراء: ٨٨ ـ ٨٩)، سورەتێکی مەککییە.

٤ـ (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ * فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (البقرة: ٢٣ـ ٢٤)، سورەتێکی مەدەنییە.

لە لایەکی تریشەوە ئەگەر سەیری ئەو ئایەتانە بکەین کە بە (وما کنت) دەستپێدەکەن، بە ڕاستی یەقینمان بۆ دروست دەبێت ـ وەکو زانایانی ئیعجاز بۆیان دروست بووە ـ کە پێغەمبەر ﷺ کارەکەی بریتی بووە لە وەرگرتنی وەحی و بانگەشەکردن بۆی، هەر چۆنێك بێت وشەکانی ناو ئایەتەکان، ئەوە

پیشان دەدەن کە پێغەمبەر ﷺ سەلاحیاتی دەستکاریی هیچ وشەیەکی قورئانی نییە و هەمووی لە خواوەیە:

١ـ (وَمَا كُنْتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنْتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ) (آل عمران: ٤٤) هەواڵی غەیبییە.

٢ـ (مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَـذَا) (هود: ٤٩) هەواڵی غەیبییە،

٣ـ (وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُواْ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ) (یوسف: ١٠٢) هەواڵی غەیبییە.

٤ـ (وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ الشَّاهِدِينَ) (القصص: ٤٤) هەواڵی غەیبییە.

٥ـ (وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَى إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ) (القصص: ٨٦)، چاوەڕێی پەیام بۆ هاتن.

٦ـ (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ) (الشوری: ٥٢) زانستی پێغەمبەرایەتی.

٧ـ (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨) چاوەڕێی پەیام بۆ هاتن.

ئینجا ئەو ئایەتانەی کە تەئکید لەسەر ئاستی زانستی پێغەمبەر ﷺ دەکەنەوە سەبارەت بەو وەحییەی بۆی نێردراوە:

(قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ، أَنْتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ، مَا كَانَ لِي مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلإِ الأَعْلَى إِذْ يَخْتَصِمُونَ، إِنْ يُوحَى إِلَيَّ إِلاَّ أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ) (ص: ٦٧- ٧٠)، زانستی پێغەمبەرایەتی و وەحی و چاوەڕێی پەیام بۆ هاتن.

دـ هەندێك ئایەت بە شێوەیەك دادەبەزی کە لەگەڵ ئارەزووی ئەو نەبوو.. لە ڕایەکدا بۆی چووە بە هەڵەی دادەنێ.. فەرمانی شتێکی پێ دەکات

قورسە بەسەریەوە، کەمێك دوای بخات قورئان زۆر بە توندی گلەیی لیَ دەکات و ڕەخنەی لیَ دەگریَ، هەتا ئەگەر لە شتێکی گەورەشدا نەبێت:

١ـ (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (التحريم: ١) شاردراوەکانی دەروون و نهێنییەکانی خێزان.

٢ـ (وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ) (الأحزاب: ٣٧) هەڵوەشاندنەوەی عادەت و تەقالیدی نەشیاو.

٣ـ (عَفَا اللّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ) (التوبة: ٤٣) دەربارەی دیلەکانی بەدر و وەرگرتنی فیدیە.

٤– (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ) (التوبة ١١٣) پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ دووڕووەکاندا.

٥ـ (عَبَسَ وَتَوَلَّى * أَن جَاءهُ الْأَعْمَى * وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى * أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى * أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى * فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى * وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّى * وَأَمَّا مَن جَاءكَ يَسْعَى * وَهُوَ يَخْشَى * فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّى) (عبس: ١ـ ١٠)، ڕووداوەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم.

ئەم ئایەتەش بنەمایەکی کۆمەڵایەتیی گرنگی هێنا بۆ موسڵمانان تا ڕۆژی دوایی، کە پلەی ڕێزداریی کۆمەڵایەتی بەپێی ئایەتی (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)ە دەبێت. پێغەمبەر ﷺ دوای ئەم ڕووداوە زیاتر گرنگیی دەدا بە ئیبن مەکتوم، هەر کاتێك بیبینیایە دەیفەرموو: (أهلاً بمن عاتبني فيه ربي)، دووجاریش بە جێگری خۆی دایناوە دوای کۆچکردن بۆ مەدینە.

ئێستاش پێمان باشە هەندێ لایەنی ئیعجازی قورئان باس بکەین بە کورتی و هەرکەس ویستی دەتوانێت لە پەڕاوەکانی تایبەت بە ئیعجازدا دەستی بکەوێت:

١ـ له مێژووی مرۆڤایەتیدا پەڕاوێك نییه كه له ٢٣ ساڵدا نووسرابێت و دانرابێت، بەش بەش بێت، هەر جارەی له لایەكەوە شتێكی بۆ زیاد بكات و پاشان یەكەم نووسینی و دواهەمین نووسین هەمان بەلاغەت و فەصاحەتیان هەبێت، ئەگەر سەیری سوورەتە مەككییەكان بكرێت هەمان بەلاغەت و جوانیی داڕشتنی سوورەتە مەدەنییەكانی هەیە.. (بۆ نموونه: سورەتی (الإسراء) هاوبەشه له مەككی و مەدەنی. سورەتی (البقرة) له سەرەتای كۆچكردنەوە دەستی كرد به دابەزین و نزیكی ٩ ساڵی خایاند).

٢ـ كافرەكان داوایان دەكرد قورئان به یەكجار بێته خوارەوە.. (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلاً) (الفرقان ٣٢).

پێشەوا موحەممەد ئەبو زوهره ـ به ڕەحمەت بێت ـ لەم لایەنەی كۆڵیوەتەوە، دەڵێت:

١ـ قایمكردن و دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ به بەردەوام دابەزینی وەحی.

٢ـ قایمكردن و دڵدانەوە به قورئان به لەبەركردنی بەشه دابەزیوە بەردەوامەكانی قورئان دەبێت، ئەم قورئانه دابەزیوە بۆ ئەوەی لەبەربكرێت، نەوە له دوای نەوە، ئەوەشی له دڵەكاندا دەپارێزرێت گۆڕانی بەسەردا نایەت.

٣ـ خوێندنەوە و (تەرتیل)ی قورئان، ئەم دەقەش ئەو سوودەی لێ وەردەگیرێت كه شێوازی خوێندنەوەی قورئان خوای گەورە فێری كردوون.

هۆیەكی تریش هەیه بۆ دابەزینی قورئان به بەش بەش، ئەوەیه لەبەرئەوەی كه عەرەب نەخوێندەوار بوون و نووسینیان كەم بوو، ئەگەر به یەكجار بهاتایه زۆر زەحمەت بوو هەموو قورئان بنووسنەوە و هەڵه و پەڵەی زۆری تێدا نەكەن.

ئینجا دابەزینی قورئان بە بەش بەش، بۆ چارەسەری کێشە و بۆ ڕێنمایی ڕۆژانەیان بوو، دیارە بەو جۆرەش زیاتر کاریگەریی هەبوو لەسەریان، یەکەم کەسیش دەبێت کارەکانیان بۆ ڕوون بکاتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ) (النحل ٤٤)[٢٦].

ئیمامی غەزالی کاتی خۆی ویستی بەرپەرچی خوایەتی عیسا بداتەوە - سەلامی خوای لێ بێت - لە دەقەکانی ئینجیلەوە، پەنای بردە بەر دەستنووسێکی قیبتی، چونکە زۆر هەوڵیدا نوسخەیەکی عەرەبیی ئینجیلی دەست نەکەوت لەو زەمانەدا، جا لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەسەلمێنن کە دەڵێن یەکەم دەقی مەسیحی کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی لە ساڵی (١٠٦٠)ی زاینی بووە لە لایەن کەسێکەوە بە ناوی (ابن العسال)ەوە، کەواتە لە زەمانی غەزالیدا هیچ نوسخەیەکی وەرگێڕدراوی ئینجیل نەبووە، کەواتە نەبوونی ئاوەها نوسخەیەك لە سەردەمی نەفامیدا، ئەولا ترە.

ئایا دەگونجێت تەرجەمەیەکی تەورات هەبووبێت لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ؟ قورئان باسی گفتوگۆی نێوان پێغەمبەر ﷺ و ئەحبارەکانی جولەکە دەکات لە مەدینەدا و ڕوویان تێدەکات و دەڵێت: (كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ) (آل عمران)[٢٧].

باشە دەبێت پێغەمبەر ﷺ لە کوێوە چیرۆکی پێغەمبەران و ڕووداوە مێژووییەکان و دروستبوونی مرۆڤایەتیی هێنابێت؟ بە تایبەتی:

---

[٢٦] القرآن المعجزة الكبرى، ط١، ص٢٣-٢٤.

[٢٧] الظاهرة القرآنية، مالك بن نبي، ط١، ص٣١١.

١– چیرۆکی یوسف ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ بەو درێژی و وردییە.

٢– چیرۆکی لافاوە مەزنەکە و کەشتییەکەی نوح ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ و نیشتنەوەی لەسەر شاخی جودی.

٣– چیرۆکی موسا ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ و فیرعەون و نوقومبوونی و ڕزگاربوونی لاشەکەی و مانەوەی.

٤– چیرۆکی هاوڕێیانی ئەشکەوت و (ذي القرنين).

ئەم چیرۆك و ڕووداوانەی کە ڕاستییەکانی لە سەدەکانی دواییدا دەرکەوت و ڕاستگۆیی گێڕدراوە قورئانییەکان و وردیی زانیارییەکانی دەردەخات، ئایا ئەمە یەکێك نییە لە گەورەترین لایەنە ئیعجازییەکانی قورئان؟

٤ـ پاراستنی قورئان یەکێکە لە موعجیزە نەمرەکانی، چونکە موعجیزەی پێغەمبەرەکانی پێشتر لەگەڵ کۆچی دوایی خۆیاندا کۆتایی پێ هاتووە. پاراستنی پەیامەکانیشیان دراوەتە دەست قوتابیی پێغەمبەرەکان و زاناکانیان لە زەمانی خۆیاندا، یان دواتر. کاتێك جوبرەئیل قورئانی بۆ دەهێنا، پێغەمبەر ﷺ لە ترسی لەبیرچوونەوە بە پەلە دەیوتەوە لەگەڵیدا، خوای گەورە دڵنیای کردەوە کە ئێمە لە دڵتا دەیچەسپێنین و ناهێڵین لەبیرت بچێتەوە (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ * إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ * فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ * ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ) (القيامة: ١٦ـ ١٩)، لە سورەتی (طه)شدا دەفەرموێت: (وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْماً) (طه: ١١٤).. هەروەها لە سورەتی (الحجر)دا دەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (ئایەتی: ٩).

مامۆستا موحەممەد عەفیفی دەڵێت: خوای گەورە کتێبەکەی خۆی پاراستووە، بە تاکە ڕووداوێکی مێژوویی، دووەمی نییە لە ژیاندا، کاتێك

پێغەمبەر ﷺ لە دنیای فەناوە بەرەو داری مانەوە بەڕێکەوت، هێشتا قورئان کۆنەکرابووەوە، بەڵکو هێشتا پارچە پارچە بوو لە سنگی پیاواندا و لەسەر گەڵای دارخورما و پارچە قوماش و پارچە قوڕی وشککراوە و لەتە ئێسك. ئەگەر پاراستنی قورئان بسپاردرایەتە خەڵکی، ئەوا پێغەمبەر ﷺ بەڕێزترین مرۆڤـ بوو و ئەولاتر بوو بەو کارە، لە موصحەفێکدا کۆی بکردایەتەوە.

بەڵام خوای گەورە خۆی پارێزەری کتێبەکەیەتی، دوای ئەوەی ویستی وابوو کە پێغەمبەر ﷺ ڕاسپاردەکەی بگەیەنێت، هاوەڵەکانی فێر بکات و ئایەتەکانی خوا ڕوونبکاتەوە[٢٨].

لە دیاردەکانی قورئان لەم سەردەمەدا:

١- لە هەموو کتێبخانەیەك و ماڵێك و ئۆتۆمبێلێکدا بەدەست دەکەوێت،

٢- چاپی ناوازە و هونەریی هەمەجۆر لە ئەڵمانیا و یابان و نووسینی هەموو قورئان لەسەر یەك لاپەڕە.

٣- چاپی تایبەتی ڤیدیۆ و سی دی و کۆمپیوتەر و مۆبایل.. هتد،

٤- ئێستگە و کەناڵی تایبەت بە قورئانی پیرۆز و خوێندنەوەی بە شەو و ڕۆژ.

هەروەها بە بەردەوامی چەندین چاپی (مصحف المدينة) دەردەچێت، کە بە جوانترین شێوە بە قەبارەی هەمەجۆر دابەش دەکرێت بەسەر حاجییەکاندا لە سەرتاسەری دنیادا.

ئایا ئەمانە بەڵگە نین لەسەر موعجیزەی بەردەوامیی قورئانی پیرۆز.

لەبەرئەوەی قورئان بۆ هەموو بەرەی ئادەمییە تا قیامەت، پێویست بوو موعجیزەکەی بۆ هەموو ئادەمی بێت. قورئان موعجیزە گەورەکەی پێغەمبەر

---

[٢٨] القرآن والتفسير للكون والحياة، ط١، ص٤٤.

ﷺ بوو، له سەردەمی خۆیدا تەحەددای ئەهلی ڕەوانبێژیی پێ دەکرد، داوای له هەموو نەوەکان کردووە بیر له نهێنییەکانی و داڕشتەکەی بکەنەوە، پێی دەوتن: (أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافاً كَثِيراً) (النساء ٨٢).

هەروەها گلەیی ئەوەی لێ دەکردن کە ناڕواننە ئایەتەکانی قورئان (أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) (محمد: ٢٤).

خوای گەورە وەسفی قورئان بە سیفەتی زیندوویی دەکات، وەك لە ئایەتی ٥٢ی سورەتی (الشورى) (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِنْ أَمْرِنَا). هەروەها سیفەتی ڕووناکی (النور) دەداتە کتێبەکەی، وەك لە سورەتی (التغابن)، ئایەتی ٨دا دەفەرموێت: (فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ).

بۆیە دەبینین قورئان بەردەوام بەخشینی خۆی هەیە بۆ هەموو نەوەیەك جیاواز لەو نەوەیەی پێش خۆی، هەر کۆمەڵێك لە هەر ئاستێکی زانستی و ڕۆشنبیریدا بێت، تێگەیشتنی تایبەتی خۆی هەیە بۆی. نەخوێندەوارێك چێژ لە قورئان دەبینێت بە ڕێگە و تێگەیشتنی خۆی، زانایەکی بەتواناش لە مەقسود و ئامانجەکانی قورئان تێدەگات بەپێی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیریی خۆی. زانایەکی شارەزاش لە ئایەتەکانی قورئاندا جیهانێکی تایبەتی دەبینێت و لە دەریای نهێنییەکانی قورئان چەندین داهێنان بۆ سەردەمی خۆی هەڵدەگۆزێت، خوای گەورە ڕاستی فەرمووە: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٣).

ئەمەش مانای ئەو دەستەواژەیەیە کە دەوترێت (قورئان "المعجزة المتجددة") بۆ هەموو زەمانێك و شوێنێك.

لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئیعجازی (بەیان)ی و لایەنی بەلاغەتی قورئان کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی گوێگرانی بە موسڵمان و

بێباوەڕانەوە، لەو بەڵگانەش وتەی وەلیدی کوڕی موغیرەیە کاتێك گوێی لە قورئان دەبێت: (والله لقد سمعت كلاماً ماهو من كلام الإنس، ولا من كلام الجن، وأن له لحلاوة وأن عليه لطلاوة..).

لەبارەی ئیعجازی بەیانییەوە زۆر پەڕاو نووسراون: (نظم القرآن)ی جاحیز و (دلائل الإعجاز)ی عەبولقەههار و (التصوير الفني في القرآن)ی سەید قوتب و (الظاهرة القرآنية)ی مالیك بن نەبی و (إعجاز القرآن)ی ڕافیعی و (القرآن المعجزة الكبرى)ی ئەبو زوهرە.

بزاڤ تەفسیری زانستیی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی پێشەوا ڕازییەوە دەستی پێکردووە، تا دەگاتە تەنتاوی جەوهەری و بینتولشاتی و موستەفا مەحموود و ئەوانی تر، هەوڵی نزیککردنەوەی (تێگەیشتنی زانستی) و ڕەخنەگرانی تەفسیری زانستیان داوە، بۆ گەیشتن بە ڕاستییە زانستییەکان و بەکارهێنانی لە تەفسیری قورئانی پیرۆزدا و دەرخستنی لایەنە ئیعجازییەکانی و جۆرەکانی. بۆ نموونە:

ئیعجازی ژمارەیی.

ئیعجازی پزیشکی.

ئیعجازی گەردوونی و ئاسمان و ئەستێرەکان.

ئیعجازی دروستبوونی زەوی و ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان پێوەیەتی.

ئیعجازی ڕووەکی.

ئیعجازی گیانەوەران.

ئیعجاز لە زەریاکان و ئۆقیانووسەکان و باران بارین.

ئیعجازی تەشریعی و یاسایی.

ئیعجازی ئابووری، سوو خواردن، تەواوکاریی کۆمەڵایەتی.

ئیعجازی دەنگ.

ئیعجازی دەروونی.

ئیعجاز لە سوننەتی پێغەمبەردا.

ئیعجازی مێژوویی و شوێنەوار.

لێرەدا نموونەیەکی جوانی ئیعجازی زانستی دێنمەوە لە نووسینی مامۆستا سەید قوتب، لەبارەی دروستبوونی شیرەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَناً خَالِصاً سَآئِغاً لِلشَّارِبِينَ) (النحل: ٦٦)، واتە: (بەڕاستی لە حەیواناتدا پەند و بەرچاوڕوونی هەیە بۆ ئێوە، ئەوەتا ئێمە لە نێوان ئەو شتانەی لە سکیاندایە لە گژوگیا و خۆراکی هەرسکراو و خوێن، شیرێکی پاك و بێگەرد و خۆشتان بۆ بەرهەم دێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە)، سەید دەڵێت: تا ماوەیەکی نزیك ئەمە بە نهێنی مابووەوە، ئەم ڕاستییە زانستییەی قورئان لێرەدا باسی لێوە دەکات، کەس نەیزانیوە کە شیر لە نێوان سروان و خوێندا دەردەچێت، هیچ مرۆڤێك لەو سەردەمەدا ئەو کارە بە خەیاڵیدا نەدەهات، چ جای ئەوەی بەم شێوە زانستییە وردە باسی لێوە بکات، هەر مرۆڤێك خاوەنی عەقڵی خۆی بێت ناتوانێت موجادەلەی لەسەر بکات، بوونی تاکە ڕاستییەکی لەم شێوەیە بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەم قورئانە وەحییە لە لایەن خواوە، مرۆڤایەتی هیچیان لەو ڕۆژانەدا ئەم ڕاستییەیان نەدەزانی[٢٩].

[٢٩] في ظلال القرآن، ج٤، ط٣٣، ص٢١٨٠-٢١٨١.

# دوا وته:

بەڕاستی لێکۆڵینەوە لەسەر دیاردەی قورئانی، بوارێکی زۆر بەرفراوانترە لەو هەوڵەی کە داومانە. بەو ئومێدەی توێژەرانی بواری لایەنە دەروونییەکانی وەحی بتوانن پەیوەندیی ئۆرگانی و مەعریفی دروست بکەن لە نێوان کەسایەتیی موحەممەد و بیرۆکە هەڵقوڵاوەکانی پێغەمبەرایەتی و شێوازی ناوازەی قورئانی لە ئەلفەوە تا یاء، وەك دەوترێت (الأسلوب هو الإنسان).. موسڵمانان لە پانزە سەدەی پێشوودا نەیانتوانیوە کتێبێکی گونجاو بنووسن بۆ کۆکردنەوەی فەرموودەکان، تەنانەت فەرموودە کۆکراوەکانیش لە کتێبەکانی فەرموودەدا، ناتوانرێت ـ هیچ کەسیش ناتوانێت ـ بەیەکیانەوە ببەستێت لەسەر شێوەی قورئانی پیرۆز.

هەروەها دەرکی فراوانیی باسەکە دەکەین و نەمانتوانیوە نموونەی تەواو لەسەر بەشەکانی ئیعجازی زانستی بهێنینەوە.

هەروەك حەزمان دەکرد ئاماژە بەو داهێنانە مرۆییانە بکەین کە بەجێماون سەبارەت بە کاریگەریی قورئان لە ژیانی مرۆڤدا و گەشتەکانیان لە نەفامییەوە بەرەو ئیسلام، چۆن یەکەم کۆمەڵگای ئیسلامی، بەهۆی کاریگەریی قورئانەوە، توانییان کۆمەڵگایەکی نموونەیی دروست بکەن، کە هەتا هەتایە پیشەنگی موسڵمانانە لە ژیانیاندا.

ڕاستە وتراوە (لا يصلح آخر هذه الأُمة إلا بما صلح به أولها).

خوای گەورە تەوفیقی هەموو لایەك بدات..

## سەرچاوەکان:


١ـ الظاهرة القرآنية، مالك بن نبـي، دار الفكر، دمشق، ط٢.

٢ـ الظاهرة القرآنية والعقل، علاء الدين المدرس، مطبعة العاني، بغداد.

٣ـ القرآن المعجزة الكبرى، الأمام محمد أبو زهرة، دار الفكر العربي، القاهرة، ط١.

٤ـ معجزة القرآن، الإمام محمد متولي الشعراوي، دار بسام، الموصل.

٥ـ القرآن تفسير للكون والحياة، محمد العفيفي، ط١.

٦ـ المعجزة المتجددة، أبو عبدالرحمان اليافعي، دار الأندلس، جدة.

٧ـ إعجاز القرآن، مصطفى صادق الرافعي.

٨ـ القرآن العظيم، محمد الصادق إبراهيم العرجون، دار القلم، دمشق.

٩ـ حول إعجاز القرآن، علي العماري، سلسلة الثقافة الإسلامية، ٤٤القاهرة.

١٠ـ الوحي الإلهي، الحسين عبدالمجيد هاشم، المكتبة الثقافية ٢٣٦ القاهرة.

١١ـ النبأ العظيم، د، محمد عبدالله الدراز، دار القلم، الكويت، ٢٠٠٤.

١٢ـ موسوعات الإعجاز العلمي في القرآن والسنة.



# ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا و ڕەواندنەوەی چەند گومانێك

د. كاوە فەرەج سەعدون

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی کە قورئانی پیرۆزی کرد بە موعجیزەی زیندوو و نوێبووەوەی کۆتایین نێردراوی خۆی، موعجیزەیەکی عەقڵی و زانستییە کە لە هەموو لایەنێکیەوە تەواوە و بێخەوشە: هەر لە زمانەوانی و بەیان و رەوانبێژییەکەی، بۆ ئەو هەواڵدانانەی بۆ رابردوو داوێتی و ئەوانەشی لە داهاتوودا روودەدەن، موعجیزەیەکە ئەوەندە بابەتی زانستی و یاسای سیاسی و بنەمای ئابووری و وردەکاریی کۆمەڵایەتی و مافەکانی مرۆڤ و رژێمە مرۆییەکانی تێدایە، کە هیچ دروستکراوێك ناتوانێت هاوشێوەی بهێنێت بە تێپەڕبوونی رۆژگار و هەر بەو شێوەیەش دەمێنێتەوە.

هەر لە کۆنەوە دوژمنانی ئیسلام ویستوویانە گومان بۆ قورئان دروست بکەن بە مەبەستی دوورخستنەوەی خەڵك لە پەیامە پیرۆزەکەی، لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) چەندین نازناویان لێدەنا بۆ ئەوەی خەڵك گوێی لێنەگرن، دەیانوت جادووگەر و ساحیر و شاعیرە، ئەگەر ئەمانە سوودی نەبوایە، دەیانوت دەنگەدەنگ بکەن و قسەی بێمانا بکەن بۆئەوەی گوێتان لێنەبێت، چونکە دەیانزانی گەر گوێی لێبگرن و تێیڕامێنن، بێگومان باوەڕیان پێدەهێنا (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ) (فصلت: ٢٦)، واتە: بێباوەڕان بە یەکتریان دەوت گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە و بیکەنە هەرا و هۆسە و غەڵبە غەڵب و قسەی بێسوود، بەڵکو سەرکەون بەسەریدا.

قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەت و رێنموویی مرۆڤەکانە بۆ رێگەی راست، پەروەردگاریش بە زانستی فراوانی خۆی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە تا رۆژی دوایی، دەزانێت کە زانستی مرۆڤەکان بەرەو پێشکەوتنی بەردەوام دەڕوات، بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا ئیشارەت و ئاماژەی بۆ هەموو زانستەکان و سەردەمەکان

تێدایە، بە مەبەستی نوێبوونەوەی موعجیزەی قورئان لە هەموو سەردەمێکدا: (ونزّلنا عليك الكتاب تبياناً لكل شيء....) (سورة النحل: ١٨٩)، (لَّـكِنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيداً) (النساء: ١٦٦)، ئیمامی راڤەکاری قورئان (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "ئەم قورئانە زانیاری و زانستی خودایی تێدایە کە ویستوویەتی نیشانی بەندەکانی بدات، هەروەها زانیارییشی تێدایە بە شتە غەیبی و نەزانراوەکان، لە رابوردوو و داهاتووشدا"*.

دەربارەی ئەو مانایەش کە قورئان زانیاری شاردراوەی خودایی تێدایە، زۆرێك لە موفەسیران هەمان بۆچوونیان هەیە، وەك: (ابن الجوزي، الزمخشري، أبوحيّان، البيضاوي، النَّسَفي، الخازن، الآلوسي، الشوكاني).

پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی ئاماژەی داوە بە بەردەوامیی موعجیزەی قورئان، کە لێی دەگێڕنەوە فەرموویەتی: (... ولا تنقضي عجائبه...)** واتە: هەرگیز سەمەرە و سەرسوڕهێنەکانی قورئان تەواو نابن.

ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بریتییە لە موعجیزە نوێیەکەی قورئان کە زانایان و مرۆڤەکان سەرسام دەکات، بەڵام لە یادمان نەچێت قورئانی پیرۆز کتێبی هیدایەتە، تەنها سەرچاوەی زانستی نییە، لە رۆژگاری ئەمڕۆدا دەرخستنی موعجیزەی زانستیی قورئان هۆکارێکی گەورەی بانگەوازە بۆلای پەروەردگار و دەرخستنی راستیی قورئانی پیرۆز، کاتێك زانایان و پسپۆڕان و خەڵکی بەگشتی ئەو ئاماژە ورد و سەرسوڕهێنەرانە دەبینن لە

---

* بڕوانە: تفسير القرآن العظيم (١/٥٦٠).

** جزء من حديث طويل رواه الترمذي والدارمي والطبراني في المعجم الكبير وابن حبان والحاكم في المستدرك، قال ابوعيسى: هذا حديث لانعرفه إلا من هذا الوجه (سنن الترمذي: ٥/ ٩٨)، والصحيح انه موقوف على ابن مسعود.

شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە وتەی پەروەردگارێکە کە تەنها ئەو زانایە بە نهێنی و غەیبییاتەکان.

## هەندێك لەو تەفسیرانەی کە تێیاندا تەفسیری زانستیی بۆ زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئان کراوە:

– تەفسیری (مفاتیح الغیب) دانراوی (فخرالدین الرازي) (٥٤٤–٦٠٦ك)، هەشت بەرگی گەورەیە، زۆر نموونە لە زانستە بیرکاری و سروشتییەکانی هێناوە لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا.

– (أنوار التنزیل وأسرار التأویل) دانراوی (القاضي البیضاوي) ساڵی (٦٩١ك) وەفاتی کردووە، کاتێك باسی ئایەتە کەونییەکان دەکات بەبێ لێکدانەوەیان بە زانستەکانی گەردوون و سروشت، بەسەریاندا تێناپەڕێت.

– (غرائب القرآن ورغائب الفرقان) دانراوی (نظام الدین النیسابوري) لە زانایانی سەدەی هەشتەمی کۆچییە.

– (تفسیر الجلالین) دانراوی (جلال الدین السیوطي وجلال الدین المحلي).

– (السراج المنیر في الإعانة علی معرفة بعض معاني کلام ربنا الحکیم الخبیر) دانراوی (الخطیب الشربیني)، (٩٧٧ك) وەفاتی کردووە.

– (روح المعاني في تفسیر القرآن العظیم والسبع المثاني) دانراوی (شهاب الدین الآلوسي) (١٢١٧–١٢٧٠ك).

– (الجواهر في تفسیر القرآن الکریم) دانراوی شێخی ئەزهەر (طنطاوي جوهري) (١٢٨٧–١٣٥٨ك).

## گرنگی تەفسیری زانستیی بۆ ئایەتە گەردوونییەکان:

١- تەفسیری زانستیی دەریدەخات قورئان سەمەرەکانی کۆتایی نایەت و کۆن نابێت و زانایان لێی تێرنابن.

٢- دەرخستنی ئیعجازی زانستیی قورئان و سەلماندنی ئەوەی دروستکەری بوونەوەر هەر ئەوەیە قورئانی دابەزاندووە.

٣- تەفسیرکردنی ئایەتە کەونییەکان لە قورئانی پیرۆزدا بەشێوەیەکی زانستیی راست و دروست و دوور لە تەفسیرە نازانستییەکانی بابەتەکانی وەك: (النطفة والعلقة) و دەرهێنانی زیندوو لە مردووەوە و پۆلێنکردنی زیندەوەرەکان و غەیری ئەمانەش لە هەزاران ئایەتی گەردوونی و ئاماژەی زانستیی و ئیعجازی زانستیی لە قورئانی پیرۆزدا.

٤- بانگەوازکردن بۆ لای خودا بە شێوازی سەردەمییانە، کە مەبەستی دەرخستنی ئیعجازی زانستییە لە قورئاندا.

## چەند رێکخەر و سنوورێك
## بۆ تەفسیری زانستیی قورئان[٥٨]

١- پێویستە ڕاڤەکار پابەندبێت بە ئیسلامەوە، بە بیروباوەڕ و شەریعەتەکەیەوە، شارەزا بێت بە عەقیدەی شوێنکەوتووانی سوننەت و جەماعەت لە یەکتاپەرستی و پەروەردگارێتی و ناو و سیفاتی خودا.

٢- پێویستە راڤەکاری زانستیی پابەند بێت بە نوێژ و رۆژووەوە، هیچ بنەمایەکی ناسراوی ئیسلام رەتنەکاتەوە.

---

٥٨ بڕوانە بابەتی: التفسير العلمي للآيات القرآنية الكونية بين المؤيدين والمعارضين، د. كارم السيد غنيم.

٣- پێویسته شارەزایی تەواوی هەبێت لە تەفسیری زمانەوانیی ئەو ئایەتانەی خەریکی راڤەکردنیانە.

٤- پێویسته تەفسیرکردن بە راستییه زانستییه دامەزراوەکان بێت لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە بیردۆز و گریمانەکان.

٥- نابێت تەفسیرەکەی پێچەوانەی تەفسیری ئایەتێکی دیکە بێت، لەبەرئەوەی قورئان جیاوازی و دژبەیەکیی تێدا نییه، قورئان هەندێکی تەفسیری ئەوەکەی دیکەی دەکات.

٦- هەرکەسە و لە بواری پسپۆڕیی وردی خۆیدا تەفسیر و راڤە بکات.

٧- ئیعجازی زانستییش پێویستی بە رێکخەر و سنووری زانستی و شەرعی ورد هەیە، کە پێویسته رەچاو بکرێن.

# بەشی چوارەم:
# وەڵامدانەوەی هەندێك گومانی بێباوەڕان
# دەربارەی ئیعجازی زانستیی

ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەوەیە کەسانێك هەن دەیانەوێت بە خەیاڵی خۆیان ڕەددی ئیعجازی زانستی بدەنەوە و ئینکاریی ئەوە دەکەن کە قورئان ئاماژەی زانستیی تێدا بێت، بەڵام کاتێك ئەمەیان بۆ نەچووە سەر و نەیانتوانی ئینکاری و ڕەددی ئەو هەزاران ئاماژە زانستییە بدەنەوە کە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، هەستان بە هەڵبەستنی درۆیەکی دیکە کە گوایا پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە بە وەرگرتنی ئەم زانیارییە لە خەڵکان و میللەتانی دیکە، منیش بە یارمەتی پەروەردگار دەمەوێت ڕەددی هەندێك لەم گومانانە بدەمەوە و بە شێوەیەکی زانستی و مێژویی بیسەلمێنم کە ئاماژە زانستییەکانی قورئان لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەوە وەرنەگیراون و موعجیزەیەکی ئاشکرا و بینراوی قورئان و سوننەتن، لەبەر کەمیی بوار تەنها یەك نموونە باس دەکەم کە تایبەتە بە بواری پزیشکی کە بواری پسپۆڕیی خۆمە، بۆ ئەوەی بواری ڕەخنە بۆ ئەو کەسانە نەهێڵمەوە کە ئەگەر من لەسەر لایەنەکانی تر قسە بکەم لەوانەیە بڵێن ئەوە بواری پسپۆڕیی تۆ نییە.

## ڕەواندنەوەی ئەو گومانەی:

## ئیسلام کۆرپەلەزانیی لە میللەتانی دیکەوە وەرگرتووە [٥٩]:

بێباوەڕان بیانووی ئەوە دێننەوە کە ئەوەی موحەممەد (ﷺ) هێناویەتی لە ڕاستی و زانیاریی دەربارەی کۆرپەلەزانی، لە میللەتانی دیکەوە وەریگرتووە، وەك: یۆنانی و پزیشکە عەرەبەکان و خاوەنانی کتێبە ئاسمانییەکان.

ئەوە دەکەن بە بەڵگە کە (أبوقراط وأرسطو وجالینوس) باسی ئەو قۆناغانەیان کردووە کە کۆرپەلە پێیدا تێدەپەڕێت، کە گوایە هەمان ئەو قۆناغانەیە کە قورئان باسی کردووە، هەروەها (الحارث بن كلدة والنضر بن الحارث) شارەزاییەکی زۆریان هەبووە لە زانستی پزیشکی و کۆرپەلەزانییدا، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئینجیل باسی قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلەی کردووە، ئەوەتا تێیدا هاتووە: (يداك كوَّنتاني وصنعتاني كلي جميعاً، أفتبتلعني، أذكر أنك جبلتني كالطين أفتعيدني الى التراب، ألم تصُبَّني كاللبن وخثَّرتَني كالجبن، كسوتني جلداً ولحماً فنسجتني بعظام وعصب) (أيوب: ١٠:٨).

لێرەدا دەپرسن: ئێوە باسی چ ئیعجازێکی زانستیی دەکەن لە قورئاندا، کە ئەمە تەنها چەند ئاماژەیەکە لە میللەتانی ترەوە وەریگرتووە؟! بۆ وەڵام دەڵێین:

١- بۆچوونی میللەتانی دیکەی پێش ئیسلام دەربارەی کۆرپەلە و دروستبوونی، لە کۆمەڵێك ئەفسانە و خورافات دەرناچێت، تەنها بە خەیاڵ دایاننناوە و لەسەر بنەمای زانستیی نەبووە، بەهۆی نەبوونی هۆکارە زانستییەکان لەبەردەستیاندا، ڕوونترین بەڵگەش لەسەر هەڵەکانیان لەم بوارەدا

---

٥٩ بڕوانە: موسوعة حقائق الإعجاز العلمي في مواجهة الشبهات – المجلد الثالث – بابەتی: دعوى اقتباس علم الأجنة من الأمم السابقة- سایتی: الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (www.eajaz.com).

ئەوەیە کە (أبوقراط وأرسطو وجالينوس) دەیانوت کۆرپەلە، یان لە خوێنی مانگانەوە دروست دەبێت، یان لە تۆوی پیاوەوە بە تەنها دروست دەبێت، هەروەها دەیانوت گۆشت پێش ئێسقان دروست دەبێت، ئەوەبوو کە قورئان هات باسی نوتفەی تێکەڵاوی کرد (النطفة الأمشاج)[٦٠] لە ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەت، کە کۆرپەلە لە هەردووکیانەوە دروست دەبێت، ئێسك سەرەتا دروست دەبێت پاشان بە ماسولکە دادەپۆشرێت، کە ئەم راستییانە یەکانگیرە لەگەڵ نوێترین دۆزینەوەکانی کۆرپەلەزانییدا[٦١]، باشە ئەگەر قورئان زانیاری لە میللەتانی دیکەوە وەرگرتووە، ئەی بۆچی ئاوا جیاواز باسی کۆرپەلە دەکات؟.

٢- زانستی پزیشکیی لەناو نەتەوەی عەرەبدا لاوازترین زانست بوو لەلایان، لەگەڵ دەرکەوتنی کەسانی وەك (الحارث بن كلدة والنضر بن الحارث)، چونکە لەسەر بنەمای سیحر و جادوو دامەزرابوو، تەنها پشتی دەبەست بە هۆکارە سەرەتاییەکانی وەك: داخکردن و بڕینەوە و خوێنگرتن. سەبارەت بە

---

٦٠ (إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً) (الإنسان: ٢).

٦١ بۆ مەسەلەی دروستبوونی ئێسك و ماسولکە لە رووی کۆرپەلەزانییەوە، بڕوانە کتێبی (Langman's Medical Embryology) کە پرۆگرامی کۆلیجی پزیشکییە لە زانکۆکانی عێراق و کوردستان، بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی گشتی باسی کۆرپەلە دەکات، بەڵام بەشی دووەمی تەرخان کردووە بۆ گەشەکردنی سیستمەکانی لەشی کۆرپەلەکە، یەکەم سیستمێك باسی دەکات کە گەشە دەکات لە لەشی کۆرپەلەکەدا بریتییە لە (Skeletal System) واتە کۆئەندامی پەیکەر، یان ئێسکی لەش (بڕوانە لاپەڕە ١٢٥- ١٤٢)!

پاشان دووەم سیستم کە گەشە دەکات دەڵێت بریتییە لە (Muscular System) واتە کۆئەندامی ماسولکە (یان گۆشت) (بڕوانە لاپەڕە ١٤٣- ١٤٩)! پاشان گەشەی سیستمەکانی دیکە باس دەکات لە (کۆئەندامی سوڕانی خوێن و کۆئەندامی هەناسە و کۆئەندامی هەرس و میزەڕۆ و ...... تاد) ئەویش لەبەرئەوەی ریزبەندیی سروشتی خۆی بەم شێوەیەیە، ئەم دوو سیستمە (ئێسك و گۆشت) یەکەمین کۆئەندامن کە لە لەشی کۆرپەلەکەدا گەشە دەکەن بەدوای یەکدا.

کۆرپەلەزانییش عەرەبەکان تەنها ئەوەندەیان لێدەزانی کە لە جوولەکەکانەوە وەریانگرتبوو لەگەڵ هەموو هەڵەکانیدا، باشە ئەگەر ئەمە حاڵی ئەو میللەتە بوو بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) لەناویاندا پەیدابوو، ئەی ئیتر چۆن زانیارییەکانی لەوانەوە وەرگرتووە کە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە زانایان بەهۆی وردترین ئامێرەوە بەدەستیانهێناوە؟!.

٣- کتێبی پیرۆزی گاور و جوولەکە وەك لە دەقەکەی پێشتردا بە روونی دیارە باسی ئەوە دەکات کە کۆرپەلە لە خوێنی مانگانەوە دروست دەبێت، تۆوی پیاو تەنها کاری هەڵهێنانێتی وەك چۆن هەوێن شیر هەڵدەهێنێت و دەیکاتە پەنیر، هەروەها دەشڵێت کۆرپەلە یەکەمجار پێست و گۆشتی دروست دەبێت، پاشان ئێسك دروست دەبێت، کە دەبینین قورئان لە چەندین شوێندا پێچەوانەی ئەمە دەڵێت.[٦٢]

## بۆچوونی هەندێك لە میللەتان لەسەر کۆرپەلەزانی:

### میسرییە کۆنەکان:

هەندێك تۆماری تایبەتی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سولالەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی فیرعەونی لە میسری کۆندا، باسی ئەوە دەکات کە بە لایەنی کەمەوە ١٠ کەس نازناوی (هەڵدڕی وێڵاشی شایانە - فاتح مشیمة الملك)یان هەڵگرتووە، مەراسیمی کەژاوەی شایانە وای دەخواست کەسێك

---

٦٢ وەك: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى) (الحجرات:١٣)، (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ * ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ * ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ) (المؤمنون ١٢ـ ١٤).

ئالآیەك هەڵگرێت لەبەردەم کەژاوەکەوە کە تەعبیر لە وێڵاشی پاشا بکات، ئەویش لەبەرئەوەی باوەڕیان وابوو کە وێڵاش (المشیمة) سیفاتی سیحری هەیە، کە ئەم بۆچوونە تا سەردەمی یۆنانییەکان و دوای ئەوانیش هەر باو بوو و زانست بەسترایەوە بە سیحر و جادووەوە، کۆنترین نووسراویش سەبارەت بە چۆنێتی خۆپاراستن لە سکپڕی (الوقایة من الحمل) بە زمانی هیری (کە زمانی کۆنی میسرییەکان بوو پێش زمانی هیرۆگلیفی) نووسراوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠٠– ١٨٠٠ ساڵ پێش زایین کە لە پێکهاتەکانیدا پاشەڕۆی تیمساحی تێدابووە ! !

هەروەها میسرییە کۆنەکان نەشارەزا بوون بە ڕۆڵی تۆوی پیاو لە کرداری دروستبوونی کۆرپەلەدا، باوەڕیان وابوو مەنی پیاو لە ناوچەی بڕبڕەی پشتەوە پەیدا دەبێت، کە ئەمە بیروبۆچوونی کاهن و قەشە ئاینییەکانیان بوو، بەڵام میسرییە کۆنەکان بە نزیکەیی ماوەی سکپڕییان دەزانی (دایان نابوو ماوەی ٢٧٥–٢٩٤ ڕۆژ دەخایەنێت).[٦٣]

## هیندییە کۆنەکان:

لە زانستی پزیشکی لای هیندییە کۆنەکاندا نامەیەك بە زمانی سانسکریتی (Sanskrit) دۆزراوەتەوە کە باسی بۆچوونە کۆنەکان دەکات دەربارەی گەشەکردنی کۆرپەلە، کە دەڵێت: (لە یەکگرتنی خوێن و مەنییەوە کۆرپەلە پەیدا دەبێت، دوای تێپەڕبوونی حەوت شەو دەبێت بە تۆوێك، دوای دوو هەفتە کۆرپەلەکە دەبێت بە تۆپەڵێك و بارستەیەکی خڕ، دوای مانگێك دەبێت بە بارستەیەکی پتەو، دوای دوو مانگ سەری کۆرپەلەکە دروست دەبێت، دوای سێ

---

٦٣ بڕوانە: علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة، الشيخ عبدالمجيد الزنداني، من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة -(باكستان)، ص ١٤.

مانگ جومگەکانی لەشی پەیدا دەبن)، کە ئاشکرایە ئەم بۆچوونانە چەند لە راستییەوە دوورن، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە لە کۆندا خەیاڵ و بۆچوونی بێبناغە چەند ڕۆڵی هەبووە لە تێگەیشتنی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەدا؟!

**یۆنانی و رۆمانییەکان:**

یۆنانییە کۆنەکان یەکەم کەس بوون زانستیان بە مەنتیقەوە گرێدا، نەك بەهێزە سیحرییەکانەوە، ئەوەبوو بە شێوەیەکی مەنتیقی تێبینییەکانیان لێکدەدایەوە، بەڵام زۆر کات مەنتیق و خەیاڵات لەگەڵ راستییە زانستییەکاندا یەك ناگرێتەوە، یەکەم کەس کە لەم بوارەدا دوا زانای یۆنانی هیپوکراتس (أبوقراط Hippocrates) بوو کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا ژیاوە، کە دەڵێت: (٢٠ هێلکە، یان زیاتر بێنە و بیانخەرە ژێر دوو مریشك، یان زیاترەوە، هەر رۆژەی هێلکەیەك بشکێنە و سەیری بکە، بە تەواوەتی ئەوە دەبینیت کە بۆمان روونکردیتەوە کە لەوانەیە سروشتی مرۆڤ چوونیەکی سروشتی باڵندە بێت).

لەم سەردەمەی مێژووی زانستی کۆرپەلەزانییدا نووسینەکانی (أرسطو طالیس) و (جالینوس) زاڵبوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەنیا بۆچوون نەبوون لەم بوارەدا، (أرسطو Aristotle) (٣٨٤– ٣٢٢ی پێش زایین) بە بۆچوونەکانی دەربارەی کۆرپەلەزانی بەناوبانگ بوو، کە وەسفی گەشەکردنی جووجك و کۆرپەلەی دیکەی کردووە، لێرەوە بە دامەزرێنەری کۆرپەلەزانی دادەنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە بیروبۆچوونەکانی لە دەوری: (گەشەکردنی کۆرپەلە لە خوێنی مانگانەوە پاش ئەوەی کە لەلایەن تۆوی پیاوەوە چالاك دەکرێت) دەخولایەوە، (جالینوس Claudius Galen)یش لە سەدەی دووەمی پێش

زاییندا کتێبێکی لەسەر گەشە و خۆراکی کۆرپەلە دانا، دەربارەی وێلاشی دەوری کۆرپەلەش دواوە، کە بۆچوونەکانی تەنیا باسی قۆناغە کۆتاییەکانی گەشەی کۆرپەلە دەکات[٦٤].

لە ساڵی ٢٠٠ی پێش زایینەوە جۆرە ئاماژەیەکی ئەوتۆ بۆ زانستی کۆرپەلەزانی لە کتێبە زانستییەکانی رۆژئاوادا نەهاتووە، تەنانەت ئەگەر نووسەر و وەرگێڕە موسڵمانەکان نەبوونایە ئەوا زۆرێك لە نووسراوە یۆنانییەکانیش دەفەوتان.

تەنیا ئەو فەرموودانەی قورئان و سووننەت نەبێت کە زۆر بە وردی باسی گەشەکردنی کۆرپەلەیان کردووە، هیچ کەسێکی دیکە نەچووەتە وردەکارییەکانی کۆرپەلەزانییەوە، زانای رۆمانی (کۆنستەنتین Constantinus Africanus) (١٠٢٠–١٠٨٧ی زایینی) نامەیەکی کورتی بە ناوی سروشتی مرۆڤ ( De Humana Natura) نووسیوە کە تێیدا باسی هەندێك قۆناغی گەشەکردنی کۆرپەلەی کردووە و بەستوویەتیەوە بە هەسارەکانەوە، ئەمە بۆمان روون دەکاتەوە کە ئەو بیردۆزانەی تەنیا بەهۆی گومان و خەیاڵەوە دادەنرێن چۆن مرۆڤ بەرەو خورافات دەبەن، لە سەدەی پانزەیەمدا (لیوناردو داڤینشی Leonardo Da Vinci) چەند وێنەیەکی ناو منالدانی بڵاوکردووەتەوە کە کۆرپەلە و پەردەکانی دەوری دەردەخات، کۆرپەلەکە بە تەواوەتی دەرکەوتووە، ئەمەش بڵاویی بیردۆزی دروستبوونی تەواو لەو سەردەمانەدا دەسەلمێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بۆچوونە لەلای پزیشکان تا دوای دۆزینەوەی وردبین (میکرۆسکۆب)یش لەسەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا باوبوو، بەڵام موسڵمانان بە گشتی و زانایانی ئیسلام بە تایبەتی ئەم بۆچوونەیان

---

٦٤ بڕوانە: رد الشبهات حول علم الأجنة في القرآن والسنة- د. مصطفى عبدالمنعم- مقال منشور بموقع: موسوسة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة: (http://www.quran-m.com).

ڕەتکردووەتەوە، ئەمانەش هەندێك نموونەیە لە وتەی زانایانی موسڵمان لەم بوارەدا:

– (ئیبن قەییمی جەوزی) کە لە ساڵی (٧٥١ ك) کۆچی دوایی کردووە، دەڵێت: (ومني الرجل وحده لا يتولد منه الولد ما لم يمازجه مادة أخرى من الأنثى)[٦٥]. واتە: مەنی پیاو بە تەنیا منداڵی لێوە دروست نابێت ئەگەر بێتو ماددەیەکی دیکەی تێکەڵاو نەبێت لە ئافرەتەوە، هەروەها دەڵێت: (الجنين يخلق من ماء الرجل وماء المرأة خلافاً لمن يزعم من الطبائعيين أنه إنما يخلق من ماء الرجل وحده)[٦٦]، واتە: کۆرپەلە لە ئاوی پیاو و ئافرەت هەردووکیانەوە دروست دەبێت بە پێچەوانەی وتەی سروشتزانەکان کە دەڵێن تەنها لە مەنیی پیاوەوە دروست دەبێت.

– هەروەها زانا (ئیبن حەجەری عەسقەلانی) کە لە (١٤٤٩ی زایینیدا) کۆچی دوایی کردووە، لە پێشەکی راڤەی بۆ پەڕاوی (القدر) لە کتێبی (فتح الباري شرح صحيح البخاري)دا دەڵێت: (وزعم كثير من أهل التشريح أن مني الرجل لا أثر له في الولد إلا في عقده، وأنه إنما يتكون من دم الحيض، وأحاديث الباب تبطل ذلك)[٦٧]، دەڵێت: زۆرێك لە زانایانی توێکاری لەم سەردەمەماندا تێڕوانینییان وایە و دەڵێن تۆوی پیاو رۆڵی نییە لە دروستبوونی منداڵدا و تەنها وەك هەوێنێکە بۆ هەڵهاتنی، کۆرپەلە لە سکی دایکدا تەنها لە خوێنی مانگانەی ئافرەتەوە دروست دەبێت، کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم قسەیە رەتدەکەنەوە و ئەم قسەیە راست نییە!

---

٦٥ بڕوانە کتێبی: التبيان في علوم القرآن، لاپەڕە ٢٤٤.

٦٦ بڕوانە: تحفة المودود بأحكام المولود، ص ٣٩٣.

٦٧ بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري (ج١١ ص٤٨٠).

– ئیمامی قورتوبی له تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (بَيَّنَ الله تعالى في هذه الآية (يقصد قوله تعالى: " يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ " (الحجرات ١٣)) أنه خلق الخلق من الذكر والأنثى.. وقد ذهب قوم من الأوائل، إلى أن الجنين إنما يكون من ماء الرجل وحده، ويتربى في رحم الأم ويستمد من الدم الذي يكون فيه.. والصحيح: أن الخلق إنما يكون من ماء الرجل والمرأة؛ لهذه الآية، فإنها نصٌّ لا يحتمل التأويل "[٦٨]، واتە: خوای گەورە لەو ئایەتەدا روونی کردووەتەوە کە مرۆڤەکانی لە نێر و مێ دروستکردووە، کە چەند خەڵکێکی پێش ئێمە بۆ ئەوەچوون کە کۆرپەلە تەنها لە ئاوی پیاوەوە دروست دەبێت، بەڵام قسەی راست ئەوەیە لە هەردوو ئاوی پیاو و ئافرەتەوە دروست دەبێت، چونکە دەقی ئایەتەکە بواری تەئویل و دەستکاریی ماناکەی تێدا نییە.

زانایانی موسڵمان باوەڕی تەواویان هەبووە کە منداڵ لە هەردوو دایك و باوکەوە دروست دەبێت و زانست بە هەڵە باسی دروستبوونی کۆرپەلەی دەکرد، ئەویش بە پشتبەستن بە ئایەتە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، وەك فەرموودەی پەروەردگار: (أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ) (القيامة: ٣٧)، کە ئەمەش نموونەیەکی ئاشکرایە لە پێشڕەوی و پێشکەوتنی قورئان و سوننەت بۆ هەموو ئەو زانیارییانەی کە لەلای زانایانی غەیری موسڵمان بە درێژایی سەدەکان جێگیر بووبوو.

دەبینین قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر ئەم راستییە زانستییەی زۆر بە وردی باس کردووە و دووبارەی کردووەتەوە، کە وەکو باسمان کرد تەنها ٢٠٠ ساڵ دەبێت زانایان گەیشتوونەتە ئەم راستییانە، لەمرۆماندا وەکو موعجیزەیەك سەیری دەکەین، ئێستاش فەرموون ئێوە و هەندێك لەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ

[٦٨] بڕوانە: الجامع لأحكام القرآن ١٦/٣٤٢.

وَأُنثَى) (الحجرات: ١٣). واته: ئەی خەڵکینە بە دڵنیاییەوە بزانن کە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێ دروست کردووە (واتە نێر و مێ هەردووکیان بۆ دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤ پێویستن).

– (إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ) (الدهر: ٢). مانای (أمشاج) واتە تێکەڵ، کەواتە مانای ئایەتەکە ئەوەیە کە دەفەرموێت: ئێمە مرۆڤمان لە نوتفەیەکی تێکەڵاو دروست کردووە (تێکەڵاو لە تۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت)، کە ئەنجامی یەکگرتنیان لەناو منداڵداندا بریتییە لە دروستبوونی هێلکەی پیتێنراو .(Zygot)

– لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: (مَرَّ يَهُودي بِرَسول الله (ﷺ) وَهُوَ يُحَدِّثُ أَصْحابَهُ، فَقالت قُرَيش: يا يَهودي إِنَّ هَذا يَزْعُم أَنَّهُ نَبِيٌّ، فَقالَ: لَأَسْأَلَنَّه عَن شَيءٍ لا يَعْلَمُهُ إِلاّ نَبِيٌّ، قال: فَجاء حَتَّى جَلس، ثُمَّ قال: يا مُحَمَّد مِمَّ يُخْلَقُ الأِنسان؟ فَقال رَسول الله (ﷺ): يَا يَهودي مِن كُلٍّ يُخْلَق: مِن نُطْفَة الرَّجُل وَنُطْفَة المَرْأة)[٦٩]، واتە: ڕۆژێك جوولەکەیەك بەلای پێغەمبەردا ڕۆیشت کە لەو کاتەدا قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد، لەو کاتەدا قورەیشییە بێباوەڕەکان پێیانوت: ئەی جولەکە، ئەم پیاوەی دەیبینیت وا خۆی پیشان دەدات کە دەڵێت من پێغەمبەرم، جولەکەکەش وتی: ئێستا پرسیارێکی لێدەکەم ئەگەر پێغەمبەر نەبێت نایزانێت، ئەوە بوو هات و لەلای پێغەمبەردا دانیشت و پاشان پرسیاری کرد: ئەی موحەممەد، مرۆڤ لە چییەوە دروست دەبێت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی جولەکە بزانە کە بنچینەی مرۆڤ لە هەردوو نوتفەی پیاو و نوتفەی ئافرەت بە یەکەوە دروست دەبێت.

**والحمد لله أولاً وآخراً ..**

---

[٦٩] رواه أحمد بسند صحيح.

# وتەی کۆتایی و دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە

– هەر لە کۆنەوە دوژمنانی ئیسلام ویستوویانە گومان بۆ قورئان دروست بکەن، بە مەبەستی دوورخستنەوەی خەڵك لە پەیامە پیرۆزەکەی.

– ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بریتییە لە موعجیزە نوێیەکەی قورئان کە زانایان و مرۆڤەکان سەرسام دەکات.

– پەروەردگار بۆ ئەوەی بەڵگە لەسەر خەڵکی ئەمڕۆ دامەزرێنێت، دەبینین لە قورئانەکەیدا لە سەدان ئایەتدا ئاماژەی داوە بە بوونەوەر و پێکهاتە و دیاردەکانی، بە وردییەکی زانستییانەی بەرچاوەوە.

– نووسین لە بواری (تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن) و لایەنەکانی دیکەی ئیعجازی قورئان بە زمانی کوردی زۆر بوارێکی گرنگ و پێویستە و بە کەمی باسی لێوە کراوە.

– لەگەڵ پشتگیریکردنی ئیعجازی زانستی لەلایەن زۆربەی زانایانی موسڵمانانەوە، کەسانێکیش هەن رەخنەی لێدەگرن لەناو موسڵماناندا و زۆربەیان لەوانەن کە نایانەوێت زیادڕەویی تێدا بکرێت و سنووری خۆی هەبێت، نەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی لێکدانەوەکانی دیکە بۆ دەقە شەرعییەکان.

ئەوانەی پشتگیری لە ئیعجازی زانستی دەکەن دوو کۆمەڵەی سەرەکیین:

١– ئەوانەی لە باوەڕیانەوە بە ئیعجازی رەهای قورئانی پیرۆز باوەڕیان بە ئیعجازی زانستیی قورئان هەیە، ئەمانیش بەتایبەتی زۆرێك لە زانایانی پێشین بوون کە ئەو هۆکارە زانستییانەیان لەبەردەستدا نەبووە کە ئەم راستییەی پێبسەلمێنن.

٢– ئەوانەی پشتگیریی ئیعجازی زانستیی دەکەن لەباوەڕیانەوە بە موعجیزەی بەردەوامی قورئانی پیرۆز، کە ئەمان زانستە گەردوونییەکانیان

لەبەردەستدا بووە کە بەهۆیەوە لە ئاماژە زانستییەکانی قورئان تێگەیشتوون، کە یان خۆیان لە پسپۆڕانی زانستە گەردوونییەکانن، یان لەو زانا ئایینییانەن کە زانستە گەردوونییەکانیان لەبەردەستدایە.

ئەوانەی رەخنە لە ئیعجازی زانستیی دەگرن بریتین لە سێ دەستە لەرووی پاڵنەرەکانیانەوە بۆ رەخنەگرتن و رەتکردنەوەی:

١- ئەوانەن کە دەترسن راستگۆیی قورئان گومانی تێبکەوێت ئەگەر بێتو تەفسیرەکەی پابەند بکرێت بە زانستە گەردوونییەکانەوە کە بەرەوام زانیارییەکانی دەگۆڕێت، کە ئەمەش کاریگەریی دەبێت لەسەر جێگیربوونی تەفسیری زانستیی قورئان، هەروەها لەوەش دەترسن مانای وشەکان ملکەچ بکرێت بۆ ئەوەی زانستە گەردوونییەکان پێی گەیشتووە، کەواتە ئەمان ئیعجازی زانستی و تەفسیری زانستیی بەهۆی خەمخۆرییان بۆ قورئانی پیرۆز، رەتدەکەنەوە.

٢- ئەوانەن کە بەڵگە نابینن لەسەر ئیعجازی زانستیی، تەنها رازین بە ئیعجازی زمانەوانی و رەوانبێژیی قورئان.

٣- ئەوانەن کە ئیعجازی زانستیی رەتدەکەنەوە بەهۆی بێباوەڕییان و کافربوونیان بە قورئان، یان بەهۆی قین و ئیرەییان لە قورئان، کە زاڵبووە بەسەر هەموو کتێبە ئایینییەکانی دیکەدا بەهۆی ئیعجازی هەمەلایەنیەوە کە ئیعجازی زانستییش بەشێکێتی.

- ئیمامی (شاطبي) لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا سەرمەشقی بزوتنەوەی رەتکردنەوەکە بوو، کە رەخنەکانی لەسەر زیادەڕەوی و لە سنووردەرچوونە لە تەفسیری زانستییدا.

- زۆرێك لە زانایانی موسڵمانی پێشین و سەردەم، وەڵامی بۆچوونەکانی (شاطبي)یان داوەتەوە، بە بەڵگەی بەهێز گرنگی بابەتەکانی تەفسیری زانستیی و ئیعجازی زانستیی قورئان و سوننەتیان بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان سەلماندووە.

- رەخنەکانی رەخنەگرانی ئیعجازی زانستیی تێنەگەیشتنی تێدایە بۆ بابەتی ئیعجازی زانستیی و حاڵینەبوون هەیە لەو بنەمایانەی کە ئەم لایەنەی لەسەر دامەزراوە، لەگەڵ لێکدانەوەی بەڵگەکانیان لەم بوارەدا دەگەینە ئەوەی کە ئەم بەڵگانە بابەتەکە رەتناکەنەوە، بەڵکو لە زۆر شوێندا خۆیان دەبنە بەڵگە لەسەر راستی و گرنگی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستیی لە قورئان و سوننەتدا.

- تەفسیرکردنی قورئان دوو رێڕەوی سەرەکیی هەیە: (التفسير بالمأثور) بریتییە لە راڤەکردنی قورئان سەرەتا بە دەقەکانی دیکەی قورئان، پاشان بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و وتەی هاوەڵەکان و تابیعینەکان، هەروەها (التفسير بالرأي) یان تەفسیری عەقڵی، کە بریتییە لە ئیجتیهادکردنێکی راست بۆ لێکدانەوەی ئایەتەکانی قورئان لەلایەن موفەسیرەوە، دوای بەدیهاتنی چەند مەرجێك تێیدا و شارەزابوونی بە چەند زانستێك کە گرنگترینیان زمانەوانی زمانی عەرەبی و لێکدانەوەی وشەکانی زمانی عەرەبییە.

- تەفسیری زانستیی قورئان دەچێتە جۆری دووەمەوە کە تەفسیرکردنە بە بۆچوون (الرأي).

تەفسیری زانستیی بریتییە لەو تەفسیرەی کە زاراوە زانستییەکان بەکاردەهێنێت بۆ لێکدانەوەی دەستەواژە قورئانییەکان و کۆشش بۆ دەرهێنانی ئاماژە زانستییە جۆراوجۆرەکان لێیەوە دەکات.

- کەسانێك هەن ئینکاریی ئەوە دەکەن کە قورئان ئاماژەی زانستیی تێدا بێت، بەڵام کاتێك ئەمەیان بۆ نەچووە سەر و نەیانتوانی ئینکاری و رەددی ئەو هەزاران ئاماژە زانستییە بدەنەوە کە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا

(ﷺ) هاتووه، هەستان بە هەڵبەستنی درۆیەکی دیکە گوایا پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە بە وەرگرتنی ئەم زانیارییە لە خەڵکان و میللەتانی دیکەوە.

– بێباوەڕان بیانووی ئەوە دێننەوە ئەوەی موحەممەد (ﷺ) هێناویێتی لە راستی و زانیاریی دەربارەی کۆرپەلەزانی، لە میللەتانی دیکەوە وەریگرتووە، وەك: یۆنانی و پزیشکە عەرەبەکان و خاوەنانی کتێبە ئاسمانییەکان.

– بۆچوونی میللەتانی دیکەی پێش ئیسلام دەربارەی کۆرپەلە و دروستبوونی مرۆڤ، لە کۆمەڵێك ئەفسانە و خورافات دەرناچێت، تەنها بە خەیاڵ دایانناوە و لەسەر بنەمای زانستی نەبووە، بەهۆی نەبوونی هۆکارە زانستییەکان لەبەردەستیاندا.

– زانایانی مسوڵمان باوەڕی تەواویان هەبووە کە منداڵ لە هەردوو دایك و باوکەوە دروست دەبێت و زانست بە هەڵە باسی دروستبوونی کۆرپەلەی دەکرد، ئەویش بە پشت بەستن بە ئایەتە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

– قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر راستییە زانستییەکانی کۆرپەلەزانی و شێوازی دروستبوونی مرۆڤیان زۆر بە وردی باس کردووە و دووبارەیان کردووەتەوە، کە تەنها دووسەد ساڵ دەبێت زانایان گەیشتوونەتە ئەم راستییانە، لەمرۆماندا وەکو موعجیزەیەك سەیری دەکەین.

## چەند راسپاردەیەکی گرنگ:

١- بەردەوامبوون لە گرێدانی ئەم کۆنگرانە بەشێوەیەکی خولی.

٢- پشتگیرییکردنی توێژەرەوان بۆ بەردەوامبوون و فراوانکردنی توێژینەوەکانیان.

٣- دامەزراندنی سایتێك و گۆڤارێکی تایبەت بەم بوارە بە هاوکاریی لایەنەکانی دیکە.

٤- هاندانی نووسین و وەرگێڕان لەم بوارەدا و خستنەبەردەستی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان.

٥- گرێدان و رێکخستنی گفتوگۆ و رووبەڕووبوونەوەی نەیاران لە کەناڵەکان و هۆکارەکانی راگەیاندندا.

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری (جامع البيان في تفسير القرآن) ناسراو بە تەفسیری (الطبري)/ دانراوی: (أبو جعفر محمد بن جرير الطبري)/ دار المعرفة- ١٩٨٦.

٣- تەفسیری (تفسير القرآن العظيم) ناسراو بە تەفسیری (إبن كثير)/ دانراوی: أبي الفداء إسماعيل ابن كثير/ دار الكتاب العربي- ٢٠٠٤.

٤- تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن) ناسراو بە تەفسیری (القرطبي)/ دانراوی: (أبو عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبى)/ دار إحياء التراث العربي.

٥- تەفسیری (فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير)/ دانراوی: محمد بن علي الشوكاني/ دار ابن كثير/ الطبعة الثانية- ١٩٩٨.

٦- تەفسیری (الجلالين)/ دانراوی هەردوو زانا: (جلال الدين السيوطي و جلال الدين المحلي)/ دار إحياء التراث العربي.

٧- تەفسیری (روح المعاني في تفسير القران العظيم والسبع المثاني)/ الآلوسي البغدادي- دار إحياء التراث العربي- بيروت.

٨- تفسير التحرير والتنوير- محمد الطاهر ابن عاشور - الدار التونسية للنشر- بدون تأريخ.

٩- تفسير المحرر الوجيز- أبي محمد عبدالحق بن عطية الأندلسي- تحقيق: عبدالسلام عبدالشافي محمد- دار الكتب العلمية- بيروت- ٢٠٠١.

١٠- التفسير الكبير و مفاتيح الغيب- الإمام الفخر الرازي- دار الفكر- بيروت-١٩٨١.

١١- مفردات ألفاظ القرآن/ الراغب الأصفهاني- تحقيق: صفوان عدنان داودي- دار القلم- دمشق.

١٢– خۆلاصەی تەفسیری نامی– مەلا عبدالکریمی مدرس– ناوەندی ئارا– ٢٠١٠.

١٣– تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان/ م. بورهان محمد أمین / چاپی شەشەم – ٢٠٠٤.

١٤– پوختەی تەفسیری قورئان (موفرەداتی قورئان)/ مامۆستا محمد مەلا صالح بامۆکی/ چاپی یەکەم – ٢٠٠٥.

١٥– تەفسیری رامان– ئەحمەد کاکە مەحمود– چاپی یەکەم – ٢٠٠٧.

١٦– فتح الباري شرح صحيح البخاري/ الإمام ابن حجر العسقلاني/ مكتبة دار السلام/ الطبعة الثالثة–٢٠٠٠.

١٧– صحيح مسلم بشرح الإمام النووي/ الإمام يحيى بن شرف النووي/ دار المعرفة/ الطبعة السادسة – ١٩٩٩.

١٨– معجم (لسان العرب)/ لإبن منظور / دار صادر– بيروت.

١٩– معجم (القاموس المحيط)/ مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروزآبادي/ دار الفكر/ الطبعة الأولى– ٢٠٠٣.

٢٠– التفسير والمفسرون – د. محمد حسين الذهبي – آوند دانش – ٢٠٠٥.

٢١– نحو منهج لتفسير القرآن– محمد الصادق عرجون– الدار السعودية للنشر والتوزيع– الطبعة الثالثة– ١٩٧٣.

٢٢– إحياء علوم الدين – أبي حامد الغزالي – دارالحديث– القاهرة – ٢٠٠٤.

٢٣– جواهر القرآن– أبي حامد الغزالي– برنامج الكتروني.

٢٤– الإتقان في علوم القرآن– جلال الدين السيوطي– حققه: فواز أحمد زمرلي– دار الكتاب العربي – بيروت – ٢٠٠٥.

٢٥– مناهل العرفان في علوم القرآن – محمد عبدالعظيم الزرقاني – حققه واعتنى به: فواز أحمد زمرلي – دار الكتاب العربي – بيروت – ١٩٩٥.

٢٦- التبيان في علوم القرآن- ابن قيم الجوزية.

٢٧- تحفة المودود بأحكام المولود- ابن قيم الجوزية- مطبوعات مجمع الفقه الإسلامي/ جدة.

٢٨- الموافقات في اصول الشريعة-لأبي اسحاق الشاطبي- تحقيق: الشيخ عبدالله دراز- الطبعة الثانية-١٩٧٥.

٢٩- القران الكريم والتوراة والانجيل والعلم (دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة)- د. موريس بوكاي- مكتبة مدبولي- القاهرة-٢٠٠٤.

٣٠- إعجاز القرآن – مصطفى صادق الرافعي.

٣١- القرآن يتحدى – عزالدين أحمد – دار السعادة.

٣٢- مفهوم الإعجاز القرآني – دانراوى (د. أحمد جمال العمري)- دار المعارف بمصر.

٣٣- كيف نتعامل مع القرآن – محمد الغزالي – سلسلة قضايا الفكر الإسلامي (٥) المعهد العالمي للفكر الإسلامي ـ مكتب القاهرة- ط ٣، ١٩٩٣.

٣٤- كيف نتعامل مع القرآن العظيم؟ – الشيخ يوسف القرضاوي- دار الشروق – الطبعة الأولى- ١٩٩٩.

٣٥- مستندات التوفيق بين النصوص القرآنية وبين النتائج العلمية الصحيحة – د.سعاد يلدرم – المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي للقرآن والسنة . إسلام أباد ، ١٤٠٨هـ (١٩٨٧م).

٣٦- خلاصة بحث التفسير العلمي للقرآن، بين المجيزين والمانعين – محمد أمين ولد الشيخ – المؤتمر العلمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة. إسلام أباد، ١٤٠٨هـ (١٩٨٧م).

٣٧- الإسلام والطب الحديث: المقدمة – د. عبدالعزيز إسماعيل.

٣٨- طبائع الإستبداد ومصارع الإستعباد- عبدالرحمن الكواكبي- تقديم: الدكتور أسعد السحمراني- الناشر: دار النفائس- ٢٠٠٦ م.

٣٩- موسوعة حقائق الإعجاز العلمي في مواجهة الشبهات – المجلد الثالث – سايتى: الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (www.eajaz.com).

٤٠- علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة – الشيخ عبدالمجيد الزنداني، د. مصطفى أحمد، بمشاركة مجموعة من علماء الأجنة الغربيين المعروفين: (Joe Leigh ، Gerald C. Goeringer،Marshal E. Johnson and T. V. N. Persaud، Keith L. Moore،Simpson ) – من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (إسلام آباد- باكستان) – من إصدارات: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة) – مطابع رابطة العالم الإسلامي.

٤١- إنه الحق- عبدالمجيد الزنداني – هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة / الطبعة الثالثة – ١٤٢٠هـ.

٤٢- تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة – من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (إسلام آباد/ باكستان) – من إصدارات (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)- ١٩٨٧ز.

٤٣- المعجزة العلمية في القرآن والسنة (تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)- الشيخ عبدالمجيد الزنداني.

٤٤- بروانه: التفسير العلمي للقرآن، بين المجيزين والمانعين- محمد أمين ولدالشيخ- المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي – إسلام أباد، ١٤٠٨هـ .

٤٥- ئامازەكانی كۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا/ د. كاوە فەرەج سەعدون/ ناوەندی رۆشنبیر/ چاپی یەكەم – ٢٠٠٦.

٤٦- حديث (إن تحت البحر نارا) ومطابقة ذلك للحقائق العلمية- عبد الواسع بن يحيى بن محمد المعزبي- جامعة الإيمان / صنعاء- ٢٠٠٧.

٤٧- موقف الأصوليين والعلماء (قداماهم ومحدثيهم) من التفسير العلمي- د.محمد فتحي الدريني- مجلة أسماء (١) هـ (١٩٨٨م).

48- Langman's Medical Embryology \ T. W. Sadler \ Lippincott Williams & Wilkins \ 10th edition - 2006.

٤٩- الإعجاز العلمي للقرآن الكريم بين القبول والمعارضة: الأستاذ الدكتور كارم السيد غنيم (أستاذ علم الحشرات ـ جامعة الأزهر- أمين عام جمعية الإعجاز العلمي في القرآن والسنة في الأزهر)، سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=644

٥٠- المعارضون للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (مناقشة الآراء ودحض الحجج)- د.كارم السيد غنيم، سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=175

٥١- التفسير العلمي للآيات القرآنية الكونية بين المؤيدين والمعارضين- د. كارم السيد غنيم- سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=393

٥٢- في الرد على منكر الإعجاز العلمي في القرآن الكريم (النتيجة الحتمية للجهل بالآيات القرآنية وإنكار المعجزات الإلهية) - أ.د. نظمي خليل أبوالعطا موسى - سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=878

٥٣- أوهام - منهزم - حول الإعجاز العلمي - هشام طلبة- سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=881

٥٤- نقد شبهة أن علماء الإعجاز (يسرقون جهود) علماء الغرب وينسبونها للإعجاز القرآني - د. عبد الرحيم الشريف- سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=392

٥٥- رد الشبهات حول علم الأجنة في القرآن والسنة- د. مصطفى عبدالمنعم- مقال منشور بموقع: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة: (http://www.quran-m.com).

http://www.quran-m.com/firas/arabicold/?page=show_det&id=1787&select_page=23

٥٦- شبهات حول مراحل تكون الجنين - إعداد: د. عبد الرحيم الشريف - سايتى: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة:

http://www.quran-m.com/container2.php?fun=artview&id=406

٥٧- ويكيبيديا.



# قورئان یاسای بوونەوەر و خەزنەی زانستەکانە.. ڕێ بۆ توێژینەوە نوێیەکان خۆش دەکات

د. موحەممەد جەمیل ئەلحەبال
پزیشکی ڕاوێژکاری هەناوی و توێژەری ئیعجازی زانستی و پزیشکیی
لە قورئان و سوننەتدا
دەممام – شانشینی عەرەبی سعودییە

٢٧ی زولقەعیدە/ ١٤٣٢ ك، ٢٠١١/١٠/٢٥ ز

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودای خاوەن شکۆ و درووود و سڵاویش لە پێغەمبەری خودا و خاووخێزان و هاوەڵان و دۆستانی..

هەڵبەتە بانگخواز و تۆژەری ئیسلامی لەم سەردەمەدا (هەروەها یەکبەیەکی موسڵمانانیش لە هەموو کات و ساتێکدا) پێویستە ئەرك و ڕێبازەکەیان لە بانگەواز بۆ ئیسلام و بۆ کتێبە مەزنەکەی کە قورئانەو بەرگریکردنیش لێیان، هەمان ئەرك و ڕێبازی دوایین پێغەمبەر بێت، کە موحەممەدی سەروەرمانە، درووود و سڵاوی خودای لێبێت.

ئەو ئەرك و ڕێبازەش لەمانەدا پوخت دەبێتەوە: بانگەواز بۆ باوەڕهێنان بە خودای گەورە و پەرستنی بە تەنهایی و بەبێ هاوەڵ، باوەڕهێنان بە دواڕۆژ، ترسان لەو ڕۆژی لێپرسینەوەیەی دێتە پێش، کارکردن بۆ بنیاتنانی مرۆڤی باش و کۆمەڵگەیەکی هەڵبژاردە، بەپێی ڕێنوێنیی ئەو قورئانەی کە دوایین کتێبی ئاسمانی و باڵادەستە. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ) (المائدة: ٤٨). واتە: (قورئانمان بەهەق بۆ ناردیتە خوار، کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێت و پشتیوانیان لێدەکات). هەموو ئەمانەش، لە پێناوی ئەوەدایە: لەم جیهانەدا، مرۆڤەکان لە سەلامەتی و ئاسوودەییدا بژین و جێنشینیی خودای بەرز و پیرۆز، لە زەویدا و ئاوادانکردنەوەی بەدی بهێنن.. پاش ئەوە (کە لە هەمووی گرنگترە) بەدەسهێنانی ڕەزامەندیی خودای میهرەبان و ئاسوودەیی هەمیشەییە (کە بەهەشتی نەبڕاوەیە). هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ) (النحل: ٩٧). واتە: (کێ، لە نێر، یا مێ، چاکە ئەنجام بداو باوەڕدار

بێت، ئەوا بە ژیانێکی خۆش، دەیژێنین و بە چاکتر لەوەی ئەنجامیان دەدا، پاداشتیان دەدەینەوە).

## ڕێبازی پەسەندی بانگەوازی قورئانی:

بە مەبەستی گەیشتن بەم ئامانجە مەزن و چارەنووسسازانە، پێغەمبەری جێباوەڕ و سەروەرمان (دروود و سڵاوی خودای لێبێت)، هەروەها برایانی دیکەی لەسەرجەم پێغەمبەران (دروود و سڵاوی خودایان لێبێت)، لە بانگەوازدا، بە ڕێنوێنی خودای گەورە، پەیڕەوییان لە ڕێباز و شێوازێك دەکرد، کە دەکرێت لەم خاڵە سەرەکییانە خوارەوەدا، پوخت و پاڵفتە بکرێت:

**١ـ بەڵگە و بەرچاوڕوونی:**

خودای بەرزو بێگەرد فەرموویەتی: (قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ) (يوسف: ١٠٨). واتە: (بڵێ: ئەمە ڕێگەکەمە، بانگی خەڵکی دەکەم بۆ لای خوا، هەم خۆم و هەم ئەوانەشی پەیڕەویم دەکەن بەرچاوڕوونین، پاك و بێگەردە خوداو منیش لە هاوبەش ڕەوادەران نیم). بەرچاوڕوونییش بریتییە لە: سۆنگە و بەڵگە و زانیاری و نیشانە. هەروەك لەم فەرماییشتانەی خودای گەورەدا هاتووە: (هَذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ) (الجاثية: ٢٠). واتە: (ئەم (قورئانە) کۆمەڵێك بەرچاوڕوونییە بۆ خەڵکی، بۆ کەسانی باوەڕپتەویش ڕێنوێنی و ڕەحمەتە). (قَدْ جَاءكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ) (الأنعام: ١٠٤). واتە: (چەندان بەرچاوڕوونییتان، لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، سا هەر کەس بینی، لە قازانجی خۆیەتی، هەرکەسیش خۆی کوێر بکات، لە زیانی خۆیەتی، منیش چاودێر و پارێزەر نیم بە سەرتانەوە). (يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُوراً مُّبِيناً) (النساء: ١٧٤). واتە:

(هۆ خەڵکینە، لە پەروەردگارتانەوە، بەڵگەیەکتان بۆ هاتووە و ڕۆشنایییەکی ئاشکراشمان بۆ ناردوونەتە خوارێ).

**٢. دانایی و ئامۆژگاری جوان:**

خودای بەرز و بێهاوتا دەفەرموێت: (ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) (النحل: ١٢٥). واتە: (بە دانایی و ئامۆژگاری جوان، بانگەواز بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بکەو بە باشترین شێوە لەگەڵیاندا بدوێ، دیارە پەروەردگارت خۆی زۆر زانایە بەو کەسەی لە ڕێبازەکەی لای داوەو هەر خۆیشی زۆر زانایە بە هیدایەت وەرگران).

لێرەدا سەرنج دەدەین، ئەوەی داواکراوە لە گوتاری بانگەوازئامێزدا، بریتییە لە ئامۆژگاری جوان و بریتییە لە تاووتوێی زانستی لەسەرخۆ و ڕەسەن، کە دەتوانین ناوی بنێین: "وتووێژی زانستی ژیربێژییانە" .. بەڵام وشەی "الحكمة = دانایی" پێشیکەوتووە، کە دەکرێت بە "دانانی شت لە جێی خۆیدا" پێناسە بکرێت. هەر لەبەرئەوەیە لە کۆندا بە پزیشك دەگووترا "حکیم "، چونکە پاش دیارییکردنی نەخۆشییەکە، دەرمانی بۆ نەخۆش دادەناو لە شوێنی شیاودا دایدەنا. لێرەشدا دانایی، بریتییە لە "پێکهاتنەوە و پێکان لە گوفتار و کرداراو دانانی گشت شتێکیش بە چاکی و وردەکاری، لە شێوێنی شیاوی خۆیدا"[1]. دەتوانین بڵێین ئەوە "شێوازی بانگەواز"ە.. بەڵام هەر سەردەمێك بۆ خۆی، چەند شێوازێکی هەیە لە بانگەوازدا، کە بانگخوازی موسڵمان پەیڕەوییان لێدەکات، بە مەبەستی گەیشتن بە هزروهۆش و دڵ و دەروونی خەڵکی، تا ئەو ئامانج و ئەرکە مەزنانە بەدی بهێنێن، کە تۆزێك لەمەوبەر باسمان کردنو گوتمان

---

[1] ابراهيم النعمة، قبسات من الحكمة النبوية في الدعوة الى الله، ص٥.

ئەركی گشت پێغەمبەران و ڕەوانەكراوانی خودایە "دروود و سڵاوی خوایان لێبێت".

ئەم شێواز و ڕێوڕەوشانەش، بەندە بە دۆخی ژین و ژینگەیان و هەروەها ئاستی هزروبیری خەڵكی لەو دەمەدا.

## زەروورەت و هۆكارەكانی گوتاری زانستی

ئێمە كە لەم سەدەیەدا دەژین، بۆچوونمان وایە.. لەم كات و ساتەدا، یەكێك لە باشترین شێوازەكانی بەرگریكردن لە قورئانی پیرۆزو دەرخستنی ڕاستی و خەزنە بەنرخەكانی، بە خستنەڕووی بەڵگە و گوتاری زانستی، یان ئەوەی پێی دەگوترێت: ئیعجازی زانستیی لە قورئانی پیرۆزدا، دەبێت. ئەوەش لەبەر ئەم هۆكارانەی خوارەوە:

١- زانست و پێشكەوتنی زانستی و تەكنۆلۆژیا و زانیاری، لە بابەتەكانی ئەم ساتەیەو زمانی زانستییش، زمانی ئەم سەردەمەیە، كە بایەخێكی زۆر بە زانستە ماددی و ئەزموونئامێزەكان دەدات.

٢- زمانی هاوبەشی دانیشتوانی سەرزەوی، وێڕای جیاوازی زمان و ڕەگەز و ڕۆشنبیرییان، بووە بە زمانی زانست. ڕاستییە زانستییەكانیش لەو شتانەن، كە هەمووان لێی تێدەگەنو لەسەری هاوڕانو لەبەردەم ئەم پێشكەوتنە زانستییە بێشومارەشدا، كە خێراترین و ئاسانترین پەیوەندی و گەیاندنی بۆ گواستنەوە و ئاڵوگۆڕكردنی ئەم زانست و زانیارییە لە سەرجەم بوارەكان و وردترین پسپۆڕیدا، دابین كردووەو دابینیشی دەكات.. جیهان بووە بە گوندێكی بچكۆلە. ئەمە لە كاتێكدایە كە قورئانی پیرۆز، كتێبی ڕێنموونییە بۆ هەموو خەڵكی، نەك تەنها بۆ عەرەب، یان ئەوانەی لە زمانی عەرەبی دەگەن و سەرودەر لە ئیعجازی دەربڕینو ڕەوانبێژییەكەی دەكەن (كە یەكێكە لە گرنگترین لایەنی ئیعجازی

قورئان)، بەڵکو لەم ساتو کاتەداو لە ئەنجامی پێشکەوتنی زانستەکان، لە سەرجەم پسپۆڕییەکانیاندا، ئەرکی سەرشانمانە ئەو لایەنە زانستییەی کە زۆر ڕوون بووەتەوە، بخەینە ڕوو.

٣ـ لەم سەردەمەدا، زانست زۆربەی شێوازەکانی ژیانی مرۆڤ و ڕێبازی بیرکردنەوەی گۆڕیوە.. بە چەشنێك مرۆڤ بە هۆی زانستەوە، هەر چەندە ڕاست و دروستیش بێت.. چاو دەخشێنێتەوە بەو ڕێیانەی پێشینان، لە کۆندا بەڵگەیان پێهێناوەتەوە.. وەك: پەیڕەوی ئەقڵیی.

مرۆڤی ئێستە وا دادەنێت ئەوانە ڕێگەگەلێکی پووچ بوونو باوەڕی وایە، ڕێگەی دروست و جێمتانە بۆ بەڵگەهێنانەوەی پەسەندکراو، ئەو ڕێگایانەن بیرکردنەوەی زانستی بەرهەمی هێناون، هەڵبەت دیندوژمنان و بێدینانیش، بڕێك لەم ڕاستییە زانستییانەیان، بۆ دژایەتیکردنی ڕاستییە ئیمانییەکان بەکارهێناوە.. بانگەشەی زانستیبوونو بیرکردنەوەی زانستییانەش بۆ خۆیان دەکەن.. بێئەوەی بزانن ئەم زانستانە هەرچەندە پێش بکەون، لەچاو ئەو ڕاستییە زاستییە چەسپاوە ڕەهایانەی زانستی خودا، کە لە بوونەوەردا هەیە، مشتێکە لە خەرمانێك. وەك دەفەرموێت: (وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً) (الإسراء: ٨٥). واتە: (هەر کەمێك لە زانستان پێدراوە).

ئێمەی موسڵمانیش، لەبەردەم ئەم لێشاوانەدایەو پێویستە بە هەمان ئەو زاراوە و هۆکار و شێوازانە ڕووبەڕوویان ببینەوە، کە بەکاریاندەهێنن. ئەوەش بە پەیڕەوکردنی شێوازی زانستیو هێنانەوەی هزرێکی تێروتەسەل و سەردەمیانەی ئیسلامی، بەوەش بەڵگەی زانستییان دەخەینە بەردەمو ئەگەر ڕاست بکەن بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێن.. خودا ڕێگەی ئیمانو ئیسلامەتییان پیشان دەدات. لە هەمان کاتیشدا، متمانە بۆ زۆرێك لە موسڵمانان دەگێڕینەوەو باوەڕیان پتەوتر دەبێت، ئەو موسڵمانانە دەیانەوێت لەبەر ڕۆشنایی (بەڵام بۆئەوەی دڵم ئاو

بخواتەوە)[٢].. وەڵامی زانستیی بۆ زۆربەی پرسیارەکان بدۆزنەوە. خودای گەورەش دەفەرموێت: (بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ) (الأنبياء: ١٨). واتە: (بەڵکو هەق دەدەین بەسەر بەتاڵ و ناحەقدا، بە هۆیەوە بەتاڵ مێشکی دەپژێ و تێکدەشکێت. ئینجا دەستبەجێ بەتاڵ دەفەوتێ.. هاوار بۆ ئێوە لەبەر ئەوەی دەیڵێنو ڕەوای دەدەن بۆ خوا).

---

[٢] (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِـي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءاً ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْياً وَاعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (البقرة: ٢٦٠).

واتە: ئەو دەمەی ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارا.. پێم پشان بدە، مردووان چۆن زیندوو دەکەیتەوە.. گوتی: ئایا ئیمانت نەهێناوە.. گوتی: با.. بەڵام بۆئەوەی دڵم ئاو بخواتەوە.. گوتی: چوار لە مەلان بگرەو کەرتوپەرتیان بکە لای خۆت.. پاشان بەسەر هەر کێوێکەوە بەشێکیانی لێ دابنێ.. پاشان بانگیان بکە، بە فڕکە دێنەوە لات. خاوەنی کتێبی (زبدة التفسير من فتح القدير) لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: مەبەستی (ئیبراهیم پێغەمبەر درووود و سڵاوی خودای لەسەر) لە (أرني) بینین بە چاوی دڵ نەبووە، مەبەستی بینین بووە بە چاوی سەر، تا دڵنیایی لێ بەدەست بهێنێت. (أولم تؤمن) ئاخۆ باوەڕت نەهێناوە بەوەی توانام بەسەر زیندووکردنەوەدا دەشکێت.. وا دەپرسی پیشانت بدەم. (قال بلى) گوتی: با.. دەزانم و باوەڕیشم بەوە هەیە توانات بەسەریدا هەیە (ولكن ليطمئن قلبي) بەڵام بۆئەوەی دڵم ئۆقرە بگرێت، بەهاتنەپاڵی بەڵگەی بەرچاو، لەگەڵ بەڵگە ئیمانییەکاندا.. هەڵبەت هەرگیز گومانی لە زیندووکردنەوەی مردووان نەبووە، بەڵکو داوای بینینی کردووە بەچاو، چونکە حەزی بینینی ئەو شتانەی کە بۆی باسکراوە دەروونی مرۆڤی لەسەر بەدیهێنراوە. پێغەمبەریش (درووود و سڵاوی خودای لەسەر) دەفەرموێت: (ليس الخبر كالمعاينة) دەنگوباس وەك بینین بەچاو نییە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (ما في القرآن عندي آية أرجى منها)، واتە: ئایەتێکی قورئانم لانییە، لەوە هیوابەخشتر بێت - تا ئێرە لە تەفسیرەکە وەرگیراوە- لەوەشدا ئاماژەیەکی دیار هەیە بۆ ئەوەی بەڵگە بەرچاوەکان (ڕاستییە زانستییە بەرهەستەکان) چەندە بگونجێت، بخرێنە پاڵ (ڕاستییە ئیمانییە نادیارو غەیبییەکان).

٤ـ ئەو مادده زانستییە بێشومارەی لە قورئانی پیرۆزدا هەیە، خەزنەی زانست و زانیارییەکانە. دیارە قورئان سامانێکی زانستیی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێناوە، چونکە ئەم کتێبە پیرۆزە، وێڕای ئەوەی لە بنچینەدا کتێبی بیروباوەڕ و حوکمە شەرعییەکان و ڕێنوێنییە، گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە کۆمەڵگەدا بەدی هێناوەو کۆمەڵگەی لە هاوەڵدانانەوە بۆ یەکخواپەرستی.. لە سەرگەردانییەوە بۆ ڕێنوێنی.. لە گەندەڵییەوە بۆ چاکسازی.. لە کاولکارییەوە بۆ بیناکاری گواستووەتەوە.. زۆرێك لە ئاماژە و ڕاستییە زانستییەکانیشی باس کردووەو لە هەموو پسپۆڕییە سروشتییەکاندا زۆرتر لە (١٢٠٠) ئایەتە. واتە: نزیکەی ٢٠٪ی تێکڕای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە کە دەگاتە (٦٢٣٦) ئایەتو لە هەردوو کتێبمدا (العلوم في القرآن–[٣] زاستەکان لە قورئاندا) و (الطب في القرآن–[٤] پزیشکی لە قورئاندا)، کۆمکردوونەتەوەو ڕیزبەندییم کردوون.. هەروەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا هاتووە:

**بابەتە زانستییەکان و ژمارەی ئایەتەکان و ڕێژەی سەدییان بەپێی هەر بابەتێك لە قورئانی پیرۆزدا**

| ژمارە | بابەتی زانستی | ژمارەی ئایەتەکان | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|
| ١ | زانستە پزیشکییەکان | ٤١٦ | ٣١,٥ |
| ٢ | فیزیا | ١٣٨ | ١٠,٥ |
| ٣ | زیندەوەرزانی (ڕووەك، گیانلەبەر) | ١٣٠ | ٩,٨ |

[3]. محمد جميل الحبال ومقداد الجواري، العلوم في القرآن.

[4]. محمد جميل الحبال ووميض العمري، الطب في القرآن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤ | گەردوونزانی و بۆشایی ئاسمان | ١٠٥ | ٨,٠ |
| ٥ | جوگرافیا | ٩٨ | ٧,٤ |
| ٦ | کشتوکاڵ | ٨٩ | ٦,٧ |
| ٧ | بیرکاری و ئامار | ٧٩ | ٦,٠ |
| ٨ | زانستی چینەکانی زەوی | ٦٩ | ٥,٢ |
| ٩ | فێربوون‌و تۆژینەوەی زانستی | ٥٩ | ٤,٥ |
| ١٠ | دەریازانی و ڕووبارزانی | ٣٥ | ٢,٦ |
| ١١ | هۆیەکانی گواستنەوە | ٢٨ | ٢,٠ |
| ١٢ | بنەچەی مرۆڤ و دروستکراوەکانی دیکە | ٢٧ | ٢,٠ |
| ١٣ | ئەو ئایەتانەی بەسەر گشت زانستەکاندا دەچەسپێت | ١٨ | ١,٥ |
| ١٤ | ئەندازە | ١٢ | ٠,٩ |
| ١٥ | کیمیا | ١١ | ٠,٨ |
| ١٦ | زانستی زمانی ئاژەڵ و باڵندە | ٨ | ٠,٦ |
| | تێکڕای ئایەتەکان | ١٣٢٢ | ١٠٠ |

ئێمەش لەم سەردەمەدا، بەهۆی ئەم برە زۆرە لە ئاماژە زانستی و پزیشکییەکانی قورئان و سوننەت.. بەهۆی ئەوەشی کە زانستی ئەزموونگەری بۆمان دەخاتەڕوو و یارمەتیمان دەدا، لە ماناکانیان بگەین، کە پێشینانمان لەبەر نەبوونی ئەو ئامرازانە لە لایان، نەیاندەتوانی لێی تێبگەن. لە ئێستەداو لەم دۆخەدا، بە یارمەتی خودا.. ئەگەر کەرەستەکان بۆ سەلماندن لەبەردەستدا بن.. دەتوانین لە برێك لە بوارە زانستییەکان پێشکەوتنی زانستیی بەدی بهێنین.

ئەوەش لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز، هەردەم ڕاستییە ڕەهاو دڵنیاکانی گەردوونو ژینمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. وەك دەفەرموێت: (وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ) (الإسراء: ١٠٥). واتە: ئەم قورئانەمان بە هەق دابەزاندووە و بە هەقیش دابەزیوە. هەروەها دەفەرموێت: (لَّـكِنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيداً) (النساء: ١٦٦). واتە: (بەڵام خودا شایەتی دەدات ئەو قورئانەی بۆ تۆی دابەزاندووە.. بەزانستی خۆی دایبەزاندووە.. فریشتەکانیش شایەتی دەدەن.. هەر خوداش بەسە شایەت بێت).

٥ـ هەروەها لە دەرخستنی لایەنە زانستییەکانی قورئانی پیرۆزدا. وەڵام و بەرگرییەکی باشی ژیربێژی و ژیرانە هەیە، بۆ دەمکوتکردنی ئەو کەسانەی بە درۆو دەلەسەو دەسهەڵبستەوە، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە قورئان دژ بە زانستو پێشکەوتنیەتیو بووە بە بەرد و بەربەستی سەر ڕێی زانایان و هزری زانستی.. ئەو ئایەت و ئامار و نموونانەی پێشتر باسمان کردو ئەوانەشی پاشتر باسیان دەکەین.. هەموو ئەم بانگەشە درۆینانەی لە لایەنی نەزانەوە، یان دیندوژمنی قین لە دڵەوە، بڵاوکراونەتەوە.. پووچەڵ دەکەنەوە، بەڵکو پێچەوانەی ئەو بانگەشانە ڕاستە.. چونکە ژمارەیەك لە ئایەتە قورئانییەکان جەخت دەکەنەوەو هانی ئەوە دەدەن لە بوونەوەر و دیاردە سروشتییەکانی و مرۆڤ و سەرجەم دروستکراوان بڕوانن و ڕابمێنن و بچنە بنج و بناوانییەوەو کەڵکیان لێوەربگیرێت.. وەك دەفەرموێت: (قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (العنكبوت: ٢٠). واتە: (بڵێ: گەشتێك بە زەویدا بکەنو تەماشا بکەن، خوای گەورە بەدیهێنانی چۆن دەستپێکرد؟ پاشان هەر خودا بەدیهێنانی دواڕۆژیش بەدی دەهێنێت.. دیارە خوداش بەسەر گشت شتێکدا بەتوانایە).

(قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ) (يونس: ١٠١). واته: (بلّیّ: سەرنج بدەن.. چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە.. لای کەسانێکیش کە باوەڕ ناهێنن.. بەڵگە و ترسێنەرەکان کەڵکی نییە).

(فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ) (الطارق: ٥). واتە: (دەبا مرۆڤ بڕوانێت، لە چ بەدیهێنراوە).

(أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ * وَإِلَى السَّمَاء كَيْفَ رُفِعَتْ * وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ * (وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ) (الغاشية: ١٧ـ ٢٠). واتە: (ئەریّ لە وشتر ناڕوانن چۆن بەدیهێنراوە؟! لە ئاسمان چۆن بە حەوادا دراوە؟! لە کێوەکان چۆن داکوتراون؟! لە خاك چۆن ڕاخراوە؟!).

(وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ * وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) (الذاريات: ٢٠ـ ٢١). واتە: (لە زەویدا بەڵگەگەلێك بۆ باوەڕپێتەوان هەیە، لە خۆشتاندا (بەڵگە هەیە) ئاخۆ بینایيتان ناخەنە گەڕ).

موحەممەد قوتب دەڵێت: (هەر کە هەستی مرۆڤانە، لەم ئایەتانەدا تیّ دەفکرێت.. خۆی بۆ خۆی ئاوڕێکیش بە لای لایەنی زانستییەکەشیان دەداتەوە.. چونکە گشتیان دیاردە سروشتییەکانو سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشن. قورئانی پیرۆزیش هۆشوگۆشی مرۆڤ بێدار دەکاتەوە، تا بچێتە بنجوبناوانییەوە و لێی ڕابمێنێت. لەکاتی تێڕامانەکەیشیدا، جێی سەرسوڕمان نییە، گەر سەروسۆراغی ئەو ڕێوشوێنە خوداییانە بکات، کە خودا ئەم دیاردە سروشتییانەی پیّ بەڕێوە دەبات.. گەڕانیش بەدوای ئەم ڕێوڕەوشە بوونەوەرییانەو هەوڵدان بۆ ئاشنابوون پێیان، بۆخۆی هەوێنی ڕاستەقینەی زانستە، کە بەهۆیەوە توێژینەوەی زانستیی پێشدەکەوێت و پەردەی سەر نادیار و نەزانراو لادەدا)[5].

---

[5] محمد قطب، رؤية إسلامية لأحوال العالم المعاصر، ص١٦١.

ئەمە جگە لەو سەدان ئایەتە پیرۆزانەی کە سەبارەت بە بێدارکردنەوەی وره و ژیرین، تا تێبفکرن و ئەو کەرەستە بەرهەستانەی خودا بۆ مرۆڤی بەدی هێناون، بەگەڕبخات و بە ڕاستییە ئیمانی و زانستییەکانیش بگات. وەك دەفەرموێت: (أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ) (الأنعام: ٥٠). واتە: (...ئایا تێ نافکرن؟!)، (لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ) (البقرة: ٢١٩). واتە: (...بەڵکو بیر بکەنەوە)، (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ) (محمد: ٢٤). واتە: (...ئاخۆ ڕانامێنن؟!)، (أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (البقرة: ٧٦). واتە: (...ئایا تێناگەن؟!)، (لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (الحديد: ١٧). واتە: (...بەڵکو تێبگەن)، (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الرعد: ٣). واتە: (بێشك لەوەدا، بۆ کەسانێك بیر دەکەنەوە، کۆمەڵێك نیشانە هەیە)، (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ) (الروم: ٢٢). واتە: (بەڕاستی لەوەدا بۆ زانایان، چەندان نیشانە هەیە)، (إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ) (الحجر: ٧٥). واتە: (بەڕاستی لەوەدا بۆ پەندوەرگران، نیشانەگەلێك هەیە)... تاد.

دکتۆر یوسف قەرزاوی دەڵێت: (لای ئێمەی موسڵمان، ئیمان لەگەڵ ژیری و بیردا بەرهەڵستی ناکات، بەڵکو لەسەری بنیات دەنرێتو پێی دەژی. باوەڕدارانیش لە ڕوانینی قورئانەوە (أولوا الألباب): هۆشمەندانن. قورئانیش چەندان ئایەتی تێدایە (لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ): بۆ کەسانێك تێدەگەن. (يَتَفَكَّرُونَ): بیر دەکەنەوە. ژیری لای لێکۆڵەرانی بەڵگە و ئایەت، بناغەی گوفتاری گەیەنراوە. خۆ ئەگەر ئەو ژیرییە نەدەبوو، بۆ سەلماندنی بوونی خوداو پێغەمبەرایەتی پشتی نەدەبەسترا. قورئانیش بە ڕێنوێنییەکانی، ئەو هزرە زانستییە بەرهەم دەهێنێت، کە پەیوەستە بە بیرو هۆش و باوەڕی بە بەڵگە و نیشانە هەیە و بۆچوونی پووچ ڕەتدەکاتەوە و نکۆڵی لە لاساییکردنەوەی کوێرانەی باب و باپیران، یان بەرپرسە گەورەکان دەکات)[٦].

---

[6] یوسف القرضاوي، الرسول والعلم، ص٣٨.

سا لەبەرئەوە، پاش ئەوەی بارودۆخی ئایینی ئیسلام ئۆقرەی گرت، پاش ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر و جێنشینە پێگەیشتووەکان، بنەماکانی خودابەیەکگرتن چەسپێنران و بێباوەڕی و دانانی برابەش بۆ خودا، لە دوورگەی عەرەبدا لەناوبران، موسڵمانانیش چەندان شاریان ڕزگار کردو دۆخەکەیان بۆ هێوربوویەوە، بڕشت و بەهرەیان سەری هەڵداو لە گشت بوارەکانی زاستە مرۆیی و بوونەوەری و سروشتییەکان پێشکەوتن‌و لە هەموو زانست و زانیارییەکدا برەویان سەندو ژیاری ئیسلامەتی لە شکۆدارترین شێوەیدا دەرکەوت، بە چەشنێك موسڵمانان لە ڕێنوێنییەکانی کتێبی پەروەردگاریان سوننەتی پێغەمبەرەکەیان، تێگەیشتن‌و سەرودەریان دەکرد و زانییان چییان لێ دەویستریت‌و لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی هێنانە ژێر باریدا ئەرك و لێپرسراوێتییان چییە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا:

(وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لَّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الجاثية: ١٣). واتە: (چی لە ئاسمانەکان و چی لە زەویدایە، تێکڕا لەلایەن ئەو (خودا)وە، دەستەمۆکراوە بۆتان.. دیارە لەوەدا، بۆ کەسانێك بیریان بەگەڕبخەن، کۆمەڵێك نیشانە هەیە).

ئەم هێنانە ژێربار و دەستەمۆکردنەش، هەر بەشیکردنەوەی نهێنییەکانی یاسای بوونەوەر پێکدێت.. ئەمەش لە ڕێگەی زانست و زانیاری و شارەزابوون لەو یاسایانەی یاساکانی بوونەوەر و کۆمەڵەکانی دەخاتە ڕوو.

لەبەرئەوە، لەسەرجەم پسپۆڕییە زانستی و مرۆییەکاندا، زانا و پزیشکی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە و بەڕاستی و بۆ چەند سەدەیەك گەورە و سەروەری جیهان بوون.

بەڵام ئەو دەمەی موسڵمانان لەم بیرکردنەوە و تێگەیشتنە پاشەکشەیان کرد، دەستیان لە زانست هەڵگرت.. ئەم زانستانەیان لەدەستدەرچوو.. لە

کاروان جێمان.. ئەمە لەکاتێکدا خۆرئاوا، پەی بە گرنگی ئەم زانستو زانیارییە بردو ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بەگەڕخست، تا لە موسڵمانانەوە فێر بێت. (هەروەك چۆن توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندووە، کە زانست و زانیاری لە موسڵمانانەوە گواستراوەتەوە بۆ ئەوان). ئیدی ئاواتی خۆی بەدی هێناو بەوەش توانی بەسەر جیهاندا زاڵ ببێت! پەروەردگاری بەرزوبەڕێزیش فەرموویەتی: (كُلاًّ نُّمِدُّ هَـؤُلاء وَهَـؤُلاء مِنْ عَطَاء رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاء رَبِّكَ مَحْظُوراً) (الإسراء: ٢٠). واتە: (هەمووان ـ چ ئەوان و چ ئەمان ـ بەخشینی پەروەردگارتیان پێدەدەین.. بەخشینی پەروەردگاریشت، هەر قەدەغەکراو نەبووە).

٦ـ دیارە ئایینی ئیسلام، ململانێی نێوان زانست و ئایینی نەدیوە، لەکاتێکدا ململانێی زانست و ئایین لە سەدەکانی ناوەڕاست و لە ئەوروپادا، هەبووە، کەنیسە دژایەتی زانستی دەکرد و زانایانی دەچەوساندەوە و بایەخ و برەوی بە بۆچوونە پووچەکان دەدات.

لەو سەردەمەدا چەندان کەسی لەو زانایانە کوشت، کە هزر و هۆشیان خستە سەر پشتو بە دۆزینەوە زانستییەکان هەستان. ئەمەش وای کرد، بەربەرەکانێ و دابڕانی توند لەنێوان ئایین کە کەنیسە نوێنەرایەتی دەکردو لەنێوان زانست و زانایانی ئەوروپادا ڕوو بدات.

دیارە ئەوانەی لە وڵاتە ئیسلامییەکانماندا، بانگەوازی وەلانانی ئایین دەکەن.. شوێنپێی ئەوروپاو خۆرئاوا هەڵدەگرن.. ئەمەش هەر لە زەینی ئەوانەدا چەسپیوە، کە هەر بە کلتوری خۆرئاوا خۆیان ڕۆشنبیر کردووە.

ئەم بۆچوونە شێواوە، بیر و هزری بەشێك لەو نەوە و ڕۆڵانەی ئێمەی داگیرکردووە، کە لە ڕۆشنبیری قورئانی و شەریعەتی ئیسلام و مێژووی موسڵمانان لە پێشکەوتنی زانستی و ژیاریدا، هیچ سەرمایەیەکیان نییە. ئیدی ویستوویانە، وەك چۆن ئەوروپا بەگژ ئایینەکەیان چوونەوە، ئەمانیش بەگژ

ئایینەکەی خۆیاندا بچنەوە.. دیارە بێئاگان لەوەی جیاوازییەکی زۆر هەیە، لە نێوان هزر و بیری ئایینی ئەوروپایی و ئیسلام. زانای بلیمەت (موسمیر) زۆر جوان فەرموویەتی: (خۆرئاوایی نابێت بە زانا، تا واز لە ئایینەکەی نەهێنێت.. موسڵمانیش ئەو کاتە بووە بە نەزان، کە واز لە ئایینەکەی دەهێنێت[7]).

دکتۆر عیمادەددین خەلیل دەڵیت: (قورئانی پیرۆز، نزیکەی پەنجا ئایەتی کۆکردۆتەوە، تا هزرو هۆش لەبەرامبەر چەپەڵی لاسایی کوێرانەو دەبەنگی، بخرۆشێنێت.. هەروەها دەیان ئایەتی لە بێدارکردنەوەی هەستەکانی بیستن و بینین و بەرکەوتن، جەم کردووە.. وێڕای داوای بەڵگەکردن، دەیان ئایەتی دیکەشی لە ڕاپەڕاندنی هزربیردا هێناوە.. بگرە قورئان، ڕاستییەکی دیکەی زۆر گرنگی هێناوەو وشەی زانستی بەسەر ئاییندا بڕیوە.. هەردەڵێی ئاوێتەیەکن هەرگیز یەکالابوونەوەی نییە، پاشان لە زمانی قورئانیشدا زانست و ئایین، پێکەوە شانبەشانی یەکدی دەڕۆن[8]).

دکتۆر حامید ئەحمەد حامیدیش دەڵێت: (لە قورئانی پیرۆزدا، باسی "زانست (علم) و ئەو وشانەی لێی وەردەگیرێن" لە "٧٨٢" جێگەدا هاتووە. وشەی "زانیاری (معرفة)" لە "٢٩" جێگەدا هاتووە. ژمارەی ئەو جارانەی "زانست و زانیاری" تێدا هاتووە، یەکسانە بە ژمارەی جارەکانی "باوەڕ و لێوەرگیراوەکانی" کە "٨١١" جێگەیە لە قورئانی پیرۆزدا[9])، ئەوەش لە ڕوانینی قورئانییەوە، بەڵگەیە بۆ هاوسازیو هاوکۆکی، لەنێوان زانست و ئاییندا!

قورئانی پیرۆز هانی هزری داوە، تا لە متبوونی بێدار بێتەوەو بیر لە دامودەزگای ئاسمانەکان و زەوی بکاتەوە، هەروەك پێشتر باسمان کرد. ئەمەش

---

[7] أنور الجندي، شبهات التغريب في الفكر الإسلامي، ص٣٢.

[8] عمادالدين خليل، تهافت العلمانية، ص٣٧.

[9] حامد أحمد حامد، رحلة الإيمان في جسم الإنسان، ص٧.

ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە قورئان بە ئاشکرا بایەخ بە ڕێنوێنی مرۆڤ دەدات، تا ببینێت و لە کونج و کەلی ئەم بوونەوەرە سەیرە ببیستێت.. بەوەش سام و بیمی لەبەردەم ڕاستی خوداوەندێتی زۆرتر دەبێتو دڵی پڕ لە باوەڕ دەبێتو متمانەی بەوە دەبێت کە ئەم بوونەوەرە ـ وەك نەزانان و کۆلکە زاناکان بانگەشەی بۆ دەکەن ـ زادەی هەڵکەوت و ڕێکەوت نییە، بەڵکو خودای خوڵقێنەری کاربەجێی بەتوانای ڕێکخەری زانەر بەدی هێناوەو بۆ مرۆڤی دەستەمۆ کردووەو قورئانیشی دابەزاندووە، تا بۆی ببێت بە پەیڕەوێكو بەختەوەری دنیا و دواڕۆژی بۆ مسۆگەر بکات.. هەروەها ئەم قورئانە پەیڕەو و لێکدانەوەی بوونەوەریشە!! وەك لەم دێڕانەی خوارەوەدا بە درێژی لێی دەدوێین.

## دوو کتێب و دوو خوێندنەوە (قورئان و بوونەوەر):

قورئانی پیرۆز گوتەی پەروەردگاری جیهانەکانەو بەهۆی جبریلی جێباوەڕەوە، گەیاندوویەتی بە سەروەرمان موحەممەد (درووود و سڵاوی خودای لەسەر).. تا ببێت بە موعجیزەیەکی هەرە گەورە و نەمر و ژیرانە و زانستییانە و نوێگەر، لە هەمانکاتیشدا کتێبی بیروباوەڕ و پەیڕەوی ژینی هەموو خەڵکی بێت. خودای بەرزو بێگەردیش فەرموویەتی: (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) (الكهف: ١١٠). واتە: (بڵێ: من هەر مرۆڤێکم وەك ئێوە، سروشم بۆ دەکرێت کە پەرستراوتان یەك پەرستراوە، سا هەرکەس بەهیوای دیمانەی پەروەردگاریەتی، با کرداری چاك ئەنجام بداتو لەپەرستنی پەروەدگاریشیدا، کەس نەکات بە هاوبەشی).

خودای گەورە فەرمانمان پێدەکات، قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕابمێنین و لە مانا و مەبەستەکانی بگەین. خوداش دەفەرموێت: (كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ

لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ) (ص: ٢٩). واته: (کتێبێکی پیرۆزمان بۆ دابەزاندوویت، تا لە ئایەتەکانی ڕابمێنن و هۆشمەندەکانیش پەندی لێوەربگرن). بوونەوەریش (بەوەی تێیدایە و مرۆڤیش تەوەرەکەیەتی) بەدیهێنراوی خودایە. (وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً) (الفرقان: ٢). واته: (گشت شتێکی بەدیهێناوە و بە مانای ئەندازەگیری، ئەندازەی گرتووە). ئەو خودایە فەرمانی پێکردووین، سەیری ئەم بوونەوەرە بکەین و لێی ڕابمێنین، تا دەگەین بەو شتەی سوودمان پێ دەگەیەنێت، پاشان بۆ ئەوەی لەڕێگەیەوە، توانا و وردەکاری دەسکاری خودا لە دروستکراوەکانیدا بناسین. کەواتە خودای میهرەبان دوو کتێبی هەیە و دوو خوێندنەوەش:

**خوێندنەوەی یەکەم:** ئەو کتێبە نووسراو (موعجیزەی گەورە) و ڕاستییە ڕەهایە نەگۆڕە.. ئەویش قورئانی پیرۆزە.. گوتەی پەروەردگاری جیهانەکانە.

**خوێندنەوەی دووەم:** کتێبی بەرچاو (موعجیزەی بچووك).. بوونەوەرە بە مرۆڤیشەوە (کە گرنگترین و بەڕێزترین بەدیهێنراوە) کە پەروەردگاری جیهانەکان بەدیهێناوە.

لەکاتێکدا سەرچاوەی ئەم دوو کتێبە یەکێکە (ئەو خودا باڵادەستەیە، کە قورئانی دابەزاندووە و بوونەوەر و مرۆڤیشی بەدیهێناوە) دەبێت دەقاودەق و هاوکۆکی یەکدی بن و هەریەکەیان ئەوی دیکە ڕوون بکەنەوە و یارمەتی یەکدی بدەن بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکان و تێگەیشتنی ماناکان و بەئەنجامگەیاندنی کار، چونکە قورئان چاوساغیت دەکات بۆ بوونەوەر.. بوونەوەریش چاوساغیت دەکات بۆ قورئان، لە باری کۆبوونەوەدا، هەردوولا لە نێوان خۆیاندا کۆمەڵەیەکی هاوکۆك و هاوکار پێکدەهێنن و دەکرێت ئەم زاراوەی بەسەردا ببڕین: (دامەزراوەی قورئانی لە بوونەوەر و مرۆڤ و زانست) کە بەپێی یەك کۆمەڵە یاسا و ڕێسا کار دەکەن! ! هەروەك لە وێنەی ژمارە (ا)دا هاتووە:




**وێنەی ژمارە (١): دامەزراوەی قورئانی لە بوونەوەر و مرۆڤ و زانستدا و لێکدانەوە بۆیان.**

هەردوو خوێندنەوەی (سرووش و بوونەوەر) ئەرك و فەرزن، چونکە کاری خوداییەو کۆکردنەوەی هەردووکیان پێویستەو بەبێ ئەوە، تەگەرە و ناڕێکی ڕوو دەدات و کاتێکیش ئەو دوو کتێبە، یا ئەو دوو خوێندنەوەیە، لێك دادەبڕێن.. ئەوا ئەنجامەکەی بەم جۆرە دەبێت:

ئەوانەی وابەستەی لایەنەی غەیبی و نادیاری خوێندنەوەکە (کتێبی سرووش) دەبن‌و دەست لە لایەنی بابەتییانە و بنەما زانستی و زانیارییەکانی بوونەوەر (پەڕتووکی بوونەوەر) بەردەدەن و هەر بە لای بابەتی نادیار و ڕۆحیدا

دەچن.. ئەمەش بەرەو هزرو بیرێکی چەقبەستوویان دەبات و زۆر ڕێیشی تێدەچێت —بە هەڵە— لەسەر ئایین حسێب بکرێن.

ئەوانەشی هەر وابەستەی خوێندنەوەی بوونەوەر دەبن و بەس.. نکۆڵی ئەو لایەن و ڕەهەندە ئیمانیی و غەیبییە چالاکە دەکەن، کە لە بوون و جووڵەیدا هەیە.. ئەمەش بەرەو بیر و هزرێکی ماددەپەرستییان دەبات، کە خراپ بەسەر ڕەوت و شیرازەی ژیاریدا دەشکێتەوەو دەبێت بە هۆی سەرهەڵدانی زۆرز گیروگرفت. لەئێستەشدا جیهانی ماددی ئەوانە دەبینێت.

جیاوازیی نێوان هەردوو کتێبی (قورئان و بوونەوەر) ئەوەیە کە خوێندنەوەی قورئان، سرووشی خودای خولقێنەرە بۆ خولقێنراو.. بەپێی توانای مرۆیی خۆی، هەلی ڕامانی لە کتێبی خودای میهرەبان بۆ دەڕەخسێت. (وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ) (القمر: ١٧). واتە: (خۆ دیارە قورئانمان بۆ پەندوەرگرتن ئاسان کردووە، سا هیچ پەندوەرگرێك هەیە).

هەرچی خوێندنەوەی بوونەوەریشە بریتییە لە ڕوانینی خولقێنراو بۆ خولقێنەرەکەی، بەگوێرەی توانا ڕێژەییەکانی مرۆڤ، لە تێگەیشتنی ڕاستییە زانستییەکانی بوونەوەر، ئیدی دابڕانی درۆینەی نێوان زانیارییە دراوەکانی سرووش (قورئانی پیرۆز)و ئەنجامە بابەتییەکانی زانیاری و ڕاستییەکانی بووەنەوەر.

ئەمەش سەرەتاکانی سرووش، لە سورەتی (العلق)دا جەختی لێکردۆتەوەو تێیدا خودای گەورە فەرموویەتی: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ( ١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ( ٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ( ٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ( ٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) (العلق: ١ـ ٥). واتە: (بخوێنە بەناوی پەروەردگارت کە هەموو شتێکی بەدی هێنا، مرۆڤی

له خوێنێکی بەستوو بەدیهێنا، بخوێنە و پەروەردگاریشت بەخشندەترە، ئەوەی مرۆڤی بەقەڵەم فێر کردووە، مرۆڤی فێری ئەوەی نەیدەزانی کرد)[١٠].

لێرەدا ئاماژەی بوونەوەر لە قورئانی پیرۆزدا، دەقاودەقە لەگەڵ زانیارییە دراوەکانی زانست و ڕاستییە نەگۆڕەکانی، هەر لەبەر ئەوەیە شێخ عەبدولمەجید زەنەدانی دەڵێت: (ناگونجێت ئایەتێکی قورئان و ڕاستییەکی زانستی پێکدا هەڵبپژێن.. خۆ ئەگەر ئەوە ڕووی دا.. ئەوە یا ئاماژە زانستیەکە ڕاستینە نییە، یا تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئایەتە قورئانییەکە ناڕاستە[١١]).

دیسان لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو فەرمانو ئەرکە شەرعی و ئاکار و سروتە پەرستشییانەی ئیسلام، کە دەستوورەکەی قورئانە.. لەگەڵ دروسکردنی مرۆڤ و بوونەوەردا هاوکۆك و هاوڕەوتە، لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و ڕێساکانی بوونەوەردا پێکدێتەوە، هەر لادانێك، یان هەر دوورکەوتنەوەیەك لەم داب و دەستوورانە، سەر بۆ لێکدابڕین دەکێشێتو دواتریش خراپە و گەندەڵی لە مرۆڤ و کۆمەڵگە و ژینگەدا بەدی دەهێنێت. لە هەموو ئاستەکانی ژیانی دنیاشدا ئەنجامەکان پڕمەترسی دەبن، دیارە جەزرەبەی دواڕۆژ ـ خودا پەنامان بدات ـ توندتر و خۆگرترە. خودای باڵادەستیش دەفەرموێت: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى) (طه: ١٢٤). واتە: (کێ لە ڕێباز و یادم ڕوو وەربگێڕێت، ئەوا ژینێکی تەنگی هەیەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا، بە کوێری حەشری دەکەین). هەروەها دەفەرموێت: (فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) (النور: ٦٣). واتە: (با ئەوانەی خۆیان لە فەرمانی پێغەمبەر دەدزنەوە، بترسن لەوەی بەڵایەکیان بەسەر بێت، یان بەر جەزرەبەیەکی ئازاردەر بکەون). ئاشکرایە خودای پاك و بێگەرد بوونەوەر و

---

[10] طه جابر العلواني، الجمع بين القراءتين، قراءة الوحي وقراءة الكون (بە دەستکارییەوە).

[11] عبدالمجيد الزنداني، تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، ص٢٦.

مۆڤی بەدی هێناوەو نهێنی و یاسا و ڕێساکانی تێدا داناون.. هەر خۆیشی قورئانی دابەزاندووە و ڕێنوێنی و فەرمان بە کردن و نەکردنەکانی تێدا داناوە بۆ ئەو مرۆڤانەی بەدی هێناون‌و ڕێزی گرتوون. دەشزانێت چی لەگەڵیان دەگونجێت‌و میهرەبانە لەگەڵیانداو دەزانێت چی قازانجیان پێدەگەیەنێت و چیش زیان. وەك دەفەرموێت: (قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً) (الفرقان: ٦). واتە: (بڵێ: ئەو (خودای)ەی دایبەزاندووە، نهێنیی ناو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت.. ئەو هەر لێبوردەی میهربەخش بووە). هەروەها دەفەرموێت: (أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) (الملك: ١٤). واتە: (مەگەر نازانێت کێی بەدی هێناوە.. لە کاتێکدا (خودا) خۆی وردەکاری کارناسە).

## نموونەکان:

بێگومان قورئانی مەزن، خەزنەی زانست‌و زانیارییەو کانیاوێکە وشك نابێت. هەموو زانایانیش هەریەکەو بەپێی پسپۆڕی وردی خۆی، قورئان بۆ توێژینەوە نوێیەکان چاوساغییان دەکات‌و سەرکەوتنیش بەدەستدەهێنن ئەگەر ئاماژە زانستییەکانی، بە دروستی بەگەڕ بخەن (لەکاتێکدا جوان لێی تێبگەن و بە وردی بیتوێژنەوە) بۆ خزمەتی زانیاری و پێشکەوتنی زانستی لە ئێستە و ئایندەدا، تا دەگات بە قازانجی مرۆڤایەتی و بەختەوەری و بنەمای بەجێنشینداران (هێنانە ژێربار و دەستەمۆکردن) لە زەویدا بەدی دێت. هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەو تێیدا خودای بەخشندە دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً) (لقمان: ٢٠). واتە: (ئایا نابینن کە خودا چی لە ئاسمانەکان و چی لە زەویدایە،

دەستەمۆی کردووە بۆتان و نازو نیعمەتە دیار و نادیارەکانی بە تەواوی بەسەردا ڕشتوون).

وێڕای ئەوەی قورئانی پیرۆز ڕێنوێنیمان دەکات بۆ بیروباوەڕی ڕاست و دروست، داب و دەستوورە پاك و پاڵفتە و ڕێکوپێکەکانو بۆ ئاکارە جوانەکان.. ڕێنوێنیشمان دەکات بۆ سەراپای زانستە مرۆیی و بوونەوەرییەکان بە سەرجەم بوارەکانییەوەو هێڵە بەرفراوانەکان و ئاماژەکانی ئەم زانستانەمان پێدەدات. وەك خودا خۆی دەفەرموێت: (إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ) (الإسراء: ٩). واتە: (بە ڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەك کە ڕاسترینە).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خودا لێی ڕازیٚ بێت) دەفەرموێت: (من أراد العلم فليثوّر القرآن ! فإنّ فيه علم الأولين والآخرين[١٢]). واتە: (کیٚ زانستی دەویٚ، با لە قورئان بکۆڵێتەوە ! چونکە زانستی پێشینانو پاشینانی تێدایە).

پێشەوا سیوتی بە ڕەحمەت بێت، لە کتێبەکەیدا بەناوی (الإتقان في علوم القرآن)دا دەفەرموێت: (إن كتاب الله العزيز قد اشتمل على كل شيء، أما أنواع العلوم فليس منها باب ولا مسألة هي أصل إلا وفي القرآن ما يدل عليها[١٣]). واتە: (دیارە کتێبی خودای باڵادەست، گشت شتێکی لەخۆ گرتووە. پرس و باسی بنچینەی هەموو زانستێکیش، لە قورئاندا هەیەو ئاماژەی پێدەدات).

پێشەوا زەرکەشی بە ڕەحمەت بێت، لە کتێبەکەیدا بەناوی (البرهان في علوم القرآن)دا دەفەرموێت: (من كان حظه في العلوم أوفر، كان نصيبه في علوم

---

[12] البوصيري، الدرر السنية- پێگەیەکی ئەنتەرنێت.

[13] السيوطي، الإتقان في علوم القرآن، ٢/ ١٢٩.

القرآن أكثر[14]). واتە: (کێ بەشی لە زانستەکانی قورئاندا زۆرتر بێت، پشکی لە زانستەکانی دیکەدا زۆرتر بووە).

دیسان بەدیعوززەمان، مامۆستا سەعیدی نورسی، بە ڕەحمەت بێت، لە لاپەڕە (٢٣٨)ی تەفسیرەکەیدا بەناوی (إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز)دا لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا: (وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ) (الأنعام: ٥٩) واتە: (چی تەڕەو چی وشکە لە کتێبێکی ئاشکرادایە). دەفەرموێت: (إن "كتاب مبين" —على قول— هو القرآن الكريم. فهذه الآية الكريمة تبين أنه ما من رطب ولا يابس إلا وهو في القرآن الكريم... نعم، إن في القرآن كل شيء! ولكن لا يستطيع كل واحد أن يرى فيه كل شيء، لأن صور الأشياء تبدو في درجات متفاوتة في القرآن الكريم. فأحياناً توجد بذور الأشياء أو نواه، وأحياناً مجمل الشيء أو خلاصته، وأحياناً دساتيره، وأحياناً عليه علامات. ويرد كل من هذه الدرجات إما صراحة أو إشارة أو رمزاً أو إبهاماً أو تنبيهاً. فيعبر القرآن الكريم عن أغراضه ضمن أساليب بلاغته وحسب الحاجة وبمقتضى المقام والمناسبة[15]). واتە: (دیارە "كتاب مبين": کتێبێکی ئاشکرا، بەپێی ڕایەك قورئانە، ئەم ئایەتە پیرۆزەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە هیچ تەڕو هیچ وشکێك نییە، لە قورئانی پیرۆزدا نەبێت... بەڵێ، لە قورئاندا هەموو شتێك هەیە! بەڵام هەموو کەسێك ناتوانێت هەموو شتێکی تێدا ببینێت.. چونکە لە قورئانی پیرۆزدا وێنەی شتەکان لە چەند پلەیەکی جیاوازدا دەردەکەون. جاروبار تۆوی شتەکان، یان ناوکی شتەکان دەبینرێن.. جارجارەش تێکڕای شتێك، یان پوختەکەی.. بڕێ جاریش دەستوور و یاساکانی.. بڕێ کاتیش نیشانەکانی بەرچاو دەکەون.

---

[14] بدرالدين الزركشي، البرهان في علوم القرآن، ٢/٢٥.

[15] سعيد النورسي، إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز، ص٢٣٨ .

هەموو ئەم پلەیانە هاتوون.. جا، یان بە ڕاشکاوی، یان بە ئاماژە، یان بە هێما، یان بە شاردنەوە، یان بە ئاگادارکردنەوەیە. قورئانی پیرۆزیش لە ڕێگەی شێوازە ڕەوانبێژییەکانو بەپێی پێویستو بە خواستی شوێن و شیاوی.. لە مەبەستەکانی خۆی دەدوێت).

ئەو کەسەی تەماشایەکی کتێبەکانی پێشینان و ڕاڤەکاران ـ بەڕەحمەت بن ـ بکات.. دەبینێت ئەو ئایەتانەی سەبارەت بە زانستە پزیشکییەکان و بوونەوەرییەکانن، لەچاو ئەو ئایەتانەی سەبارەت بە فەرمانە فیقهییەکانن، بایەخێکی کەمیان پێدراوە. هەڵبەتە ئەو زانایانە لەوەدا بیانووبەدەستن، لەبەر بەردەستنەبوونی ئەو کەرەسەو تەکنۆلۆژیا زانستییە تازانەی لەم سەردەمەدا هەیەو ئێستە دەتوانرێت ـ بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی باسکرا ـ کەڵکی لێوەربگیرێت.

بێگومان بەگەڕخستنی ئەو ئاماژە پزیشکی و زانستییانەی لە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (درود و سڵاوی خودای لەسەر) هاتوونو گواستنەوەیان لە لایەنی تیۆری و بیردۆزییەوە بۆ لایەنی جێبەجێکردنی کرداری (واتە لە ئیعجازەوە بۆ دەسکەوت و لە باسکردنەوە بۆ بەگەڕخستن) کارێکی گرنگە.. هەروەها سوودوەرگرتنیش لە زانیارییە دراوە تازەکانی زانست و پزیشکی و تەکنۆلۆژیای پەرەسەندوو، بە کارێکی گرنگ دادەنرێت، بۆ بەدیهێنانی ئەوە و بۆ بەدیهێنانی پێشکەوتنی زانستی لە قورئانو سوننەتدا، کە بۆ خستەسەر ڕێی مرۆڤایەتی و بەختەوەرییان هاتووە، لەسەرجەم بوارەکاندا، لەوانە هاندانی بۆ زانست و تۆژینەوەی زانستی.

ئاشکرایە کەسی بە سەلیقە و شارەزا لە قورئان، کۆمەڵێك شتی لێهەڵدەگۆزێت، کە هێشتا زانستی ئەزموونگەری پێی نەگەیشتووە.. ئیدی موسڵمان لە قورئانەوە وەریدەگرێتو چەندان تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەی

ئەزموونگەری لەسەر بنیات دەنێتو بۆ دۆزینەوەی زانستی نویٚ و پێشی خەڵکی بداتەوە، کە ڕێی تێدەچێت لەوپەڕی گرنگی و کەڵکدا بێت بۆ مرۆڤایەتیو سەرکەوتنیش بێت بۆ ئوممەتی ئیسلام! خودای بەرزو بێگەردیش فەرموویەتی: (بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ) (القصص: ٣٥). واتە: (بە نیشانەکانمان ئێوە و ئەوانەشی پەیڕەویتان دەکەن، زاڵن).

مەزنترین هۆکاری سەرکەوتن ئەوەیە کە باوەڕداران ئایەتەکانی خودای بەهێزی باڵادەستیان پێبێتو بەپێی بایەخدان و پەیڕەوی لێکردنیان، کەڵکی لێوەربگرن، لەبەر ئەوە سەیر نییە کە خودای بەرز و بێگەرد لە ئایەتە قورئانییە مەککەییەکاندا (ئەوانەی بە چەند ساڵ پێش کۆچکردن بۆ مەدینەو پێش مۆڵەتدان بە جیهادی چەك و کوشتار دابەزیون) بفەرموێت: (وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَاداً كَبِيراً) (الفرقان: ٥٢). واتە: (بە هۆیەوە خەباتێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە). واتە: بە قورئان، گوتراویشە: بە ئیسلام و هەوێنەکەی کە قورئانە.

ئەم خەباتە گەورەیە لە بانگەوازدا، بۆ دەرخستنی ئایەتو خەزنەکانی قورئان و بەرگری لێکردنیو بۆ دەرخستنی موعجیزەکانی، لەوانە ئیعجازی زانستی.. لە ڕێگەی بەڵگە و بەرچاوڕوونییەوە دەبێت، نەك لە ڕێگەی چەك و چۆڵ! چاکیش دەزانین خەباتو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا، وەك پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لەسەر) بە چڵە پۆپەی ئیسلام ناوی هێناوە، بەڵام بە خەباتی گەورە باس نەکراوە.. هەر لەم جێیەی قورئاندا نەبێت (جهاداً كبيراً).. کە گرنگیی گوتاری زانستی لە بانگەواز بۆ لای خودای بەزر و بێگەرد پیشان دەدات.

هەرچەندە موسا و هارونی برای (دروود و سڵاوی خودایان لەسەر) چەند نیشانەیەکیان پێبوو، کە شتی سەرسوڕهێنەریان ئەنجام دەداو پێودانگەکانی بەراوەژوو دەکردەوە. لەوانە: گۆچانەکەی موسا پێغەمبەر (دروود و سڵاوی

خودا لەسەر).. بەڵام گۆچانەکە دروسکراوێك بوو، موعجیزەکەی لە دەرەوەیدا بوو، هەروەها موعجیزەکەشی بە مەرگی موسا پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودا لەسەر) دوایی دەهات. هەرچی قورئانیشە گوتەی خودای باڵادەستەو موعیزەکەی لە خۆیدایە.. هەروەها موعجیزەکەی بە مەرگی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لەسەر) دوایی نەهاتووە، بەڵکو تا بەرپابوونی دوارۆژ، خودا بۆ موسڵمانانی پاراستووە، بەڵام موسڵمانیش پێویستی بە تێڕامان و تۆژینەوە و تێکۆشان هەیە تا لەسەر دەستی موسڵمانان، موعجیزەی شاراوەی ئایەتەکان بە ڕوونی دەربکەوێـت. بۆ تێگەیاندنی ئەم ماناو مەبەستە دوو نموونە دەهێنینەوە:

**یەکەم:** ناوچەوان (سەرەتای قاشی پێشەوەی مێشك) ناوەندی بڕیاردان: ئەوەش لە فەرمایشتی خودای دەسەڵاتداری شکۆداردا هاتووە: (كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ * نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ) (العلق: ١٥- ١٦). واتە: (نەخێر خۆ ئەگەر دەست هەڵنەگرێ، هەر بە پێشەسەر ڕایدەکێشین.. پێشەسەرێکی درۆزنی بەهەڵەداچوو).

وشەی (السفع) لە زمانی عەرەبیدا وەك ڕاڤەکارانی قورئان باسیان کردووە، بە مانای گرتنی شتێك و کێشکردنی دێت. هەرچی (ناصیة)یە، سەرەتای سەرە.. وەك (فراء) بەڕەحمەت بێت، باسی کردووە[١٦]. ئەو وشەیە لە بنەڕەتدا - وەك لە بەڵگەکانی زمانی عەرەبیدا دەخوێنرێتەوە - بەرزی و بڵندی دێت لە شتێکدا. ئەوەی چاوەڕوان دەکرێت لە زمانی عەرەبیدا، ئەوەیە کە ئەوەی درۆ دەدرێتە پاڵی هەموو مرۆڤەکەیە، یان گوفتاریەتی، یان کرداریەتی، یان نووسینیەتی، هەورەها (هەڵە)ش وەسفە بۆ کەسێك، یان کردارێك، بەڵام ئەندامەکانی جەستە، وەك ناوچەوان، شان، قۆڵ، ڕان... تاد، ئایا بڕێکیان هەر لە ڕاستیدا درۆ و هەڵەی دەدرێتە پاڵ! یان لە ڕووی خوازە و ڕەوانبێژییەوەیە؟ خوازە و

---

[16] .أبي زكريا الفراء، معاني القرآن، ٣/ ٢٧٩.

ڕەوانبێژییش، لەکاتی هەبوونی گرفتدا، پەناگەی زۆربەی ڕاڤەکاران بوون و گوتوویانە: خستنەپاڵی درۆ و هەڵە، هی خودی ناوچەوان نییە، بەڵکو هی خاوەنەکەیەتی! .. ڕەنگە ئەوە، بە بیانوو بۆ ڕاڤەکاران بهێنرێتەوە، کە خوازە و ڕەوانبێژی، ڕوویەکی لێکدانەوەی ئایەتەکەیە، چونکە قورئانی پیرۆز عەرەبی دواندووە، کە دەکرێت لێکدانەوی بۆ بکرێت بەپێی ئەندازەی زانستییان، دەشکرێت لە چەشنی ئەم ڕستەیەدا، بە ناوچەوان، یان ڕوخسار گوزارشت لە تێکڕای مرۆڤ، بکرێت، لەبەرئەوەی ناوچەوان بەرزترین شوێنە لە مرۆڤدا. زانایانیش نموونەی زۆریان باسکردووە، تێیدا ناوی بەشێك لە شتێك هێنراوە، بەڵام مەبەست لێی گشتی بووە. وەك ئەم فەرمایشتەی خودایە: (فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ) (المجادلة: ٣). واتە: (ڕزگارکردنی گەردنێك). بە (گەردن) گوزارشت لە مرۆڤی (کۆیلە) کراوە، لەبەر هەبوونی بۆنەیەك، کە لە باسی ڕزگارکردنی کۆیلەدا، لەگەڵ ئەم دەربڕینە دەگونجێت، بەڵام ئەگەر دواتر دروستی لێکدانەوەی دەستەواژەکە، بەپێی ڕواڵەت و ڕاستی و دەقاودەقی وشەکە دەرکەوت، ئەوا پێویستە ئەو لێکدانەوە دەقاودەقە وەربگرین، چونکە خوازە (بەشێکە لە ڕەوانبێژی) دەرچوونە لە ڕواڵەت و ڕاستی وشەکە.. پەناشی بۆ نابرێت، مەگەر لەکاتی پێویستدا.. لەکاتێکدا کە لێکدانەوەی وشەکە بەپێی ڕاستیی و ڕواڵەتەکەی قەدەغە بێت، یان نەکرێت، هەروەك زانراوە لە زانستی (أصول الفقه)دا.

ئەو ڕاستەقینەیەشی پزیشکانی ئەمڕۆ گومانیان لێی نییە، ئەوەیە کە ناوچەوان سەرەتای قاشی پێشەوەی مێشك لە خۆدەگرێت ( Prefrontal area).. ئەو بەشەیە کە بڕیارەکانی تێدا دەدرێت و بیر و بیرۆکەکانی ـ لە ڕاست و درۆ و هەڵە و.... تادـ تێدا دروست دەبن. هەروەك لە وێنەی ژمارە (٢)دا هاتووە:




ناوچەوان: **ناوەندی ژیرێتی و بڕیاردان لە مرۆڤدا**

**وێنەی ژمارە (٢): وێنەی لاتەنیشتی مێشك، سەرەتا قاشی پێشەوە (Prefrontal area) ڕوون دەكاتەوە.**

هەرچی زار و دەست و پێیە، تەنها چەند ئامرازێکن، بەپێی ئەو شتەی لەو بەشەی مێشکدا سازکراوەو بڕیاری لێدراوە، دەجولێن، بێگومان بۆ بەدرۆزن دانانی ناوچەوان لە زمان لەپێشترە.. هەروەها لە وەسفکردنی بە هەڵە. ئەمەش لە زانستی پزیشکییدا پاش ئەنجامدانی چەندان تۆژینەوەی ئەزموونگەریو لێکۆڵینەوەی زۆر، لەبارەی ئەرکەکانی مێشکەوە، دۆزراوەتەوە. لەو تۆژینەوانە: وێنەگرتن بە لەرەی موگناتیسی کرداری (MRI-f). ئەو دەمەی کەسێك درۆ دەکات، ئەوا لەم ناوچەیەی پێشەوەی مێشکدا، بەڕوونی ئاماژە بەوە دەدات. وەك چۆن لە وێنەی ژمارە (٣)دا دەردەکەوێت.



## En flagrant délit

C'est grâce à l'imagerie par résonance magnétique fonctionnelle (IRMf) que l'on peut voir si une personne ment. Dans ce cas, une zone (en jaune), située dans le cortex frontal, connaît une suractivité singulière (ci-dessous, coupes horizontales du cerveau).

**وێنەی ژمارە (٣) چەند بڕگەیەك لە مێشك.. ناوەندی درۆ لە سەرەتای قاشی پێشەوەدا (ناوچەوان) بە ڕەنگی پڕتەقاڵی دەخاتە ڕوو.. لەو کاتەدا کە کەسەکە دەست بە درۆ دەکات و دیاریکردنی بە وێنەگرتنی بە لەرەی موگناتیسی کرداری (MRI-f)، زانراوە کە پزیشکانی خۆرئاوا، ئاماژە ئایینییەکانیان نەبووە، تا بەرایی تۆژینەوەیان بۆ بخاتە سەر پشت، بەڵکو لە ئەنجامی پشتبەستنیان بە ڕوانینی ژیرانە و تاقیکردنەوە و شکست و بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا نوێیەکان، بەو ئاکامە گەیشتوون!**

خۆ ئەگەر پزیشکە موسڵمانەکان، پێشتر ڕابمانایە.. کە بەبێ هۆ نییە لە ناو گشت ئەندامەکانی جەستەدا، ناوچەوان درۆ و هەڵەی دراوەتە پاڵ.. ئەگەری ئەوەشیان دابنایە کە ئەو وەسفە ڕاستینەیەو ئەو کارزانی و هۆزانییەی لە پشتە. ئەگەر بەم تێڕوانینە بیانڕوانیایە، ئەوا لە دۆزینەوەی ئەرکەکانی مێشکدا، پێش ناموسڵمانەکان دەکەوتن. ئەوەی لەم نموونەیەدا ڕووی داوەو زۆریش لە هاوشێوەی ئەم نموونەیە. وەك: (شیرپێدانی سروشتی تا دوو ساڵی ڕەبەق، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هەروەها دەرخستنی سوودەکانی بۆ شیرەخۆرە و دایك و کۆمەڵگە، بە بەراورد لەگەڵ شیری دەستکردو ئاکامە خراپەکانی) ئەوەیە پاش ئەوەی دۆزینەوە زانستییەکان لە خۆرئاوای ناموسڵمان دەردەکەون، موسڵمانان دەڵێن: ئەو دۆزینەوانە، زۆرتر لە چواردە سەدەیە، قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە!!! بێگومان ئەمە ڕوخسارێکی ئیعجازە، بەڵام بە تێڕوانینی ئێمە، پاشکەوتنە لە لێکۆڵینەوەی قورئان! ئەوەی لە تۆژەری موسڵمان دەویسترێت، ئەوەیە وەك کلیلی ڕچەشکێنی بۆ دۆزینەوە تازەکان، چاو بە قورئاندا بگێڕێتو لە ئایەتەکانی زانستە بوونەوەرییەکان ڕابمێنێت، هەروەك چۆن فەقیهانی پێشین لە ئایەتەکانی فەرمانە فیقهییەکان ڕادەمان، ئەو زانا فەقیهانە، لە لێکدانەوەی تاکە ئایەتێکدا، هەموو ڕووە ڕێتێچووەکانیان دەهێناو بۆ هەر ڕوویەکیش بەڵگەیان دەهێنایەوەو پشتیان بە بەڵگەی دەق و ژیری دەبەست، تا ڕاسترین شێوە و ڕوو زاڵ بکەن، بە چەشنێك فەقیهی ئەمڕۆ، سەرسام دەبێت لە ئاست ئەو کەلەپورەی زانایانی پێشین (بە ڕەحمەت بن) جێیان هێشتووە، هەر لەو تۆژینەوە بەرفراوانانەی لە لێکدانەوەی هەر ئایەتێکی فەرمان و حوکم، ئایەتەکانی پزیشکی و گەردوون و هەموو ئەو زانستانەشی پاڵپشتی لەم تێڕوانینە دەکەن، بگرە دان بەڕاستی و دروستیشیدا دەنێن. هەر وەك خودای تاقانە دەفەرموێت: (وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الأَرْضُ

أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى بَل لِّلّهِ الأَمْرُ جَمِيعاً أَفَلَمْ يَيْأَسِ الَّذِينَ آمَنُواْ أَن لَّوْ يَشَاءُ اللّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعاً وَلاَ يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيباً مِّن دَارِهِمْ حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ) (الرعد: ٣١). واته: (ئەگەر قورئانێك (ی واش هەبوایە) كێوەكانی پێبخرایەتە سەر ڕێ، یان زەوی پێ لەت لەت بكرایە، یان لەگەڵ مردووان قسەی پێبكرایە.. دیارە كاروبار گشتی هی خودایە. ئاخۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەوە پەسەند ناكەن، ئەگەر خودا بخوازێت، هەر هەموو خەڵكی دەخاتە سەر ڕێ؟! ئێستەش ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە، هەر بەهۆی ئەوەی سازاندوویانە، گرفتاری بەڵایەكی سەخت دەبن، یان ئەو بەڵایە هەر لە پەناماڵ خۆیان دێتە خوار، تا وادەی خودا دێت.. دیارە خوداش بەڵێنی خۆی بەدی دەهێنێت).

جا ئایا دەكرێت قورئان دەروازەی چەند تۆژینەوەیەك بخاتە سەرپشت، كە لە بارەی جووڵەی كێوەكانو لەتلەتكردنی زەویو زمانپژاندنی مردووەكانو ئەوەی دەچێتەوە سەری؟! وەڵامەكەشی ئەوەیە، ئەم ئایەتەی سەرەوە، ئەوە ڕەتناكاتەوە، قورئان ببێت بە كلیلێك بۆ گشت زانستەكان، بەڵكو ئەو، بیری ئەو كەسەی لێی ڕادەمێنێت و دەخرۆشێنێت بۆ سەروسۆراغكردنی ئەم كلیلانە تێیداو دەرهێنانیان دەیجووڵێنێت، چونكە قورئان خەزنەی زانستەكانە و ڕێنوێنی بۆ باسە نوێیەكان دەكات.

**دووهەم:** نووستنی یارانی ئەشكەوت شێوازێكی نوێیە بۆ ڕاكشان (پاڵكەوتن): با نموونەیەكی پراكتیكی بخەینە ڕوو كە بەشێوەیەكی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا باسكراوە و هێشتا زانست و پزیشكی نوێ پێی نەگەیشتوون! ئەم بابەتە دەكرێت ببێت بە پرۆژە لێكۆڵینەوەیەكی زانستی پزیشكیی گرنگ، ئەگەر هاتوو سەركەوتوو بوو، ڕەنگە سوودێكی بێئەندازەی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت، نموونەكەش بریتییە لەوەی (نووستنی یارانی ئەشكەوت شێوازێكی نوێی

پاڵکەوتنە) کە لە چیرۆکی (یارانی ئەشکەوت و ڕەقیم)دا وەرگیراوە بە هەموو ئەو ئاماژە زانستیو پزیشکییانەی کە لەبارەی بارودۆخیان دراوە.. بۆئەوەی بەو ئاکامەی باسکرا، بگەین.

خودای گەورە لە سورەتی (الکهف) لە میانەی ١٨ ئایەتی پیرۆزدا لە (٩ – ٢٦) کە لە ٣٣٦ وشە پێکهاتووە، بە درێژی باسی (یارانی ئەشکەوت)ی بۆ کردوین. هەروەك هەمووشمان دەزانین، کە بەشێك لە ڕەوانبێژی قورئانی پیرۆز ئەوەیە: لە باسکردنی ئایەتەکانی، پشت بە کورتی و پوختی دەبەستێت، ئەمە وێڕای ئەوەی کە لە لووتکەی ئیعجازدایە، بەڵام دیارە خودای گەورە بۆیە بەم تێروتەسەلییە باسی حاڵەتی (یارانی ئەشکەوت)ی بۆ کردوین، ویستوویەتی، لەمیانەی ئاماژە ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆکان لە چیرۆکی ئەو گەنجە باوەڕدارانە، ڕێگە بۆ ئێمەی چینی پزیشك و زانایان ڕۆشن بکاتەوە، تا بگەین بە شێوازێکی نویٚ بۆ ڕاکشان. ئەوەش لەڕێگەی سوودوەرگرتن لە تەکنیکە نوێیەکانی ئەم سەردەمەوە. ئەمە لەکاتێکدایە خودای گەورە کە باسی چیرۆکی (عوزەیر) (درووی خودای لەسەر بێت) دەکات، تەنها بە شەش وشەی ئایەتێکی سورەتی (البقره) ئاماژەی پێدەکات (فَأَمَاتَهُ اللّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ) (البقرة: ٢٥٩). واتە: (سەد ساڵ مراندی، پاشان زیندووی کردەوە). سا لەبەر ئەوەی ئەم ڕووداوە موعجیزەیە، موعجیزەش وەك زانایان پێناسەی بۆ دەکەن (کارێکی لە ئاسایی بەدەر، ئاوێتەیە بە ململانیٚو دووریشە لەبەرهەڵستی)، جا لەبەر ئەوەی کارێکی لەڕادەبەدەرە، ئەوا پێویست ناکات زانایان چاودێری بکەن و لاسایی بکەنەوە. لەکاتێکدا پێمان وایە حاڵەتی (یارانی ئەشکەوت) بە شێوازێکی زانستی باسکراوە، بۆیە دەکرێت پسپۆڕان لاسایی بکەنەوە، ئەمەش دواتر بە تێروتەسەلی باسی دەکەین. ئەوەی کە ئەم بۆچوونەمان دەسەلمێنێت قسەی خودای گەورەیە: (أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَباً)

(الكهف: ٩). واتە: (ئاخۆ وات داناوە، کە یارانی ئەشکەوت و ڕەقیم، لە نیشانە سەیرەکانمان بوون). ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها بارودۆخی (یارانی ئەشکەوت) بارودۆخێکی سەرسوڕهێنەرە، نەخێر، بەڵکو لاپەڕەکانی گەردوون پڕن لە شتی سەرسوڕهێنەرتر.

(ابن کثیر) لە ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (واتا باس و بەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت لە ڕوانگەی توانا و دەسەڵاتی ئێمەوە، سەرسوڕهێنەر نییە، چونکە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و بەدوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژ و هێنانە ژێرباری مانگ و هەسارەکان و نیشانە مەزنەکانی دیکە، بەڵگەن لەسەر توانای خودای گەورەو هیچ شتێك نییە توانای بەسەریدا نەبێت، ئەمانە لە بەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت، سەرسوڕهێنەرترن)[١٧].

هەروەها خاوەنی کتێبی تەفسیری (الظلال) دەڵێت: (هەرچەندە چیرۆکەکەیان چیرۆکێکی سەیرە، بەڵام سەیرترین بەڵگە و نیشانەکانی خودای گەورە نییە، چونکە ئەم گەردوونە لەوە سەیروسەمەرەتری لە توێی لاپەڕەکانیدا هەڵگرتووە)[١٨].

لەوەشدا ئاماژەیەکی ناوخۆیی هەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شێوازی نووستنی یارانی ئەشکەوت یەکێکە لەو نیشانە بەشکۆیانەی خودای گەورە، کە پەیڕەوی لە یاسا بوونەوەریو پزیشکییەکان کردووەو حاڵ و باڵی، وەك حاڵ و باڵی سەرجەم ئایەتەکانی دیکەی خودای گەورەیە لە بوونەوەر و مرۆڤداو وەك موعجیزەی پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر بێت) نییە، کە لە چەندی سەروتردا بەتایبەتی ناوی (یارانی ئەشکەوت)مان، کە کۆمەڵێك گەنجی باوەڕدار و یەکتاپەرست بوون، لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەر (عیسا) (دروودی خودای

[١٧] ابن کثیر، تفسیر القرآن العظیم، ٣/ ٧١– ٧٢.
[١٨] سید قطب، في ظلال القران، ٥/ ٨٥.

لەسەر بێت)و خودای گەورە پشتیوانیکردنو پاراستنیو یاساکانی بوونەوەری هێنایە ژێربار بۆ بەرگریکردن و پاراستن و چاودێرییکردنیان، ڕوونیشە پێغەمبەر نەبوون، بەڵکو پیاوچاك بوون.

ئێستاش گرنگترین ئەو ئاماژە زانستی و پزیشکییانە باس دەکەین، کە (یارانی ئەشکەوت) پێدا تێپەڕبوون، تا دەگەین بەو شێوازە هەڵگۆزراوە لەو نووستنو ڕاکشانە قووڵەیان، کە خودای گەورە کردی بە هۆکاری پاراستنیان.

بۆ ئەوەی (یارانی ئەشکەوت) بەشێوەیەکی هێمن و ئارام، بێئەوەی زەرەر و زیانیان پێبگات، لەم ماوە دوورودرێژە بنوون، تەنانەت بۆ ئەوەش ئەم ئەشکەوتە چۆڵە، لەگەڵ گوزەرانیاندا بگونجێت، خودای گەورە ئەو هۆکارانەی بۆ دابینکردن، کە دەبن بەهۆی بەدیهاتنی ئەو نووستنە، خودای باڵادەست فەرموویەتی: (فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحمته ويُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقاً) (الكهف: ١٦). واتە: (سا بەرەو ئەشکەوت بەڕێبکەون، پەروەردگاریشتان لە میهری خۆیتان بۆ پەخش دەکاتەوەو لە کاریشتاندا ئاسانیتان بۆ دەڕەخسێنێت).

سەید قوتب، بەڕەحمەت بێت، لە ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (لێرەدا سەرسوڕمان لەبارەی دڵە پڕ ئیمانەکان دەردەکەوێت، چونکە ئەم گەنجانە کەوا گەل و شار و کەسوکاری خۆیان بەجێدەهێڵنو لە چێژ و خۆشییەکانی ژیان واز دەهێننو پەنا بۆ ئەشکەوتێکی تەنگ و چۆڵ و تاریك دەبەن، ڕەحمەتی خودا ڕوویان تێدەکاتو هەست دەکەن ئەو ڕەحمەتە هەمیشەیی و فراوان و باڵی کێشاوە، (فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحمته)، جا وشەی (ينشر) سێبەری فراوانی و خۆشگوزەرانی دەبەخشێت، ئەو کاتەش ئەو ئەشکەوتە دەبێتە بۆشاییەکی گەورە و فراوان کە ڕەحمەتی تێدا بڵاودەبێتەوە و سێبەرەکەی فراوان دەبێتەوە و بەزەیی و نەرمونیانی و

ئاسوودەیی دەیانگرێتەوە .. ئەو سنووورە بەرتەسكانە نامێنن و ئەو دیوارە ڕەقانە نەرم دەبنەوە و ئەو تەنیایی و دڵتەنگییە كۆتایی دێت و ئاسوودەیی شوێنی دەگرێتەوە)[19].

گرنگترین ئەو هۆكارانەی كە خودای گەورە بۆ (یارانی ئەشكەوت)ی دابین كرد، تا بیانپارێزێت لەكاتی نووستنەكەیاندا، بریتییە لە:

١- پەكخستنی هەستی بیستن: ( Inhibition of hearing system)، چونكە دەنگی دەرەكی، كەسی خەوتوو بەئاگا دێنێتەوە. خودای گەورە فەرمویەتی: (فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَداً) (الكهف: ١١). واتە: (لە ئەشكەوتەكەدا، پەردەمان دا بەسەر گوێیاندا چەند ساڵ). وشەی (ضرب)یش لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: پەكخستن و ڕێگەگرتن، واتا هەستی بیستنی ئەو گەنجانەمان بەشێوەیەكی كاتی پەكخست، كەوا لە گوێدایەو پەیوەستە بە دەماری هەشتەمی كەللەیی (cochlear nerve) لقی بیستن. (وێنەی ژمارەی ٤).

ئەوەش لەبەرئەوەی هەستی بیستن لە گوێدا، تاكە هەستە لەنێو ئەو هەستانەی دیكەدا، كە بەشێوەیەكی بەردەوام و لە هەموو حاڵەتەكاندا كار دەكات.. لەكاتی نووستن، یان لەكاتی بێداریداو مرۆڤ بە ژینگەی دەرەوەیەوە دەبەستێتەوە.

---

[19] سید قطب، في ظلال القران، ٥/ ٨٦.



'igure 1.25 The central connections of the cochlear nerve: (a) afferent fibres; (b) efferent ibres

**وێنەی ژمارە (٤):**

**لقی بیستنی دەماری هەشتەم و پەیوەندییەکانی لە ناوەندەکانی مێشکدا**

٢ـ پەکخستنی کۆئەندامی گورچکردنی تۆڕیی سەرەوژوور ( Inhibition of ARAS (Ascending Reticular Activating System).

ئەم سیستمە کارایە، کەوا زۆر گرنگ و پێویستە بۆ ژیانو لە قەدی مێشکدا ( Brain Stem) هەیە، زاڵە بەسەر هێشتنەوەی باری بێداری و هۆشیارییەکەی، تا بەدەنگی هاندەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکانەوە بچێت. ئەم سیستمەش پەیوەستە بە دەماری کەللەیی هەشتەمەوە (لقی هاوسەنگی vestibular nerve).

ئەم دەمارە (دەماری کەللەیی هەشتەم) دوو بەشی هەیە: یەکەمیان بەرپرسە لەسەر بیستن (cochlear nerve)، دووهەمیان ( vestibular nerve) بەرپرسە لەسەر هاوسەنگی لەش لە ناوەوە و دەرەوە، پەیوەستیشە بە قەدی مێشك و کۆئەندامی گورچکردنی تۆڕیی سەرەوژوور (وێنەی ژمارە ٥):




**وێنەی ژمارە (٥):**

**بەشی هاوسەنگی دەماری هەشتەم و پەیوەندییە فرەکانی بە مێشك و قەدەکەی و گورچکردنی تۆڕیی سەرەوژوور**

هەر بۆیە خودای گەورە فەرمویەتی: (فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ). واتە: پەردەمان دا بەسەر گوێیاندا، بەڵام نەیفەرمووە: (فضربنا علي سمعهم)! پەردەمان دا بەسەر بیستنیاندا، واتا هەردوو بەشەکە پێکەوە پەکخران، سا لەبەرئەوە پەکخستنی کاری دەماری هەشتەم، لە میانەی ڕێگەگرتن لە هاتنی هاندەرەکانەوە لێیەوە بۆ کۆئەندامی گورچکردنی تۆڕیی سەرەوژوور دەبێت بە هۆی:

أـ پەکخستنی هاندەرە ناوەکییەکان، کە بەردەوام لە ڕێگەی ئەو کۆئەندامەی پێشتر باسکرا خەوتوو وریا دەکاتەوە، وەك هەستکردن بە ئازار، یان برسێتی، یان تینویەتی، یان خەونی ناخۆش (مۆتەکە). جا کاتێك پەك دەخرێت، یان سڕ دەکرێت مرۆڤ دەچێتە ناو خەوێکی قووڵەوەو هەموو چالاکییە بەگەشەکانی و گەرمی لەشی کەم دەبێتەوە، هەروەك لە باری متبوون و دابڕان لە جیهانی دەرەوەدا هەیە. خودای گەورە فەرمویەتی: (وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً) (النبأ: ٩). واتە: (خەوتنتانمان کرد بە حەسانەوە). (السبات) بریتییە لە نووستن و پشوو، ئاسودە بوون، (المسبوت) واتە: مردوو، یان بێهۆش (بگەڕێوە بۆ (مختار الصحاح، لاپەڕە ٢١٤).

ب ـ کپکردنی چالاکییە جۆراوجۆرەکانی کۆئەندامەکانی لەش، لەوانەش هەستکردن بە سەرجەم هاندەرەکان، هاوکات پاراستنی هەموو کۆئەندامەکان لە کارکردن بە زیندوویەتی‌و لە بەکارهێنانی وزە لە نزمترین ئاستدا.

ئێمەش بۆچوونمان وایە کە (یارانی ئەشکەوت) لەکاتی نووستنە درێژخایەنەکەیاندا، وایان لێهاتووە، کە گەشەی لەش و پێشکەوتنی تەمەنیان ڕاوەستاوە (Aging process)، سەرباری ئەوەی کە ژیان لە ڕەوتی خۆیدا بەردەوام بووە. هەندێك لە راڤیارانی قورئانیش لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (وَازْدَادُوا تِسْعاً) (الكهف: ٢٥). دەڵێن: (ڕازێك لەو دەستەواژەیەدا هەیە، کە دەکرێت بە

دوو جۆر، یاخود زیاتر لێکبدرێتەوە، چونکە وا زانراوە کە ڕاز و شاردراوەکە، وشەیەکە ئاماژە بەو ماوەیە دەکات کە لەناو ئەشکەوتەکە، گوزەراندویانە. واتە: (نۆ ساڵی زیاتر مانەوە)، دەشکرێ ئەم زیادبوونە بە مانگ بێت، یاخود بە حەفتە، یاخود بە کاتژمێر. جێی باسە ڕاڤیاران کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەوە: سێ سەد ساڵی زاینیو سێ سەدو نۆ ساڵی کۆچی. دەشکرێت مەبەست لەو ڕاز و شاردراوەیە، زیادبوونی تەمەن بێت، چونکە تەمەنی لەشیان ڕاوەستانی تێکەوت، هەربۆیە یەکسان نەبوو بەو ماوەیەی کە تیایدا خەوتبوون، جا ئەو ڕاز و شاردراوەیە، ڕەنگە بەم شێوەیە بخەملێنرێت: (وازدادوا تسعاً في أعمارهم) ئەویش نۆ کاتژمێرە، بە بەڵگەی قسەی خودای گەورە: (قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ) (الكهف: ١٩). واتە: (یەکێك لەوان گوتی: چەندە ماونەتەوە. گوتیان: ڕۆژێك، یان تاقێکی ڕۆژێك ماوینەتەوە). ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە: ڕۆژێك، یان بەشێك لەو ڕۆژە. ئەوەی کە ئەم ڕاڤەیە پشتڕاست دەکاتەوە، ئەوەیە کاتێك گەنجەکان لەو خەوە درێژە بێدار دەبنەوە، تێبینی هیچ گۆڕانکارییەك، لە شێوە و بەژن و باڵایاندا ناکەن. واتە: پێشکەوتنی تەمەنیان کاریگەرییەکی بەرچاوی نەبووە لەسەریان، ئەم مەزەندەکردنەش زۆر لە مانای ئایەتەکەوە نزیکە، هەروەك لە دەقی ئایەتەکەدا دیارە، بەڵام بە پێی خەملاندنی یەکەم زیادبوونەکە پاڵدراوەتەوە سەر ڕاناوێکی نادیاری تر کە خەملاندنەکەی ئەوەیە (وازدادوا لبث تسع سنين). واتە: (مانەوەی نۆ ساڵ زیاتر) بە حیسابی ئەوانەی بە ساڵی کۆچی (مانگیی) حیساب دەکەن[٢٠].

ئەوەی بۆچوونەکەشمان پشتڕاست دەکاتەوە ئەوەیە کە تەمەنی ناوەوەی لەشیان (بایۆلۆجی)، تەنها نۆ کاتژمێر زیادی کردووە لە ماوەی ٣٠٠ ساڵەکە لە تەمەنی زەمەنی دەرەکی، نەك نۆ ساڵ، ئەم ئایەتەیە: (وَوَاعَدْنَا مُوسَى ثَلاَثِينَ لَيْلَةً

[٢٠]- مصطفى مسلم، مباحث في التفسير الموضوعي، ص٢٠٧.

وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً) (الأعراف: ١٤٢). واتە: (لەگەڵ موسادا ژوانی سی شەوەمان دانا، دەی دیکەشمان بۆ خستە سەر، بەم چەشنە ماوەی ژوانی پەروەردگاری بوو بە چل شەو). سوودو گرنگی (فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً) جەختکردنەوەو ڕوونکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو دە زیادکراوە، دە ڕۆژە نەك کاژێر ..! چونکە ئەگەر خودای گەورە ئایەتەکەی تەواو نەکردایەو تەنها بیوتایە: (وَوَاعَدْنَا مُوسَى ثَلاَثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ) ئەوا ئەگەری هەبوو مەبەست لە دە زیادکراوەکە، دە کاژێر بێت، بەڵام کە خودای گەورە فەرمووی: (أَرْبَعِينَ لَيْلَةً): چل شەو. ڕوون بوویەوە کە دە ڕۆژە، نەك دە کاژێر، بەڵام ئەم ڕوونکردنەوە لە چیرۆکی (یارانی ئەشکەوت) نەکراوە، (وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِئَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعاً) (الكهف: ٢٥). واتە: ٣٠٠ساڵان لە ئەشکەوتەکەیاندا مانەوەو نۆشیان تێپەڕاند. خودای گەورەش زاناترە!

٣ـ مانەوەی لەشیان بە ساغ و سەلامەتی و پاراستنی لە ناوەوە و دەرەوە، لەوانەش:

أـ ئەم دیواودیوپێکردنیان بە بەردەوامی لەکاتی نووستنەکەیاندا، وەك خودای گەورە فەرمویەتی: (وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظاً وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ) (الكهف: ١٨). واتە: (واتدەخەملاند بێدار بن، کە چی نووستبوون، بە ڕاستە و چەپەدا هەڵگێڕ و وەرگێڕمان پێدەکردن). ئەمەش بۆ ئەوەی زەوی، بەهۆی برینداربوونی پێستیانەوە تووشی کوانی جێگەو هەروەها تووشی بەرگیرانی خوێن لە بۆرییەکانی خوێن و سیەکاندا و هەوکردنی قاشێکی سی، نەبێت.

(Bed sores, Deep Venous Thromboses, Pulmonary Embolism and Hypostatic Pneumonia)

ئەمەش تازەکی، ڕاهێنانەوەی پزیشکیی، گرنگی پێدەداتو داوا دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشانەی کە بێهۆشن بەکاربهێنرێت، یان ئەوانەی ناتوانن بجولێن بەهۆی شەپلەوە، وەك بەشێکی گرنگ لەچارەسەر، ئەم دیواودیویان پێ بکرێت.

ب ـ لەشی گەنجەکانو حەوشەی ئەشکەوتەکە بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو لە هەر چوار وەرزەکەدا، بەر تیشکی هەتاو دەکەوتن، تا لەشیان پارێزراو بێتو شێ لێی نەداتو لە تاریکیدا بۆگەن نەکات. خودای گەورە فەرموویەتی: (وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ) (الكهف: ١٧). واتە: (کە خۆر هەڵدەهات، دەتبینی لە لای ڕاستی ئەشکەوتەکەیانی داوە، کە ئاواش دەبوو، لەلای چەپەوە لای دەدان لێی).

لەرووی پزیشکیشەوە، بۆ پاككردنەوە بە تیشکی سەروی وەنەوشەیی (Ultra Violet Rays) خۆر زۆر پێویستە، هەروەها بۆ بەهێزکردنی ئێسکی مرۆڤ و پێکهاتەکانی، ئەوەش بە دروستکردنی ڤیتامین د (Vitamin D) لەرێگەی پێستەوە. ئەمەش یەکێکە لە نیشانە گەردوونییەکانی خودای گەورە.. وەك لەباسکردنی ئەم دۆخەدا فەرمویەتی: (ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ) (الكهف: ١٧). واتە: (ئەوەش لە نیشانەکانی خودایە).. قورتوبی لە ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (وتراوە: کاتێك خۆر ئاوا دەبێت بەشێکی کەم لە تیشکی خۆرەکە بەریان دەکەوێت تا لەشیان سوودمەند بێت، نیشانەی خودای گەورەش لەوەدایە، کە لە ئەشکەوتێکدا داڵدەی دان، کە ئەمە تایبەتمەندی بێت، نەك لە ئەشکەوتێکدا کە زۆربەی ڕۆژ، خۆری تێبکەوێت. بەوەش زیانیان پێبگات. مەبەستەکەش ئەوەیە لە گۆڕانکاری لەش و ڕەنگ و گەرما و سەرما بیانپارێزێت)[٢١]. (سەیری وێنەی ژمارە ٦ بکە).

---

[٢١] القرطبـي، الجامع لأحكام القرآن، ٣٦٩/١٠.



**وێنەی ژمارە (٦): ئەشکەوتەکە لە ناوەوە، کە هۆڵە سەرەکییەکەی و هاتنە ناوەوەی تیشکی خۆر دەردەخات.**

جا دکتۆر و ئەندازیار و توێژەر (یحیی وزیري) پەیوەندی "دیزاینی ئەشکەوتەکە و پێگە جوگرافییەکەی" بە "ڕێڕەوی خۆرەکە بەدرێژایی ساڵ" ڕووندەکاتەوە. لە توێژینەوەکەیدا بەناوی: (تۆژینەوەیەکی مەیدانی و هەتاوی بۆ ئەشکەوتی لاوان، لە ئەردەن) دەڵێت:

(ئەو ئەشکەوتی ڕەقیمەی دەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی عەممان لە ئوردنو بە نزیکەیی لەسەر هێڵی پانی ٣٢ پلەی باکوورەو یەك دەروازەی هەیە کە ڕووی لە باشووری خۆرئاوایە، بە ئاڕاستەیەك کە چل پلە بۆ لای خۆرئاوای

باشوور لار دەبێتەوە، چونکە بەدرێژایی ساڵ خۆر لەلای ڕاستی ئەشکەوتەکەوە هەڵدێت، نەك لەلای دەرگاکەی، جا هەر لەسەرەتای خۆرئاوابوونەوە (واتا لە کاژێر ١٢ی نیوەڕۆ) تیشکی خۆرەکە لەسەر شێوازی پەڵەی تیشکاوی و پانتایی بچووك دەچێتە ناو ئەشکەوتەکەوە تا ئاوابوونی لە وەرزی زستاندا، هەروەها تا پێش ئاوابوونی لە هەردوو وەرزی بەهار و پاییزدا.

سەبارەت بە وەرزی هاوین ئەوا لە کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ خۆرەکە دەگاتە بەر ئاستانەی ئەشکەوتەکە، پانتاییەکەیشی وردە وردە گەورە دەبێتو لەکاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ دەگاتە لووتکە، بەڵام هەر بەر دەروازەکە زیاتر تێپەر ناکات، چونکە ئەستوونییەو پێویست بەوەش ناکات، چونکە پلەی گەرمی لەو وەرزەدا بەرزە، لەکاتێکدا لە وەرزی زستانو لە هەردوو وەرزی پاییز و بەهاردا خۆرەکە دەگاتە هۆڵە سەرەکییەکە)[٢٢].

ج ـ هەبوونی کلاوڕۆژنەیەك لە بنمیچی ئەشکەوتەکە لەلای باکوورەوە کە لەرێگەی کونە هەواییەکی ئەستوونەوە "حەوشەی ئەشکەوتەکە" بە "دەرەوە" دەبەستێتەوە (دوو جار سەردانی شوێنەکەم کردوەو بە چاوی خۆم بینیومە) ئەوەش کەشێکی نموونەیی لە با گۆڕکێ بۆ ئەشکەوتەکە دروست دەکات.

جا هەواگۆڕکێیەکەی بە بەردەوامیو هاتنەژورەوەی ڕووناکی لە رێگای ئەو کلاوڕۆژنەیەوە لەگەڵ هەبوونی حەوشەی ئەشکەوتەکە کەوا قورئان باسی کردووە: (وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِّنْهُ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيّاً مُّرْشِداً) (الكهف: ١٧). واتە: (ئەوان لە گۆڕاییو حەوشەکەیدا بوون، ئەوەش لە نیشانەکانی خودان، هەرکەسیش خودا بیخاتە سەر ڕێ، ئەوا شارازەیەو کێش گومڕا بکا، هەرگیزی دۆستێکی ڕێبەری بۆ نادۆزیتەوە).

---

[٢٢] يحيى وزيري، دراسة ميدانية وشمسية لكهف الفتية في الأردن - موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة- پێگەیەکی ئینتەرنێتە: www.55a.net

ئەمە وای کردووە، ئەم شوێنە گونجاو بێت بۆ گوزەرانیان، چونکە ئەشکەوتەکە لەناوەوە پێکهاتووە لە: هۆڵێکی سەرەکی بەبەرزایی ٣،٣٥ مەتر، دوو ژووریش دەکرێتەوە بە ڕووی هۆڵە سەرەکییەکەیدا لەلای خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەشکەوتەکەوە، هەروەها لەلای باکووریشەوە دەرگای ژوورێکی دیکە ڕووی تێکردووە کە لە دوو ژوورەکەی دیکە گەورەتر و بەرزترە، هەروەها بنمیچی ئەم ژوورە کەناڵێکی هەواگۆڕکێی تێدایەو دەگاتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە کە هەوای ئەشکەوتەکە دەگۆڕیێو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش هۆکارێکە بۆ هاتنە ژورەوەی ڕووناکی خۆرەکە. (سەیری وێنەی (٧) بکە).



**وێنەی ژمارە (٧): (بنمیچی ئەشکەوتەکە لە دەرەوە) کەوا کۆڵەکەکانی مزگەوتەکە نیشان دەدات کە لەسەری بنیات نراوەو هەروەها کونی کلاوڕۆژنەی هەواگۆڕکێیەکە.**

دـ تایبەتمەندییە جیولۆجییە گونجاوەکانی خاك و زەمینەی ئەشکەوتەکە:
ئەندازیاری جیولۆجی (نازم گەیلانی)، لە میانەی پشکنینە تاقیگەییەکانی، دووپاتی دەکاتەوە کە خاکی ئەشکەوتەکەو خاك و خۆڵی ناوچەی (رەقیم) یارمەتیدەرن بۆ پاراستنی لەشی مرۆڤ، چونکە ئەم خاك و خۆڵە لە هایدرۆکاربۆن و کالسیۆم و مەگنیسیۆم پێکهاتووە، هەروەها بوونی بەبەردبووی ڕووەکی و ئاژەڵی، کە پڕن لە ڕادیۆم، ئەم پێکهاتانەش لە کانزای یۆرانیۆم و سۆریۆمی تیشکداردا هەیە، کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بەرهەمهێنانی تیشکی (ئەلفا و بێتا و گاما). ئەم جۆرە تیشکانەش، لە خاوێنکردنی گۆشت و ڕووەکەکان و پاراستنی لە ڕزین، کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە، هەروەها نازم گەیلانی، پێیوایە هەبوونی ئەم جۆرە خاکە، ڕەنگە (وێڕای ئەوەی کە ناوبەناو تیشکی خۆر لێی دەدات، وەك پێشتر باسمان کرد) یەکێك بێت لەو هۆکارانەی بە درێژایی ماوەی نووستنەکە، پارێزگاری لە جەستەی لاوەکان کردووە، بێئەوەی هۆکارەکانی هەوا و خاك، کاریان تێبکات[٢٣].

هـ - پارێزگاریی دەرەکی: ئەویش بە ترسناك پیشاندانیان لە بارێکی زۆر نامۆو ناباودا.. نە مردوو بوون، نە زیندوو.. نە نووستنێکی ئاساییش، نووستبوون (لەودەمەدا بینەر وەك بەخەبەر دەیبینین، کە ئەمدیواودیویان دەکردو بەخەبەر نەدەهاتنەوە، وەك لەمەولا دێت) بەچەشنێك هەر کەس ئەوانی بەرچاو بکەوتایە، لەتاو ئەو دیمەنە نامۆیە هەڵدەهاتنو هەبوونی سەگەکەش لەبەر دەرکی ئەشکەوتەکەدا، لە پاراستنیان (هەردەڵێی پاسەوانی دەکردن) ڕۆڵی هەبووە. خودای باڵادەستیش دەفەرموێت: (وَكَلْبُهُم بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَاراً وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْباً) (الكهف: ١٨). واتە: (سەگەکەشیان لەبەردەرکەکەدا هەردوو باڵی ڕاکشاندبوو، ئەگەر بتدیبان، بە

---

[٢٣] حيدر المؤمن، كهف الرقيم في عمّان- گۆڤاری: منار الإسلام، ص٣٨- ٤٣.

ڕاکردن بەرەو پاش دەگەڕایتەوەو سەرتاپات ترس دایدەگرت). سەرباری پەکخستنی هەستی بیستنیان ـ وەك پێشتر باسمان کرد ـ وەك پارێزگارییەك بووە لە دەنگە دەرەکییەکان.

و ـ پاراستنی چاویان لەلایەن خودای تواناداروەوە: خودای گەورە دەفەرموێت: (وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظاً وَهُمْ رُقُودٌ) (الكهف: ١٨). واتە: (وات دەخەملاند بێدار بن، کەچی نووستبوون). ئەم ئایەتەش ئاماژەگەلێکی زانستی وردی تێدا بەدی دەکرێت، چونکە لەڕووی پزیشکییەوە سەلمێنراوە کە:

* ئەگەر هاتوو چاو بە بەردەوامی کراوە بوو بە هۆی نەخۆشی جۆراوجۆر، ئەوا بێگومان تووشی کاریگەری دەرەکی دەبێتو میکرۆب و تەنی نامۆ دەچێتە ناوی، ئەمەش دەبێت بەهۆی کوانی پەرگلێنەی چاو و پەڵەی پەرگلێنە (Corneal Opacity) سەرئەنجام کوێربوون. هاوشێوەی باری سستبوونی ماسولکەکانی پێڵوی چاو، کە لە زیانگەیشتن بە دەماری حەوتەمی ڕووخسارەوە (Facial Palsy) ڕوو دەدات، یاخود مایەی سەرهەڵدانی کۆنیشانەکانی شوگران (Sjøgren's Syndrome) کە نەخۆش بەهۆی کەمی بەرهەمهێنانی فرمێسك و وشکبوونەوەی گلێنەی چاو دەناڵێنێت، ئەمەش دەبێت بەهۆی کوانی پەرگلێنەو سەرئەنجام کوێربوون.

* هەروەها ئەگەر بە بەردەوامی چاو داخراو بوو، ئەوا دەبێت بەهۆی پووکانەوەی دەماری بینایی، چونکە بەر ڕووناکی ناکەوێت، ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی کە بە ئەرکەکانی هەڵنەسێت.. ئەمە لەکاتێکدایە بەپێی کارئەندامزانی (فسیۆلۆجی) سەلمێنراوە هەموو ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ تووشی پووکانەوەو مردن دەبێت، گەرهاتوو ئەو هۆکارانەی بۆ فەراهەم نەبوو کە بتوانێت لە ڕێگایانەوە بە ئەرکە سروشتییەکانی خۆی هەڵبستێت (Disuse Atrophy). بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەو زیندانییانەن کە

ماوەیەکی دوورودرێژ لە شوێنە تاریکەکاندا زیندانیی دەکرێن، لەبەر نەبوونی ڕووناکی، با پێڵووەکانیشیان کراوە بێت، تووشی کوێربوون دەبن.

* سەبارەت بە باری بێدارییش، ئەوا پێڵوی چاوی مرۆڤ، ناوبەناو خۆنەویستانە دەتروکێت، بەمەش فرمێسك ڕژێنەکان یارمەتی دەدەن کەوا ئاوێکی فرمێسکاوی خاوێن بڕژێنێت، ئەم ئاوەش چاو دەشۆرێت و لەکاریگەرییە دەرەکییە خراپەکان دەیپارێزێت، جا ئەم پرۆسە ئالۆزە سەلامەتی چاو مسۆگەر دەکات. خودای گەورەش وەك چۆن لەش و پێستیانی پاراست لەرێگەی هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنیانەوە بە بەردەوامی، لەگەڵ بەرکەوتنێکی گونجاو بۆ تیشکی خۆر (وەك پێشتر باسکرا)، هەر بەو شێوە زانستییەش چاویانی لە کوێری پاراست، خودای گەورە فەرموویەتی: (وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظاً وَهُمْ رُقُودٌ) (الكهف: ١٨). واتە: (پێت وابوو بێدارن، کەچی نووستبوون).. بەڵام نەیفەرمووە: (وتحسبهم أمواتاً وهم رقود). واتە: (پێت وابوو مردوون، کەچی نووستبوون).. چونکە یەکێك لە نیشانەکانی بێداریی ئەوەیە پێڵۆی چاو بجولێتەوە، ڕەنگە ئەمەش نهێنی ئەو دیمەنە سامناك و ترسێنەرە بێت کە هەیانبوو، خودای گەورە دەفەرموێت: (لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَاراً وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْباً) (الكهف: ١٨). واتە: (ئەگەر بتدیبان، بە ڕاکردن بەرەو پاش دەگەڕایتەوەو سەرتاپات ترس دایدەگرت).

جا ئەم دۆخە نائاسایی و نامۆیە، کەوا نە مردوون و نە بێدارن‌و نە بەشێوەیەکی سروشتی خەوتوون (چونکە خەوتوو چاو ناتروکێنێت)، ڕەنگە ئەم شێوەیە بێت – خوداش باشتر دەزانێت – کە وای لە هەرکەسێك کردبێت بچێتە نێو ئەشکەوتەکەوەو چاوی پێیان بکەوێت دڵی پڕ بووبێت لە ترس‌و هەڵهاتبێت، نەك لەبەر درێژی قژ و نینۆکیان‌و گۆڕانی شێوەیان. هەروەك قورتوبی لە ڕاڤەکەیدا دەڵێت: (کاتێك لەخەو هەڵسان هەندێکیان وتیان: (لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ) (الكهف: ١٩)، (ئەمە ڕۆژێك، یان هەندێك لە ڕۆژەکە لێرەین). ئەمەش

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قژ و نینۆکیان گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبوو .. ڕاستییەکەشی ئەوەیە کە خودای گەورە چۆن نووستبوون ئاوەها پارێزگاری لێکردن، تا ببن بە بەڵگەو نیشانەیەك بۆ خۆیانو خەڵکانی دیکەیش، نە جلیان ڕزیبوو و نە سیفەتێکیان گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو .. خودای گەورە لەسەر شێوەی خۆیان و بەجلوبەرگەکەیانەوە بێداری کردنەوە)[٢٤].

* سەبارەت بەوەی کە پێڵوی چاویان دەترووکا و دەجووڵایەوە (واتە وەك پێشتر باسمان کرد نە بە بەردەوامی کراوە بووە، نە داخراو بووە) مەبەست ئەوەیە بە ڕۆژ چاویان بەر تیشکی خۆر دەکەوتو هەندێك لە ئەرکەکانی ئەنجام دەدا، چونکە سەلمێنراوە کە جوڵە خۆنەویستەکانی چاو و پێڵو سوودی هەیە بۆ پاراستنی هەستی بیستن لە کەڕبوون بەهۆی ئەنجامنەدانی ناوەندەکانی بیستن و دەمارەکانی بە ئەرکەکانیان، (چونکە ڕێڕەوە دەمارییەکانی بیستن، ڕەنگە بپووکێنەوە و بفەوتێن ئەگەر هاتوو ئەرکەکانی بەجێنەهێنا، ئەم پووکانەوەش ڕاستەوانە لەگەڵ ماوەی کەڕبوون و پێچەوانە لەگەڵ پشتبەستن بە هەستی بینیندا دێتەوە، وەك ئامرازێکی قەرەبووکردنەوە .. واتە بێگومان هاندەرێك هەیە بۆ ئەم ڕێڕەوانەی کە تایبەتن بە بیستن لەڕێگەی ئاماژەکانی بینایی، هەرچەندە لەرووی توێکارییەوە، ڕێڕەوە دەمارییەکانی هەردوو هەستەکە لەیەکەوە دوورن)[٢٥].

٤ـ سەگ وەك ئاژەڵێك بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە: هەرچی بەسەر (یارانی ئەشکەوت)دا هات بەسەر سەگەکەشیاندا هات، ئەمەش ئاماژەیەکە بەوەی ئەگەر

---

[٢٤] القرطبـي، الجامع لأحكام القرآن، ١٠/ ٣٧٣- ٣٧٤.

[٢٥] اسلام محمد الشبراوي، إشراقات علمية لآيات قرآنيه في الأنف والأذن والحنجره- موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة- پێگەیەکی ئینتەرنێت، مێژووی بڵاوکردنەوە: ٢١-١٢-٢٠٠٥: www.55a.net.

هاتوو له ئاینده‌دا توێژینه‌وه‌ی زانستی ئه‌نجام درا، ده‌شگونجێت سه‌گ تاقیکردنه‌وه‌ی زانستی له‌سه‌ر ئه‌نجام بدرێت، بۆ نموونه وه‌ك تاقیکردنه‌وه له‌سه‌ر کۆئه‌ندامی ورووژانی تۆڕیی له مێشکدا، که به‌رپرسه له‌سه‌ر ورووژاندنی ئه‌رکه کاریگه‌ره‌کان، وه‌ك هۆشیاری و بێداری، له ڕێگه‌ی کپکردنی کاره‌که‌ی به به‌کارهێنانی ته‌کنیکی کاره‌بایی نویٚ ده‌بێت، وه‌ك کاریگه‌ری خستنه‌سه‌ر ده‌ماری که‌للەیی هه‌شته‌م به‌تایبه‌ت لقی هاوسه‌نگی.

جێی باسه باسکردنی سه‌گی یارانی ئه‌شکه‌وت له‌هیچ سه‌رچاوه‌یه‌کدا له‌پێش ئیسلامدا باس نه‌کراوه. ته‌نها قورئانی پیرۆز نه‌بێت باسی کردووه، وه‌ك زانیارییه‌کی ئه‌سڵی، پێده‌چێت له‌به‌ر ئه‌و هۆکاره بێت که باسمان لێوه کرد، هه‌رچه‌نده باسکردن‌و باسنه‌کردنی ئه‌وه کاریگه‌ری له‌سه‌ر شێوازی چیرۆکه‌که‌و ڕوداوه‌کانی نییه.

پوخته‌ی باس له‌باره‌ی چیرۆکی (یارانی ئه‌شکه‌وت): ئێمه پێمانوایه شێوازی نووستنه‌که‌یان یاسا و ڕێسا زانستی‌و پزیشکییه‌کانی گرتۆته‌به‌ر.. ئه‌وه‌ش به توانا و به‌ڕێوه‌بردنی خودای گه‌وره، وه‌ك له قورئاندا ئاماژه‌ی پێکراوه، چ به‌شێوه‌یه‌کی ڕاسته‌وخۆ یان ناڕاسته‌وخۆ، کورته‌که‌شی بریتییه له:

١ـ خودای گه‌وره هه‌موو هۆکاره سروشتی و پزیشکییه‌کانی بۆ پاراستنیان فه‌راهه‌م کردووه.

٢ـ په‌کخستنی هه‌سته‌کانیان، تا به هۆکاری ده‌ره‌کی و ناوه‌کی کاریگه‌ر نه‌بن. ئه‌وه‌ش به په‌رده‌دان به‌سه‌ر گوێیاندا (ده‌ماری که‌للەیی هه‌شته‌م) که بووه به‌هۆی ئه‌وه‌ی به‌قووڵی بخه‌ون، بۆ ماوه‌یه‌کی کاتی (کۆئه‌ندامی گورچکردنی تۆڕیی له قه‌دی مێشکدا) په‌ك بخرێت، که به‌رپرسه له باری بێداری و هۆشیاری..

٣ـ دابه‌زاندنی ئاستی کارکردنی ئه‌ندام و پرۆسه‌ی میتابۆلیزم (بایلۆجی) بۆ که‌مترین ئاست له به‌کارهێنانی وزه، به سوودوه‌رگرتن له‌و یه‌ده‌گه‌ی که له لایان هه‌یه (خۆراکی ناوه‌کی). به‌وه‌ش پێویستیان به خۆراکی ده‌ره‌کی نه‌بووه، تا

کۆئەندامی هەرس و میز چالاك ببنەوە، بەڵام کاتێك بێدار بوونەوە هەستیان بە برسێتییەکی زۆر کرد.

٤ـ رێگەدان بە تیشکی خۆر کە بەشێوەیەکی هاوسەنگ بچێتە نێو ئەشکەوتەکەیانەوەو لە هەرچوار وەرزەکەدا، لەشیان و ئەشکەوتەکەیان بپارێزێت.

٥ـ ئەمدیو و ئەودیو پێکردنیان بە مەبەستی پاراستنی لەشیان لە ڕزین و کوانی جێگە.

٦ـ رێگەدان بە جوڵاندنی پێڵوی چاویان بە مەبەستی پاراستنیان لە کوێری.

٧ـ بوونی دەرچەیەك لە سەروی ئەشکەوتەکەوە بۆ هەواگۆڕکێ بەشێوەیەکی بەردەوام، هەروەها بۆ ڕووناکیش.

٨ـ هەروەها خودای گەورە پاراستنی لەوەی کەسێك بچێتە سەریان و شتێکیان لێبکات.

٩ـ خودای گەورە چەند جارێك باسی سەگەکەی کردووە وەك ئاماژەیەك بەوەی کە دەتوانرێت سوودی لێوەربگیرێت بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەری.. ئەوەش بە بەکارهێنانی تەکنیکی نوێ لەم سەردەمەدا، پێش ئەوەی لەسەر مرۆڤ، تاقیبکرێتەوە.

١٠ـ هەروەها نهێنی و شاراوەی دیکەیش هەیە کە تەنها خودای گەورە دەیزانێـتو ڕەنگە لە ئایندەدا زانست بیدۆزێتەوە!! ئەوەش لەمیانەی ئاماژەگەلێکی قورئانی بۆ ئێمەی پزیشکان و زانایانی موسڵمان لە سەردەمی پێشکەوتنی زانستو تەکنۆلۆژیا بۆ گەیشتن بە شێوازێکی هاوشێوە یان نزیك لە بارودۆخەکەی ئەوان بۆ ڕاکشانی درێژخایەن، یان کورتخایەن، بێئەوەی پێویست بکات دەرمانی بێهۆشکەر بەکاربهێنین!! خودای گەورەش بە مەبەستی خۆی زاناترە.

# ئەنجام و ڕاسپاردەكان

وێڕای ئەوەی قورئان كتێبێكی ڕێنیشاندەر و ئیمانبەخشەو ڕێبازێكە بۆ مرۆڤ لە ژیانیدا بە مەبەستی دروستكردنی تاكێكی باش و كۆمەڵگەیەكی ئاست بەرز .. گەنجینەی زانستەكانیشەو كلیلەكەیانەو هانی زانستو زانین دەداتو ستایشی زانایان دەكات و ڕێگەیان پێ نیشان دەدات، هەریەك بەپێی پسپۆری خۆی، توێژینەوەی نوێ ئەنجام بدەن.. ئەمە ئەگەر هاتوو تۆژینەوەكان بە باشی ئەنجامدران، بەپێی ڕێزمانی عەرەبیو زانستەكانی تەفسیر، هەروەها بە گرتنی جڵەوی زانستە ئەزموونییەكانو ئەو تەكنیك و ڕاستییانەی كە پێی گەیشتووە.

موسڵمانیش لە هەموو كەس شایستەترە لە گەیشتن بە نهێنییەكانی قورئانو بەكارهێنانی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی و بەختەوەركردنی، نەك بۆ زیان پێگەیاندنی و دڵتەنگكردنی.. وەك چۆن ژیاری ماددیی خۆرئاوا وەهای كردو ئێستاش بەردەوامە لەسەر ئەو ڕێبازەو ڕەنگدانەوەی نەرێنی هەبووە لەسەر تاك و كۆمەڵگە و ئێستەش هەر هەیەتی.

هەر لەبەرئەوە، یەكێك لە گرنگترین هۆكارەكانی بەرگرییكردن لە قورئان (لە سەردەمی زانست و زانیاریدا) بریتییە لە دەرخستنی لایەنی زانستیو جێبەجێكردنی كردارییانە. بەمەش لە بەرگرییكردنی بیردۆزی و تیۆرییەوە، دەچینەسەر بەرگرییكردنی كرداری كە مەبەست لێی دەرخستنی لایەنە كردارییەكانی قورئانە بۆ ئەوانەی سەرپێچی دەكەنو بەهۆی نەزانینەوە، یان ڕقەوە هێرش دەكەنە سەری بۆ تێكدانی وێنەی قورئان و ئامانجە خودایی و مرۆییە ئاست بەرزەكانی.

بۆ ئەوەی بگەین بەو مەبەستە .. گرنگترین ئەو ئامانج و هۆکارە داواکراوانە دەخەینەڕوو، کە بۆ بەدیهێنانی پێویستەو پێویستی بە هاریکاریکردنێکی گشتی هەیە لەسەر ئاستی ڕەسمی و میللی .. گرنگترینیان:

## ئامانجەکان:

١ـ خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز و زانستەکانی لە بوارەکانی ژیان بە گشتی و لە بواری زانستەکانی پزیشك و بوونەوەر بەتایبەتی.

٢ـ دەکرێت سوود لەو زانستانە وەربگرین کە لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) هەیەو بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی بەکاری بهێنین.

٣ـ بانگەوازکردن بۆ ڕێبازی خودای گەورەو کتێبە پیرۆزەکەی لە ڕێگەی زانست و ئامۆژگارییەوە و بەشێوەیەکی ژیرانە.

## هۆکارەکان:

١ـ فێربوونی زمانی عەرەبی بە باشی، چونکە زمانی قورئانەو زمانی زانستە (زمانی گەردوونی)، هەروەها فێرکردنی بۆ موسڵمانی عەرەب و ناعەرەب، بە هۆکارە گونجاوەکانی سەردەم. خودای گەورە فەرمویەتی: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (يوسف: ٢). واتە: (بەڕاستی، قورئانمان بە عەرەبی دابەزاندوو، بەشکو تێبگەن).

٢ـ ئاگاداربوون و شارەزابوون لە زانستە جیهانی و کردارییەکان بە هەموو بەشە زانستییەکانی و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی هەموو تەکنیك و کەرەستە زانیارییە نوێیەکان.

٣ـ سوودوەرگرتن لەو توانایەی کە لەبەردەستدا هەیە لە زانکۆ و پەیمانگا و دەزگا زانستییەکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە، بە مەبەستی بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی سەرەوە.

٤ـ دامەزراندنی ناوەندی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە بابەتەکانی ئیعجازی پزیشکی و زانستیی لە قورئان و سوننەتدا، کەوا لایەنە کرداری و جێبەجێکارییەکان دەگرێتەوە.

٥ـ خوێندنی بابەتی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە خوێندنگە و زانکۆکان (بەپێی بەشەکانی) و هاندانی خوێندنی باڵا (ماستەر و دوکتۆرا) بۆ تۆژینەوە لە بابەتەکاندا.

**والحمد لله رب العالمين..**

# گرنگترین ژێدەر و سەرچاوەکان


١ـ ابراهيم النعمة، قبسات من الحكمة النبوية في الدعوة إلى الله، ط٢، مطبعة الزهراء الحديثة، الموصل، ١٩٨٥م.

٢ـ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، الطبعة الأولى، دار الجيل، بيروت، ١٩٨٨م.

٣ـ أبي زكريا الفداء، معاني القرآن، تحقيق ومراجعة: محمد علي النجار، الدار المصرية للتأليف والترجمة، القاهرة.

٤ـ أنور الجندي، شبهات التغريب في غزو الفكر الإسلامي، المكتب الإسلامي، بيروت، ١٩٧٨م.

٥ـ بدر الدين الزركشي، البرهان في علوم القرآن، ٢/ ٢٥، ط٢، الحلبي، القاهرة.

٦ـ البوصيري، الدرر السنية، إتحاف الخيرة المهرة، ١/١٩٥، پێگەیەکی ئینتەرنێت.

٧ـ حامد أحمد حامد، رحلة الإيمان في جسم الإنسان، ط١، دار القلم، دمشق، ١٩٩١م.

٨ـ حيدر المؤمن، كهف الرقيم في عمان، مجلة منار الإسلام، العدد ٦، ص٣٨ـ٤٣، ١٩٩٩ م.

٩ـ طه العلواني، الجمع بين القراءتين، قراءة الوحي وقراءة الكون، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، باريس، ١٩٩٤م.

١٠ـ سعيد النورسي بديع الزمان، قبسات من كليات رسائل النور، المقام الثاني من الكلمة العشرين، ومن تفسيره باللغة العربية: إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز، تحقيق: إحسان قاسم الصالحي، شركة سوزلر للنشر، ط٤، القاهرة ٢٠٠٤م.

١١ـ السيوطي، الإتقان في علوم القرآن، ٢/ ١٢٩، مكتبة ومطبعة المشهد الحسيني في القاهرة، ١٩٦٧م.

١٢ـ سيد قطب، في ظلال القرآن، الطبعة الرابعة، الدار العربية للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٦٨م.

١٣ـ الفخر الرازي، التفسير الكبير، ط١، مؤسسة المطبوعات الإسلامية، القاهرة، بیّ سالّی بلاوكردنەوە.

١٤ـ القرطبـي، الجامع لأحكام القرآن، الطبعة الأولى، دار الكاتب العربي، القاهرة، ١٩٦٧م.

١٥ـ رفيق رجا الدجاني، إكتشاف كهف أهل الكهف، مديرية الآثار في المملكة الأردنية الهاشمية، عمّان، ١٩٦٣م.

١٦ـ عبد الله العمراني، النيام السبعة وأصحاب الكهف، مجلة العربي، العدد ٢١٦، ص٣٣ـ ٣٥، نوفمبر ١٩٧٦م.

١٧ـ عبد المجيد الزنداني وزملاؤه، تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، من أبحاث المؤتمر الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة النبوية، في إسلام آباد، باكستان، مطبعة رابطة العالم الإسلامي، مكة المكرمة، ١٩٨٧م.

١٨ـ عماد الدين خليل، مدخل الى موقف القرآن الكريم من العلم، ط٢، مطبعة الزهراء الحديثة، الموصل، ١٩٨٥م.

١٩ـ عماد الدين خليل، تهافت العلمانية، ط٢، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٩٧٥م.

٢٠ـ محمد تيسير ظبيان، أهل الكهف وظهور المعجزة القرآنية الكبرى، الطبعة الأولى، دار الإعتصام، القاهرة، ١٩٧٨م.

٢١ـ محمد تيسير ظبيان، هل هذا هو الكهف الذي تحدث عنه القرآن، مجلة الوعي الإسلامي، العدد ٤٧، السنة الرابعة، ص٥٢ـ ٥٧، ١٩٩٦م.

٢٢ـ محمد قطب، رؤية إسلامية لأحوال العالم المعاصر، ط١، مكتبة السنة، القاهرة، ١٩٩١م.

٢٣- محمد جميل الحبال ووميض العمري، الطب في القرآن، الطبعة الأولى، دار النفائس للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٧م.

٢٤- محمد جميل الحبال ومقداد الجواري، العلوم في القرآن، الطبعة الأولى، دار النفائس للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٩٢م.

٢٥- محمد جميل الحبال، العلوم المعاصرة في خدمة الداعية الإسلامي (مطابقة الحقائق العلمية للآيات القرآنية)، مكتبة دار المنهاج القويم، دمشق، ٢٠٠٦م.

٢٦- محمد سليمان الأشقر، زبدة التفسير من فتح القدير، وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية، الكويت، ١٤٠٥هـ.

٢٧- محمود العبادي، الآثار الإسلامية في فلسطين والأردن، الطبعة الأولى، المطبعة التعاونية، عمان، ١٩٧٣م.

٢٨- محمود شلبـي، حياة أصحاب الكهف، الطبعة الأولى، دار الجيل، بيروت، ١٩٨٥م.

٢٩- مصطفي مسلم، مباحث في التفسير الموضوعي، الطبعه الثانية، دار القلم، دمشق، ١٩٩٧م.








# هەندێك لە نهێنییەكانی قورئان و ڕەخنەی ناحەزانی ئیسلام

**د. كەریم ئەحمەد**

# پێشەکی

بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی نیعمەتی عەقڵی پێداین و پەیامی خۆی لە دوو توێی کتێبیکدا بۆ خەڵات کردین بۆ ئەوەی لێی وردبینەوەو کردەوەی پێبکەین و سەرفرازیی هەردوو دونیای پێ بەدەستبێنین، دروودی سەلامی پەروەردگاریش لەسەر ئەو پێغەمبەرەی هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی ئەم پەیامەی بەسەردا دابەزێنرێت و بیگەیەنێتە مرۆڤایەتی، ئێمەش شایەتی بۆ دەدەین کە وەکو خۆی بێ کەمترین دەسکاری و بەوپەڕی ئەمانەتەوە بەو ئەرکە هەڵساو ئەو پەیامەی گەیاند، درووديش لەسەر ئەو هاوەڵانەی کە خوا هەڵیبژاردن بۆ هاوەڵێتی دواپێغەمبەری و شەرەڤ نووسینەوەی ئەم قورئانە و بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی بەجیهاندا پێبەخشین، درووود لەسەر ئەو تابیعییانەش کە خوا شەرەڤ بینینی هاوەڵانی ئەو پێغەمبەرەو شەرەڤ نووسینەوەی سوننەتەکان و فەرمودەکانی پێغەمبەری پێبەخشین و بەوە ئەو چەند نەوەیە ڕاستێتی ئەو شایەتیدانەی پێغەمبەریان سەلماند کە باشترین نەوەی موسوڵمانانن.

ئیسلام ئایینێکە هەموو لایەنەکانی بەڵگەن لەسەر ئەوەی لەلایەن خواوەیە، بیروباوەڕەکەی، سیستمی پەرستشییەکەی، شەریعەتەکەی، سیستم و بەها ئەخلاقییەکەی، کەسایەتی پێغەمبەرەکەی، لە سەرووی هەمووشیانەوە کتێبەکەی، کە قورئانە، کە هەموو سورەتێکی، بەڵکو هەموو ئایەتێکی بەڵگەی لەلایەن خواوەبوونیەتی، جا ئەوەی ئێمە لێرەدا دەیکەین هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ بەرگریی کردن لەم قورئانە، هەرچەندە ئەو بەرگریی لێکردنی ناوێت، چونکە خۆی بەرگری لە خۆی دەکات، ئەمەش یەکێکە لە نهێنییەکانی، تەنها پێویستیمان بە ڕێکخستنی ئایەتەکان و ئاماژەپێکردنیان لە جێی خۆیاندا هەیە، بۆیە من لەم لێکۆڵینەوەیەدا پێویستیم بەوە نەبووە بگەڕێمەوە بۆ هیچ سەرچاوەیەکی دیکە

ژیری نەبێت کە ئامرازی تێگەیشتنە لە قورئان و هەڵهێنجانی ئەحکامەکان لێی و بەراوردکردنی زانیارییەکانە، ئەگەر گەڕابێتیشمەوە بۆ هەر سەرچاوەیەکی دیکە ئەوە تەنها بۆ وەکو خووپێوەگرتن بووەو هیچی دیکە.

باسەکەشمان کردۆتە چەند بەشێکەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەکەم: نهێنی و ئیعجازی قورئان:

یەکەم: قورئان کتێبێکی پڕ نهێنییە.

دووەم: قورئان بەڵگەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە (ئیعجازی قورئان):

سێیەم: سیفەتەکانی قورئان.

بەشی دووەم:

باسی یەکەم: کاریگەری نەرێنی (سلبی) ریوایەتەکان لەسەر قورئان.

باسی دووەم: وەڵامی هەندێك لەو ڕەخنانەی لە قورئان دەگیرێن:

یەکەم: قورئان بە مانا دابەزیوە بەسەر پێغەمبەردا، نەك بە لەفز.

دووەم: قورئان دژەیەکتری تێدایە.

سێیەم: قورئان هەڵەی ڕێزمانیی تێدایە.

چوارەم: سورەتی (تبت یدا ابی لهب) لاوازە.

پێنجەم: (نهج البلاغة) لە قورئان ڕەوانترە.

# بەشی یەکەم:
# نهێنییەکان و ئیعجازی قورئان:

**یەکەم: قورئان کتێبێکی پڕ نهێنییە:**

قورئان کتێبێکە زیاد لە ١٤٠٠ ساڵە بەسەر پیاوێکی نەخوێندەوار دابەزیوە، لە کۆمەڵگەیەکی نەخوێندەوار، لە ناوچەیەکی نیمچە دابڕاوی نیوەدورگەی عەرەب، لەو ڕۆژەشەوە تا ئەم ساتەوەختە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت و ڕاڤە و تەفسیری بۆ دەکرێت و بەردەوام ئەحکامی شەرعی و یاسایی و ئەخلاقی لێدەردەهێنرێت، کەچی هێشتا هەر زیندووەو نوێیەو بەخشینی بەردەوامەو تەواو نەبووە! ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێ ئەم کتێبە نهێنییەکی تێدابێت؟

چ کتێبێك تا ئێستا ئەوەندەی قورئان لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوەو ئەحکامی لێدەرهێنراوە؟ نەك لەیەك بواردا، بەڵکو لە هەموو بوارەکانی زانست و ژیاندا! بڕۆ بۆ کتێبخانەی ئیسلام بزانە لەو ڕۆژەوە قورئان دابەزیوە تا ئەمڕۆ چەند کتێب نووسراوە؟ ئەمانە هەمووی لە چاوگی قورئانەوە هەڵقوڵاون، ئایا دەکرێت ئاوها کتێبێك لە دانانی کەسێکی نەخوێندەواری ناو کۆمەڵگەیەکی نەخوێندەواری پێش چواردە سەدە بێت؟

کتێبێك دوای چواردە سەدە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی دەرکەوێت کە وردەکارییەکی وای تێدا ڕەچاوکراوە، نەك لە توانای مرۆڤێکی پێش چواردە سەدەدا نییە، بەڵکو لە توانای هەموو مرۆڤەکانی ئەم سەردەمەشەدا نییە.

کتێبێك، چواردە سەدەیە، لەوەتی نووسراوەتەوە، پیتێکی لە جێی خۆی لانەبراوەو نەگۆڕاوە، ئایا دەکرێت لە ماوەی چواردە سەدەدا کە موسوڵمانان بە هەموو دونیادا بڵاوبوونەتەوە کەس نەیتوانیبێت پیتێکی لێ بگۆڕێت، کەچی هەندێك کەس گومان لەسەر ئەو نەوەیە دروست بکەن بە گۆڕینی کە بەسەریاندا دابەزیوە؟! لە کاتێکدا کە ئەو نەوەیە هەم لە نەوەکانی دیکە باوەڕدارتر و هەم

پابەندتر بوون بە ئیسلامەوەو هەم لە چوارچێوەیەکی جوگرافی تەسکدا بوون و ئاگایان لەیەکتر بوو؟!

کتێبێك چواردە سەدەیە بەردەوام دەخوێنرێتەوە بێئەوەی ببێزرێت، یان تام و چێژەکەی کەمتر بێتەوە، ئایا دەکرێ بگوترێت ئەمە کتێبێکە وەکو هەموو کتێبەکانی دیکە؟

ئاخۆ دەبێ ئەم کتێبە چ گیانێك و چ نهێنییگەلێکی تێدا بێت وا هەرکاتێك دەیخوێنیتەوە وادەزانی قسە لەگەڵ تۆ دەکات و بۆ چارەسەرکرنی کێشەکانی تۆ هاتووە؟

ئەوە چ نهێنییەکە لەم کتێبەدا کە وای کردووە دوای تێپەڕبوونی چواردە سەدە لە هەموو کتێبێك زیندووتر و لە هەموو کتێبێك کاریگەرتر بێت؟!

ئەمانەی وتمان دەکرێ بکرێنە دەروازەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە نهێنییەکانی قورئان، نەك لە دوو توێی لێکۆڵینەوەیەکی چل لاپەڕەییدا کە بۆ ئەم کۆنگرەیە ئامادە کراوە، بەڵکو دەیان و سەدان لێکۆڵینەوەی نوێ لە لایەن پسپۆڕانەوە بۆ خزمەتکردن بەم کتێبە پیرۆزە.

قورئان کتێبێکە پڕ لە نهێنی، نەك بەو مانایەی کە جاران باتنییەکان دەیانوت قورئان ڕواڵەت و ناوەوەی هەیە، ڕواڵەتەکەی زانایانی شەریعە دەیزانن و ناوەوەشی تەنها ئیمام دەیزانێت، بەڵکو بەو مانایای پڕە لە زانست، لە هەموو بوارەکاندا، بەتایبەت ئەو بوارانەی پەیوەندییان بە ناوەڕۆکی پەیامەکەیەوە هەیە کە هیدایەتدانی خەڵکییە بۆ ڕێی ڕاست و سەرفرازی، وەکو زانستەکانی پەروەردەو ئەخلاق و کۆمەڵناسی و دەروونناسی و هتد...

قورئان وەکو دەریایەکی پڕ لە دوڕو مرواری وایە، مەلەوانی شارەزای دەوێت قوتی تێدا بخوات و ئەو مروارییانە دەربێنێت، مرۆڤیش تا شارەزایی لە زانستەکاندا، بە هەردوو بەشەکەیەوە، تەجریبی و مرۆیی، زیاتر بێت، باشتر دەتوانێت لێی تێبگات و نهێنییەکانی ئاشکرا بکات. قورئان جوانترین بنەماکانی

زانستی ئەخلاق و کۆمەڵناسی و پەروەردەی تێدایە، تەنها ئەوەندەی دەوێت شارەزایانی ئەم بوارانە بە دوایاندا بگەڕێن، هەروەکو چۆن زانایانی بوارە تەجریبییەکان توانیویانە زۆر نهێنی زانستیی لە قورئاندا بدۆزنەوە کە بەڵگەن لەسەر لەلایەن خواوەبوونی قورئان، بەهەمان شێوە زانایانی بوارە مرۆییەکان دەتوانن ئەو کارە بکەن و ئەنجامی زۆرباش لەوبارەیەوە بەدەست بێنن، ناڵێم هیچ لەو بارەیەوە نەکراوە، بەڵام لە ئاستی پێویستدا نییە، بۆ نموونە کتێبی (تربية الاولاد في الاسلام)ی دکتۆر عەبدوڵڵا ناصح عەلوان و (التفسير الاسلامي للتاريخ)ی دکتۆر عیمادەددین خەلیل و(السنن الالهية)ی دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان و کتێبەکانی دکتۆر عەلی عەبدولواحید وافی لە بواری زانستی کۆمەڵناسییدا و کتێبی (دستور الاخلاق في القران)ی دکتۆر موحەممەد عەبدوڵڵا دەڕڕاز، چەند هەوڵێکن لەو پێناوەدا.

یەکێك لە نهێنییەکانی قورئان ئەوەیە کە زوو لەبەر دەکرێت، تەنانەت بۆ ئەوانەشی کە نەك هەر عەرەبی نازانن، بەڵکو وشەیەکی عەرەبیشیان نەبیستووە! بەڵام لەلاوە سروشتێکی تریشی هەیە کە دەتوانین بڵێین کاریگەری ئەم سروشتەی ئێستا باسمان کرد کەم دەکاتەوە، یان هەر نایهێڵێت، ئەویش ئەوەیە زوو بیر دەچێتەوەو ئەوانەی لەبەری دەکەن ئەگەر زوو زوو دەوری نەکەنەوە لە بیریان دەچێتەوە، لێرەدا خودا سروشتێکی دیکەی لەم قورئانەدا داناوە بۆ ڕێگرتن لە لەبیرچوونەوە، ئەویش ئەوەیە کە بڕوادار بێزار و بێتاقەت نابێت لە دووبارەکردنەوە و چەندبارەکردنەوەو بەردەوام دەورکردنەوەی، ئەم سێ سروشتەش پێکەوە دەتوانین ناویان لێبنێین مەنزومە، واتە مەنزومەی زوو لەبەرکردن و زوو لەبیرچوونەوەو بێزارو بێتاقەت نەبوون لەدەورکردنەوەو بەردەوام خوێندنەوەی و دووبارەو چەندبارەکردنەوەی، ئەمەش یەکێکە لە نهێنییەکانی قورئان کە لە هیچ کتێبێکی دیکەدا نییە، هیچ کتێبێك نییە خەڵکی بتوانن بەو ئاسانییەی قورئان لەبەری بکەن، بەتایبەت ئەوانەی کە زمانی ئەو کتێبە نەزانن و

لێی تێنەگەن، تەنانەت ئەگەر ئەو کتێبە هەموو شیعری بە کێش و قافیەی جوانیش بێت، هەروەها هیچ کتێبیك، یان نووسینێك نییە مرۆڤ دوای ئەوەی لەبەریکرد وا زوو لە بیری بچێتەوە، هەروەها هیچ کتێب و نووسینێك نییە مرۆڤ بتوانێت، یان تاقەتی هەبێت ئەوەندە دووبارەی بکاتەوە و بیخوێنێتەوە، با شیعری جوان و چیرۆکی خۆشیش بێت، قورئان نەبێت کە ئەم سێ سروشتەی لەهەمانکاتدا تێدایە! ئایا ئەمە یەکێك نییە لە تەجەللیاتی ڕۆحانییەتی قورئان و یەکێك نییە لە نهێنییە گەورەکان و تایبەتمەندییەکانی؟!

یەکێکی دیکە لە نهێنییەکانی قورئان لە کاریگەرییەکەیدایە لەسەر خوێنەر و گوێگر، بەو مەرجەی ئەو کەسە باوەڕدار بێت و دڵی ساغ بێت، ئەگینا خەڵکانی مونافیق و دڵنەخۆش، زیاتر دڵیان بە بیستنی قورئان تاریك دەبێت، قورئان نهێنییەکانی خۆی بۆ ئەو کەسانە دەکاتەوە کە دڵەکانیان لە ئاستی دەکەنەوە، ئەگینا ئەوانەی لە ئەنقەست و بۆ نیازخراپی دڵیان لە ئاستی دادەخەن، زیاتر پێی پەست دەبن: (وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ * وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَى رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ) (التوبة: ١٢٤–١٢٥). (وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا) (الاسراء: ٨٢).

قورئان لە هەموو ڕوویەکەوە بێوێنەو تایبەتە:

قورئان تەنها لە ڕووی زمان و ڕواڵەتەوە بێوێنە نییە کە ئەو هەموو بایەخەی پێدراوە، بەڵکو لە هەموو ڕوویەکەوە بێوێنەیە:

لە ڕووی جەوهەر و ماهییەتەوە.

لە ڕووی سروشت و سیفەتەوە.

لە ڕووی ناوەڕۆك و پێکهاتەیەوە.

لە ڕووی پەیام و وەزیفەیەوە.

لە ڕووی ئوسلوب و مەنهەجەوە.

له ڕووی کاریگەرییەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە سروشتی مرۆڤەکان دەناسێت کە ڕواڵەت زۆر سەرنجیان ڕادەکێشێت و زۆر بایەخی پێدەدەن، بۆیە جوانترین بەرگی بەبەر ئەم قورئانەدا کردووە کە ڕەوانبێژییەکەیەتی و بە جوانترین شێوە دایڕشتووە، ئەگینا هیچ لایەنێکی دیکەی ئەم قورئانە لە لایەنی زمانەکەی و ڕەوانبێژییەکەی کەمتر نییە و هەرکەسێك ئەوە بڵێت قورئانی نەناسیوەو لە نرخی کەمکردۆتەوە، بۆیە پێویست دەکات ئەوەندەی لێکۆڵینەوە دەربارەی ڕەوانبێژی قورئان کراوە دەربارەی لایەنەکانی تریشی بکرێت، یان کاتێك باسی ئیعجازی قورئان دەکرێت، باسی ئەم هەموو لایەنانە پێکەوە بکرێن، نەك تەنها باسی ئیعجازی بەیانیی بکرێت، یان پشکی گەورە بەر ئیعجازە بەیانییەکەی بکەوێت.

**دووەم: قورئان بەڵگەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە (دروودی خوای لەسەر بێت) (ئیعجازی قورئان):**

خوای گەورە لە قورئاندا ڕایگەیاندووە کە قورئان بەڵگەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد پێغەمبەرە، ئەویش ئەوکاتەی کە بێباوەڕەکان داوایان دەکرد خودا نیشانەیەك بۆ پێغەمبەر موحەممەد بنێرێتە خوارەوە بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی (وَقَالُوا لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِنْ رَبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ) (العنكبوت: ٥٠).

واتە: دەبوایە نیشانەگەلێکی لە پەروەردگاریەوە بۆ بهاتایە بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی.

دیارە لێرەدا داوای نیشانەی بەرجەستەکراویان دەکرد لە جۆری ئەوەی بەسەر پێغەمبەرانی دیکەدا دابەزیوە، خودا لێرەدا بە پێغەمبەر دەفەرمووێت: پێیان بڵێ نیشانەکان لای خودایە و من تەنها ئاگادارکەرەوەیەکم و هیچم بەدەست نییە، دواتر خودا لە وەڵامی ئەو کەسانەی کە داوای بەڵگەی بەرجەستکراویان کردووە، دەفەرموێت: (أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ

لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) (العنكبوت: ٥١). واته: ئایا ئەوە بەس نییە بۆ ئەوان وەکو بەڵگە لە سەر پێغەمبەرایەتییەکەت کە ئەم کتێبەمانە بۆ ناردووەتە خوارەوە بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە (واتە قورئان)؟

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) لە فەرموودەیەکیدا کە بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێت: (مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَى اللَّهُ إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ).[1]

واتە: لێرەدا خودا و پێغەمبەریش قورئانیان بە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر داناوە، بەڵام چۆن بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتیی موحەممەد و لە چ ڕوویەکەوە؟

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا دەڵێین:

قورئان بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، بەوەی کە کەس ناتوانێت کتێبێکی وەکو ئەم قورئانە دابنێت، تەنانەت ئەگەر ئینس و جن کۆببنەوەو یارمەتی یەکتر بدەن ناتوانن ئاوها کتێبێك دابنێن: (قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا (الاسراء: ٨٨).

نەك ناتوانن کتێبێك وەکو هەموو قورئان دابنێن، بەڵکو تەنانەت ناتوانن وەکو سورەتێکیشی دابنێن، ئەوەتا خودا دەفەرموێت: (وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ* فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (البقرة: ٢٣–٢٤). واتە: ئەگەر گومانتان هەیە لەوەی ئەم قورئانە لەلایەن ئێمەوە

---

[1]. اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان. ج١، ص٣٠، الحديث رقم ٩٣، أخرجه البخاري تحت باب فضائل القرآن، باب نزول الوحي، ومسلم في باب وجوب الايمان برسالة نبينا محمد.

دابەزیوە بەسەر بەندەکەماندا – مەبەستی موحەممەد پێغەمبەرە – ئەوا ئێوە وەکو سورەتێك لەسورەتەکانی ئەم قورئانە دابنێن، هەرچی کەسیش هەیە بیهێنن، جگە لە خودا، گەر ئێوە ڕاست دەکەن، ئەگەر ئەو کارەتان پێنەکرا، کە پێشتان ناکرێت، ئەوا خۆتان لە سزای ئاگر بپارێزن.

(أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ* فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنْزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ وَأَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَهَلْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (هود: ١٣–١٤).

(وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَنْ يُفْتَرَى مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ* أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (يونس: ٣٧–٣٨).

ئایەتی یەکەم داوای دە سورەتیان لێدەکات و ئایەتی دووەم داوای سورەتێکیان لێدەکات و پێشیان دەڵێ: پشت بەهەرکەسێك دەبەستن جگە لە خودا، بیبەستن.

لە وەڵامی پرسیاری دووەمیشدا کە دەڵێت: قورئان لە چ ڕوویەکەوە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، یاچ لایەنێکێتی وای کردووە کەس نەتوانێت کتێبێکی لەو شێوەیە دابنێت، یان چ لایەنێکی قورئانە کە تەحەددای ئینس و جننی پێکراوە، بە واتایەکی دیکە ئیعجازی قورئان لە کوێیدایە؟ دەڵێین: لێرەدا جیاوازی هەیە لە بۆچوونی زانایاندا.

زۆربەی زانایانی کۆن دەڵێن: ئیعجازی قورئان لە ڕووی ڕەوانبێژییەوەیەتی و کەس ناتوانێت کتێبێکی لەو جورە بەو ڕەوانبێژییە دابنێت. هەندێکی کەمیش وەکو (الشريف المرتضى)ی شیعی و (النظام)ی موعتەزیلی و ئەبوئیسحاقی ئەسفراییینی سوننی دەڵێن: نەتوانینی خەڵك لەبەر ئەوە نییە کە کەس ناتوانێت کتێبێکی وەکو قورئان دابنێت لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، بەڵکو لەو ڕووەوەیە کە خودا ڕێگری لێکردوون، یان ئەو نیازەی لەدڵ دەرهێناون کە بەرەنگاری قورئان

بکەن، ئەگینا گەر خودا لێبگەڕایە خەڵکی ئەو کارە بکەن، دەکراو ئەو شتە لەتوانای مرۆڤدا هەیە، ئەمەش بە عەرەبی پێی دەوترێت (صورفە، یان صەرفە)[2]!.

ئەم بۆچوونەش لەگەڵ ئەوەی کە هەڵەیەکی زۆر زەق و ڕوونە و واقیع بەدرۆی دەخاتەوە، چونکە بە درێژایی مێژووی قورئان خەڵکانێك هەوڵیان داوە ئەو کارە بکەن، دوایی بۆیان دەرکەوتووە کە لەتوانایاندا نییە، چەندین دەلالەتی هەیە:

١. بێڕێزییەکی گەورەیە بەرامبەر بە قورئان و نکۆڵیکردنە لە گەورەیی و تایبەتمەندییەکانی قورئان و جیا نەکردنەوەیەتی لە قسەی مرۆڤ.

٢. بەڵگەی خوانەناسینە لەلایەن ئەو کەسانەوە و جیاوازی نەخستنە لە نێوان قسەی خوداو قسەی بەندەکانی، یان توانای خواو توانای بەندەکانی، ئەگینا ئەگەر خواناسی ڕاستەقینە بوونایە و باوەڕیان بەوە هەبوایە کە ئەو قورئانە لە دابەزاندنی خودایەکی زانای دانای بەدەسەڵاتی خاوەن ئەو هەموو سیفەتە بەرزانەیە، ئاوها قسەیەك بەدەمیاندا نەدەهات، بەڵکو وەکو ئەوانە دەبوون کە خودا دەربارەیان دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ) (آل عمران: ٧).

٣. بە درۆزانینی خودایە و نیسبەتدانی ستەم و ناڕەوایی و (عبث)ە بۆ لای خودا، چونکە خودا داوا دەکات و تەحەددا دەکات، ئەم تەحەدداکردنەش مانای

---

[2]. بڕوانە: مناهل العرفان في علوم القرآن ج٢ ص ٣٠١-٣٠٥ /محمد عبدالعظيم الزرقاني/ دار الفكر - بيروت/ الطبعة الأولى، ١٩٩٦، تحقيق: مكتب البحوث والدراسات. هەروەها: الإتقان في علوم القرآن/ ج٤ ص ٨ / عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي (المتوفى: ٩١١هـ) / تحقيق محمد أبو الفضل إبراهيم /الناشر: الهيئة المصرية العامة للكتاب/ الطبعة: ١٣٩٤هـ/ ١٩٧٤م.

نامێنێت ئەگەر خودا ئەو توانایەی لە بەندەكانی سەندبێتەوە و تەحەدداكراوەكان ئازاد نەبن، و وەكو ئەوە وایە تۆ كەسێك بێنی بۆ زۆرانبازی و تەحەددای پاڵەوانانی دونیای پێبكەیت و لەولاشەوە ڕێگەی كەس نەدەیت بێتە مەیدان بۆی، لەو كاتەدا شتەكە لە چەند ئەگەرێك بەدەر نییە: یان درۆ دەكەی ئەو كەسە پاڵەوان نییە بۆیە ڕێگری لە خەڵك دەكەیت بێنە مەیدان بۆی، یان ئەوەیە تۆ كەسێكی ستەمكار و ناعادلی و نرخ بۆ قسەی خۆت دانانێت و گاڵتە بە خەڵكی دەكەیت!

٤. ناشارەزایی و ڕۆنەچوونە لە قورئان و درك نەكردنە بەلایەنە گەورەكان و نهێنییەكانی قورئان لە ئەنجامی زۆر نەژیان لەگەڵیدا.

٥. خاڵی چوارەمیش كە پەیوەندییەكی زۆری هەیە بەخاڵی سێیەمەوە، یان ڕاستتر بڵێین خاڵی چوارەم پەیوەندی پێوەی هەیە، ئەوەیە كە پێدەچێت ئەو جۆرە كەسانە لە ناخیاندا باوەڕیان وابێت قورئان لە لایەن خواوە نییە، یان دەستكاری كراوە، ئەمەش زیاتر بەسەر شیعەدا دەسەپێت.

٦. دوا خاڵیش ئەوەیە كە وەكو باقلانی دەڵێت: ئەگەر شتەكە بەو شێوەیە بوایە كە ئەمان دەیڵێن، ئەوكاتە پێویستی نەدەكرد خودا بایەخێكی زۆر بە ڕەوانبێژی قورئان بدات، بەڵكو دەبوایە جیاوازی نەبوایە لەگەڵ قسەی خەڵكدا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خودا دەركەوتایە لەو ڕێگریكردنە لە هێنانەوەی كتێبێكی وەكو قورئان.[٣]

كەسێكی وەكو (د. عبدالكريم سروش) كاتێك ڕەخنە لەلایەنی ڕەوانبێژی قورئان دەگرێت، یان لاف ئەوە لێدەدات كە قورئان بە لەفز دانەبەزیوەتە سەر

---

[٣]. قال القاضي أبوبكر الباقلاني: "ومما يُبطل القول بالصرفة، أنه لو كانت المعارضة ممكنة، وإنما منع منها الصرفة، لم يكن الكلام معجزًا، وإنما يكون المنع معجزًا، فلا يتضمن الكلام فضلًا على غيره في نفسه". مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص٢٦٨.

پێغەمبەر، بەڵکو بەمانا دابەزیوەو پێغەمبەر خۆی دایڕشتووە، بەشێکی ئەو عەقیدەیە لە شیعەییەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە کە قورئان دەستکاری کراوە، یان کاتێك کەسێکی وەکو (احمد القبانچي) دێت و بەراورد لە نێوان قورئان و (نهج البلاغة)دا دەکات ئەگەر لەهەمان ئەو بیروباوەڕەوە سەرچاوەی نەگرتبێت لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ ئەو بیروباوەڕەی وا لە مرۆڤ دەکات زۆر بایەخ بە خوێندن و لێکۆڵینەوەی قورئان نەدات و قسەی کەسانی دیکەی وەکو ئیمامی عەلی بەلاوە لە قورئان پێ ڕەوانتر بێت[٤].

## گەڕانەوە بۆ ئیعجازی قورئان:

وتمان زانایانی کۆن ئیعجازی قورئانیان بە پلەی یەکەم و سەرەکی لە ڕووە ڕەوانبێژییەکەیەوە دەبینی[٥] بە حوکمی ئەوەی هەر پێغەمبەرێك هاتبێت موعجیزەکەی لەو بوارەدا بووە کە لەو سەردەمەدا خەڵکی شارەزاییان تێدا هەبووە، لەبەر ئەوەشی عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) ڕەوانبێژترین سەردەمە لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، بۆیە خودا لەولایەنەوە بۆیان هات بۆ ئەوەی ئیقامەی حوججەیان لەسەر بکات و دڵنیا بن لەوەی کە ئەم قورئانە دەبێت لە لایەن خوداوە هاتبێت، چونکە لە توانای کەسدا نییە ئاوها کتێبێك دابنێت.

دوای ئەو قەڵەمبازەی مرۆڤایەتی دای لە بوارەکانی زانست و مەعریفەو تەکنۆلۆژیادا و ئاشکرابوونی زۆرێك لە ڕاستییە زانستییەکان و دەرکەوتنی هەندێك لە نهێنییە زانستییەکانی ناو قورئان، زۆرێك لە زانایان هەندێك لایەنی دیکەیان بۆ

---

[٤]. بڕوانە سایتی د. سروش وتاری (توتی و زەنبور).

[٥]. ووجوه إعجاز القرآن كثيرة نفصلها في مبحثها إن شاء الله بيد أنا ننبهك هنا إلى أن بلاغته العليا وجه بارز من هذه الوجوه بل هي أبرز وجوهه وجودا وأعظمها أفرادا. مناهل العرفان في علوم القرآن، ج٢ ص ٩٢.

سەر ئیعجازی قورئانی زیادکرد، لەوانە ئیعجازی زانستی بە هەموو بەشەکانیەوە: فەلەك و پزیشکی و فیزیا و زیندەوەرزانی و... هتد.

ئەوانەی ئەم لایەنانە دەخەنە ڕیزی ئیعجازی قورئانییەوە لەو ڕووەوەیە کە ئەوکاتەی قورئان ئاماژەی بەم شتانە داوە لە توانای هیچ کەسێکدا نەبووە نە بیانزانێت، نە پێشبینی بە زانینیشیان بکات، ئەوانەشی کە ئەم لایەنانە بە ئیعجاز نازانن دەڵێن ئەوانە بەڵگەی لەلایەن خواوەبوونی قورئانن، بەڵام ناچنە ڕیزی ئیعجازەوە چونکە ناچنە ئەو قاڵبەی کە تەحەددایان پێبکرێت کە کەس ناتوانێت شتی وا بکات، یان بیزانێت، چونکە ئەوەتا مرۆڤ هەموو ئەو نهێنییانەی زانی و لە توانایدا هەیە بگاتە زیاتر لەوانەش.

بۆچوونی ئێمە لەمەڕ ئەم مەسەلەیە:

قورئان دوا پەیامی خودایە بۆ بەندەکانی و کتێبی هیدایەت و ڕێنیشاندەرە بۆ سەرفرازی دونیاو قیامەت و خودا پاراستنی خستۆتە ئەستۆی خۆی، وەکو دەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩).

ئەمەش بە پێچەوانەی کتێبە ئاسمانییەکانی دیکە کە خودا ئەرکی پاراستنیانی خستبووە ئەستۆی شوێنکەوتوانی ئەو کتێبانە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەمە دوا کتێب و دوا پەیامی خودایەو دەبێ تا ڕۆژی قیامەت پارێزراو بێت، ئەگینا ئیقامەی حوججەی پێناکرێت، بۆ ئەو مەبەستەش هەندێك نهێنی تێخستووە کە لەیەککاتدا بەڵگەبن لەسەر دوو شت:

١. بەڵگەبن لە سەر ئەوەی کە لە لایەن خوداوە هاتۆتە خوارەوە.

٢. بەڵگەبن لەسەر ئەوەی کە دەستکاری نەکراوە.

بەڵام ئایا ئەو نهێنییانە تەنها لایەنی ڕەوانبێژیی قورئانە، یان ئەم لایەنانەشە کە ئێستا ناوی ئیعجازیان لێدەنرێت وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بە هەندێکیان دا؟

ئایا کاتێك خوا تەحەددای کردووە بەوەی کە کەس ناتوانێت کتێبێکی لەم چەشنە بێنێت، لەبەر لایەنە بەلاغییەکەیەتی، یان ئەم لایەنانەشە، یان شتێکی دیکە سەرباری ئەمانە هەمووی؟

بە ڕای من قۆرخکردنی ئیعجازی قورئان لە ڕووە بەلاغییەکەی و تەنانەت هەموو ئەم ڕووانەی دیکەیش بچوککرنەوەی قورئانە و تەسککردنەوەی بواری نهێنییەکانێتی و ناحاڵیبوونە لە ماهییەتی قورئان و پێوانی قورئانە بە پێوانە مرۆییەکان، بەهەمان ئەو شێوەیەی کە هەندێك کەس ویستوویانە خودای گەورە بە پێوانە مرۆییەکان بپێون، بۆیە لە جیاتی ئەوەی خوا بناسن سەریان لە خوانەناسییەکی تەواوەوە دەرهێناوەو خوایان وەکو نەبوو (معدوم) وەصف کردووە.

ڕاستە قورئان لە ڕووە بەلاغییەکەیەوە موعجیزە و کەس ناتوانێت لە شێوەی قورئاندا بەو ڕەوانبێژییە کتێبێك دابنێت، ئەگەر بێتو دان بنێین بەوەی کە سەردەمی پێغەمبەر ڕەوانبێژترین سەردەمی عەرەبەو سەردەمی زێڕینە بۆ ڕەوانبێژی عەرەبی، ئەوکاتە دەبێ شایەتی ئەوانەی ئەو سەردەمە لەسەر ڕەوانبێژی بێوێنەی قورئان بە هەند وەربگرین و بەحوکمێکی یەکلاکەرەوەی دابنێین لەو بوارەدا، چونکە لەلایەنی شارەزاو پسپۆرەوە دەرچووە، ئەگەر بێتو بەو شێوەیە سەیری ئەو سەردەمە نەکرێت، ئەوا دەرگا والآیە بۆ ئەوانەی خۆیان بە شارەزا دەزانن لە بواری عەرەبیدا و بەڕەوانبێژی خۆیاندا دەنازن، با بێن بەختی خۆیان تاقی بکەنەوە، دەشتوانن لە چوارچێوەی دەزگایەکدا ئەو کارە بکەن، نەك تەنها بە تاقەکەسی، ئەوکاتەش دەبێ ئەو ڕووە بەلاغییانەی لە قورئاندا هەیە لەوانەی ئەوانیشدا هەبێت کە یەکەمیان داهێنانی جۆرێکی نوێیە لە ئەدەب کە بە هاتنی قورئان لە دووەوە بوو بە سێ جۆر، شیعر و پەخشان و قورئان، ئەوکاتە دەبێ بوترێت شیعرو پەخشان و قورئان و (...).

لەگەڵ ئەوەشدا کە کەس ناتوانێت کتێبێکی ڕەوانی لە شێوەی قورئان دابنێت هێشتا قۆرخکردنی ئیعجازی قورئانی لە ڕووە بەلاغییەکەیدا واتە نکۆڵیکردن لە گەورەیی ناوەڕۆکی قورئان، بە واتایەکی دیکە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ لەوانەیە بتوانێت شتێکی وەکو ناوەڕۆکی قورئان دابنێت، بەڵام ناتوانێت بەرگێکی جوانی بە بەردا بکات، وەکو ئەوەی قورئان کە لایەنە بەلاغییەکەیەتی. گومانی تێدا نییە ئەمە بچووککردنەوەی قورئانە نەك دەرخستنی گەورەییەکەی، قورئان پێش ئەوەی لە ڕووی ڕواڵەتەوە (شكل) گەورەو جوان و موعجیز بێت، لە ڕووی ناوەڕۆك (مضمون و محتوى)ـەوە گەورەو بێوێنەیە، پێش ئەوەیشی کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە گەورەو بێوێنە بێت، لە ڕووی جەوهەر و ماهییەتەوە جیاوازو تایبەتمەندە و کەس ناتوانێت شتێك لەو شێوەیە دابنێت.

جوانترین قسەش کە بەرچاوم کەوتبێت لەم بوارەدا ئەو قسەیەیە کە بەنداری فارسی وتوویەتی کە ئەمە دەقەکەیەتی:

وقال أبو حيان التوحيدي: سئل بندار الفارسي عن موضع الإعجاز من القرآن فقال هذه مسألة فيها حيف على المعنى وذلك أنه شبيه بقولك ما موضع الإنسان من الإنسان؟ فليس للإنسان موضع من الإنسان بل متى أشرت إلى جملته فقد حققته ودللت على ذاته كذلك القرآن لشرفه لا يشار إلى شيء فيه إلا وكان ذلك المعنى آية في نفسه ومعجزة لمحاوله وهدى لقائله وليس في طاقة البشر الإحاطة بأغراض الله في كلامه وأسراره في كتابه، فلذلك حارت العقول وتاهت البصائر عنده.[٦]

لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان قورئان کە قسەی خوایە لەگەڵ قسەی مرۆڤدا وەکو جیاوازی نێوان مرۆڤ کە بەدیهێنراوی خوایە لەگەڵ پەیکەری مرۆڤ کە دروستکراوی مرۆڤە، با لە ڕواڵەتیشدا لە یەکدی بچن، بەڵام بە جەوهەر و ماهییەت

[٦]. الاتقان في علوم القرآن جلال الدين السيوطي، ج٤، ص١٣. البرهان في علوم القرآن - الزركشي ج٢ ص١٠٠.

و سیفەت و ئەرك و وەزیفە لەیەكدی ناچن، بەڵكو تاقە لایەنێك كە تێیدا لە یەكدی دەچن ڕواڵەتەكەیە، كە ئەویش لە سەدا سەد نییە، ئەگینا بەقەد تواناكان و نهێنییەكانی مرۆڤ جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە.

جەوهەرو ماهییەتی قورئان جیاوازە لە ماهییەتی هەموو كتێبێك و قسەیەكی دیكە، چونكە ماهییەتی قورئان ئەوەیە كە بریتییە لە ڕۆحی خوا (وكذلك أوحينا إليك روحاً من أمرنا، ما كنت تدري ما الكتابُ ولا الايمانُ ولكن جعلناه نوراً نهدي به من نشاءُ من عبادنا، وإنك لتهدي الى صراطٍ مستقيمٍ * صراطِ اللهِ الذي له ما في السمواتِ وما في الارضِ، ألا إلى اللهِ تصير الامور) (الشورى: ٥٢ — ٥٣).

لێرەدا دەبینی خوای گەورە بەوە قورئان دەناسێنێت كە ڕۆحێكە لە لای خۆیەوە[٧]، كتێبێكیش كە ڕۆح بێت چۆن كتێب و نووسینی دیكەی بێگیانی دەگاتێ؟! لێرەوەیە كە دەڵێین جیاوازی نێوان قورئان و كتێبەكانی دیكە بە قەدەر جیاوازی نێوان مرۆڤ و پەیكەرەكەیەتی كە یەكەمیان لە داهێنانی خواو دووەمیان لە داهێنانی مرۆڤە.

قورئان، نەك تەنها لە بەرگ و ڕواڵەت و ناوەڕۆك و ماهییەتدا جیاوازە لە كتێبەكانی دیكە، بەڵكو لە سیفەتەكانی و وەزیفەكانی و میتۆدەكانیشیدا جیاوازە لە كتێبەكانی دیكە.

**سێیەم: سیفاتەكانی قورئان:**

خوا لە وەصفی قورئاندا دەفەرموێت: (انه لقرآنٌ كريمٌ * في كتابٍ مكنونٍ * لا يمسُهُ إلاّ المُطهّرون) (الواقعة: ٧٧ — ٧٩). (ق * والقرآنِ المجيد) (ق: ١). (بل هو قرآنٌ مجيد) (البروج: ٢١).

---

[٧]. ئەو بۆچوونە هەڵەیە كە دەڵێ مەبەست لە روح لێرەدا جبريلە، چونكە بە صیغەی (أوحينا) هاتووە، نەك (ارسلنا)، جیاوازی نێوان ئەم دووەش ڕوون و دیارە، ئەویش ئەوەیە كە (ارسلنا) بۆ ناردنی كەس و شتیش بەكاردێت، بەڵام أوحينا تەنها بۆ ناردنی شت بەكاردێت.

(يس. والقرآنِ الحكيم) (يس: ١ — ٢).

(ألر تلك آياتُ الكتابِ الحكيم) (يونس: ١).

(وهذا كتابٌ أنزلناهُ مباركٌ مصدقُ الذي بين يديه ولتنذر أُم القرى ومن حولها، والذين يؤمنون بالآخرة يؤمنون به وهم على صلاتهم يحافظون) (الأنعام: ٩٢).

(وهذا كتابٌ انزلناهُ مباركٌ فاتبعوهُ واتقوا لعلكم تُرحمون) (الأنعام: ١٥٥).

(الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ) (هود: ١).

(كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (فصلت: ٣).

(ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ) (البقرة: ٢).

(تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ) (الشعراء: ٢).

(وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ) (النمل: ٦).

(وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ) (القمر: ٢٢).

(وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) (الشورى: ٥٢).

(الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (الاعراف: ١٥٧).

(فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنْزَلْنَا وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ) (التغابن: ٨).

(الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجًا) (الكهف: ١).

(وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ) (فاطر: ٣١).

(إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ) (الزمر: ٢).

(اللَّهُ الَّذِي أَنْزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ) (الشورى: ١٧).

(ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ) (البقرة: ١٧٦).

(إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلَا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا) (النساء: ١٠٥).

(إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا) (الاسراء: ٩).

(وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِمْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَى هَؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ) (النحل: ٨٩).

(وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا) (الاسراء: ٨٢).

**کورتەی ئەو وەسفانەش ئەوەیە کە قورئان کتێبێکی بەڕێزە، دانایە[٨]، پیرۆزە، پایەبەرزە، ڕەوایە و هەڵەو چەوتی تێدا نییە، ڕووناکییە، ڕوونە و یادکردنەوەی ئاسانە، لەلایەن کەسێکی زانا و دانا و باڵادەستەوە دابەزێنراوە.. هتد.**

[٨]. حکیم بە سێ مانا دێت: یەکەم لە (حکمە)ەوە هاتووە واتە دانایی، دووەم حاکم بەسەر ئەوانەی پێش خۆیدا و سێهەمیش واتە مەحکەمکراو (أُحکمت آیاته).

## بەشی دووەم: هەندێك لەو ڕەخنانەی لە قورئان دەگیرێن:

**دەروازە:**

**کاریگەری نەرێیی ریوایەتەکان لە سەر قورئان:**

ئەوانەی ڕەخنەیان لە قورئان گرتووە لەم سەردەمەدا پشتیان بە هەندێك شت بەستووە کە یارمەتی داون، لەوانە:

١. ئەو هەموو ریوایەتە لاواز و هەڵبەستراوانەی دەربارەی نووسین و کۆکردنەوەی قورئان ریوایەت کراون.

٢. ئەو هەموو ریوایەتە لاوازو هەڵبەستراوانەی دەربارەی ناسخ و مەنسوخ هاتوون.

ڕاستە، ئەمانە تاڕادەیەك بەڵگەی ئەمانەتی زانستیین، بەڵام لەولاشەوە بەڵگەن لەسەر دو وشت:

**یەکەم:** هەست نەکردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر نەوەکانی داهاتوو.

**دووەم:** هەست نەکردن بە گەورەیی ئەو ئیشەی کە دەیکەن، ئەویش قسەکردنە لە کتێبی خوادا، ئەو کتێبەی کە خودا دەربارەی فەرموویەتی (أحكمت آياته) و پەیمانی کۆکردنەوەو پاراستنی داوە.

٣. ئەو ئیسرائیلییات و ریوایەتە هەڵبەستراوو لاوازانەی زانایانی تەفسیر ریوایەتیان کردووە لە تەفسیرەکانیاندا دەربارەی واتاو مەبەستی ئایەتەکان.

٤. ئەو هەموو ریوایەتانەی زانایانی شیعە داویانەتە پاڵ ئیمامەکانیان دەربارەی ڕوودانی گۆڕانکاری لە قورئانداو دەستکاریکردنی قورئان لەلایەن هاوەڵانەوەو بوونی موصحەفی فاتیمە و جەعفەر و جامیعە و سورەتی ویلایەت و.. هتد.

بە کورتی، زۆرێك لەو ریوایەتانەی دەربارەی قورئان ریوایەت کراون لە هەندێك بوارەکانی زانستەکانی قورئان کاریگەری نەخوازراویان هەبووە لەسەر

ئیسلام بە گشتی و قورئان بە تایبەتی، دەشتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم ئەو کاریگەرییە نەخوازراوانەی ریوایەتەکان، بەتایبەت ریوایەتە هەڵبەستراوو لاوازەکان، لە سەر ئیسلام هەیانبووە هیچ شتێکی دیکە نەیبووە، ئەو زیانەی ئەو ریوایەتانە لە ئیسلامیان داوە هیچ دوژمنێك لێی نەداوە، هەر لە قورئانەوە بیگرە تا مێژووی ئیسلام، هەر بۆیەشە دوژمنانی ئیسلام زۆر جەخت دەکەنەوە لەسەر باسکردنی ئەو جۆرە ریوایەتانە! ئەگەر ئەوانەی هەڵیانبەستووە لە دوژمنکاری ئیسلامەوە، یان لە نەزانیەوەو لەبەر بەرژەوەندییەکی تەسك هەڵیانبەستووە، بەڵام ئەو زانایانەی بە زیندوێتی هێشتوویاننەتەوە، یان لەبەر بیر تەسکی، یان لە هەستنەکردن بە بەرپرسیارێتی بووە، ئەگینا ئەگەر کەمێك ژیری و لۆژیکیان بخستایەتە کار نەدەبوایە ئەو کارە بکەن، ڕەنگە بوترێت ئەو شتانە لە ڕووی ئەمانەتی زانستییەوە کراوە، بەڵام ئەمانەتی زانستی ئەوە ناگەیەنێت هەر نەزانێك یان ناحەزێك لە جێی خۆیەوە ناماقوڵییەکی کردبێت تۆ بێی بیگێڕیتەوە، با هەڵەو بێبنەماییەکەشی وەکو ڕۆژی نیوەڕۆ دیار بێت، بە بیانووی ئەوەی کە مادەم من بە سەنەدەوە ریوایەتم کردووە ئیتر گەردنی خۆمم ئازاد کردووە و بەرپرسیارێتییەکەم خستۆتە ئەستۆی خوێنەر، بێئەوەی بەخۆی بزانێت چ بیانوویەکی داوەتە دەستی دوژمنانی ئیسلامەوە بۆ ئەوەی تانەی لێدەن و ڕەخنەی لێبگرن.

ئەم قورئانە وەکو بینایەکی زۆر گەورەو جوان و تۆکمە وایە کە هەموو خشتەکانی جوان و تۆکمە بن و لەجێی خۆیاندا دانرابن و بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەریدا (زیاد لە ١٤٠٠ ساڵ) نە درزێکی تێکەوتبێت و نە خشتێکی تێکچووبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا جوانترو تۆکمەتر بووە، بەڵام لەولاوە کەسانێك بێن باسی کات و چۆنێتی دروستبوونەکەی بەجۆرێك بکەن کە پێچەوانەی ئەم تۆکمەیی و جوانی و ڕێکییەی بێت و وای باسبکەن کە لەسەر بناغەیەکی ناپتەو دامەزرابێت و خشتەکانی بێڕەچاوکردنی هیچ بنەمایەکی

ئەندازیاری خرابنە سەریەك! ئایا باوەڕ بەو ڕاستییانە دەکەیت کە بە چاوی خۆت دەیانبینی، یان ئەو قسانەی ئەو کەسانە دەیگێڕنەوە؟ قورئانیش بەهەمان شێوە، کاتێك تەماشای دەکەیت و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەیت دەبینی سەرتاپا ڕێکوپێکی و تۆکمەیی و جوانییە، نەك هەموو وشەیەکی بەڵکو هەموو پیتێکی لە جێی خۆیدایە و ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر چۆن نووسراوەتەوە ئاوها بێ زیادو کەم ماوەتەوەو کەس نەیتوانیوە پیتێکی لێبگۆڕێت و سەرەڕای نەبوونی چاپخانەو نووسینەوەی بە جیا جیا لەم وڵات و لەو وڵات بە دەسخەت، لەگەڵ ئەوەشدا کەمترین جیاوازی لە نێوان دوو نوسخەیدا نییە[٩]، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو زانستی نوێش بێت و دەیان بەڵگەی بەرجەستە بداتە دەستەوە لەسەر ڕاستێتی زانیارییەکانی ناوی و ڕۆژگاریش بەبەردەوامی ڕاستی زانیارییە ڕابردوویی و بەڵێن و هەواڵە داهاتووییەکانی دەربخەن، بەڵام لەولاوە هەندێك ریوایەت بخوێنیتەوە کە ئەگەر باوەڕیان پێبکەیت پێچەوانەی ئەو ڕاستییانەت بەدەستەوە دەدەن و ئەو متمانەیەی قورئان خۆی لە دڵ و مێشکتدا دروستی دەکات، ئەوان لەقی دەکەن!.

با بە نموونەیەك ئەم ڕاستییە ڕوون بکەینەوە: ئەو ریوایەتەی کە دەڵێت سورەتی ئەحزاب ئەوەندەی سورەتی بەقەرە بووە، بەڵام نەسخ کراوە[١٠]! ئەوەی ئەمەی ریوایەت کرد ئەگەر کەمێك ژیری و لۆژیکی بخستایەتە کار ئاوها شتێکی ریوایەت نەدەکرد کە پێچەوانەی سادەترین بنەماکانی لۆژیکە، سورەتێك کە ئێستا ٧٣ ئایەتە بەگوێرەی ئەو ریوایەتە ئەوەندەی سورەی بەقەرە بووە کە ٢٨٦ ئایەتە و ئایەتەکانیشی لەمانەی ئەحزاب درێژترن و سورەی ئەحزاب (١٠) لاپەڕەیە و بەقەرە (٤٨) لاپەڕەیە، واتە بە پێی ئەو ریوایەتە نزیکەی ٣٨ لاپەڕەی کە

---

[٩]. بە پێچەوانەی تەورات و ئینجیلەوە کە دوو چاپیان نییە لەیەك بچن و ڕۆژانەو بەردەوام گۆڕانکارییان تێدا دەکرێت!

[١٠] علوم القرآن عند ابن عبد البر/ رسالة ماجستير للباحث محمد بن عبد الله بن جابر القحطاني ص٢٦٤.

دەکاتە چوار لە سەر پێنجی لابراوەو نەسخ کراوە، بێئەوەی هیچ کەسێك لەوانەی ریوایەتیان کردووە تەنها یەك ئایەتیش لەو ئایەتە نەسخکراوانە بێننەوە، یا هیچ نەبێت ئەو زانایانە داوا لەو ڕاوییە درۆزن و لە خوانەترسانە بکەن بۆ سەلماندنی ڕاستی قسەکەیان ئایەتێك لەو ئایەتانە باس بکەن، یان بپرسن، ئایا ئەو ئایەتە نەسخکراوانە باسی چییان دەکرد و لە کوێی سورەتەکەدا بوون و بۆچی نەسخکراون؟! چونکە کاتێك ئەو سورەتە دەخوێنیتەوە هەست بە هیچ ناهارمۆنییەك ناکەیت و هەست ناکەیت شتێکی لێ قرتابێت! هەمان شت بە نیسبەت ئەو ریوایەتەی دەڵێت سورەتی (التوبة) ئەوەندەی سورەتی (البقرة) بووە، بەڵام نەسخ کراوە[11].

ئەمە دەربارەی ئەو ریوایەتانەی لەلایەن زانایانی ئەهلی سوننەوە ریوایەتکراون، ئەمما ئەوانەی کە زانایانی شیعە ریوایەتیان کردووە ئەوە هەر باس ناکرێن لە گەورەیی ئەو زیانەی بە قورئان و ئیسلامیان گەیاندووە، ئەمان نەك ریوایەتگەلێکیان لە ژێر ناونیشانی نووسینەوەی قورئان و کۆکردنەوەیدا ریوایەتکردووە کە نالۆژیکین و پێچەوانەی ڕاستییەکانی قورئان و واقیعی قورئانن، بەڵکو بە ڕاشکاوی و لە ژێر کاریگەری دەمارگیری مەزهەبییداو لەبەر خاڵی بوونی قورئان لەبنەماکانی عەقیدەی ئیمامەتی شیعەییانە و نەهاتنی ناوی ئیمامەکانیان و پیاهەڵدانی قورئان بە هاوەڵانی پێغەمبەردا، قورئان تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە دەستکاریکراوەو گۆڕانکاری تێدا کراوەو لێی قرتێنراوە! ئەم عەقیدەیە بووەتە سەرچاوەیەکی سەرەکی ناحەزانی ئیسلام بۆ تانەدان لە قورئان.[12]

---

[11]. الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٩/ تأليف أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الظاهري / الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت/ الطبعة الأولى، ١٤٠٦ تحقيق: د. عبد الغفار سليمان البنداري.

[12] بڕوانە کتێبی (فصل الخطاب في تحريف كتاب رب الارباب) نووسینی زانای بەناوبانگی شیعە محمد تقی النوری الطبرسي خاوەنی کتێبی مستدرك الوسائل کە یەکێکە لە هەشت کتێبە سەرچاوەکان بەلای شیعەوە، لەبەر پلەو پایەی لە نزیك قەبری ئیمامی عەلییەو نێژراوە!، ئەم کتێبە زکریا بوترس لە

**یەکەم: قورئان بە مانا دابەزیوە، نەك بە لەفز:**

ڕەنگە جاران زۆرێك لە موسوڵمانان نەیانزانیبێت حیکمەت و دانایی چییە لەو هەموو ئاماژە قورئانییە بە دابەزینی قورئان بە زمانی عەرەبی، ئایا کەسێك هەبووە گومانی هەبێت لەوەی قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە؟ بەڵام ئێستا دوای پەیدابوونی هەندێك کەس لەناو موسوڵمانانداو و بە ناوی ئیسلام و بیرمەندی ئیسلامییەوە کە دەڵێن قورئان بە لەفز بەسەر پێغەمبەردا دانەبەزیوە، بەڵکو بە مانا دابەزیوەو پێغەمبەریش بە دەربڕینی خۆی بە زمانی عەرەبی دایڕشتووەتەوە[13]، یەکێك لە نهێنییەکانی ئەو هەموو ئاماژەپێکردنەی قورئان بە مەسەلەی زمانی عەرەبی تێدەگەین و دەزانین بۆچی خوا ئەوەندە جەختیکردۆتەوە لەسەر ئەوەی کە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوەو قورئان کتێبێکی عەرەبییە، بۆیەش دەڵێم یەکێك لە نهێنییەکان، چونکە لەوانەیە دەیان نهێنی دیکە لەژێر ئەم ئاماژەنەدا هەبن کە لەوانەیە یەکێکی تریان ئەوەبێت کە دەبێ قورئان هەر بە عەرەبی بمێنێتەوەو ئەوەی بەسەر کتێبەکانی پێشوودا هات کە بەو زمانەی پێی دابەزیون نەماون، بەسەر ئەمیشدا نەیەت و نایەت، واتە هەم فەرمانەو هەم بەڵێن و پەیمانە، فەرمانە بە موسوڵمانان قورئان بە زمانە

---

کەناڵی (الحیاة)ی مەسیحی بە بەردەوامی ئاماژەی پێدەدات و بەڵگەی لێدەهێنێتەوە لە سەر ئەوەی کە ئەوەتا موسوڵمانەکان خۆیان دەڵێن قورئان دەستکاریکراوە!.

[13]. بڕوانە وتاری (توتی و زەنبور) لە تۆڕی ئینتەرنێت لە نووسینی د. عبدالکریم سروش.

دکتۆر سروش لەو وتارەیدا دەڵێت: قورئان بە مانا دابەزیوەتە سەر دڵی پێغەمبەر، ئەویش لە ژێر کاریگەری باری دەروونی خۆی و کەلتوری کۆمەڵگەو سەردەمی خۆی ئەو مانایانەی داڕشتووەتەوە، بۆیە هەندێك جار لەوپەڕی ڕەوانبێژی و بەرزی ئاستی ڕۆحیدا ئایەتەکانی داڕشتووە وەکو ئایەتی "الله نور السموات والارض"، هەندێك جاریش لە بارێکی دەروونی پەست و نائارامدا ئایەتی زۆر سادە و بێئاستی وتووەتەوە وەکو سورەتی "تبت یدا ابی لهب".

عەرەبییەکەی بهێڵنەوە و پەیمانیشە لە خوداوە بەوەی کە قورئان بەو زمانەی پێی دابەزیوە دەمێنێتەوە کە زمانی عەرەبییە.

جا ئایا قورئان بە لەفزو مانا دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر، یان تەنها بە ماناو پێغەمبەر خۆی لە ژێر کاریگەری کەلتوری کۆمەڵگەو سەردەمەکەیدا بە دەربڕینی خۆی دایڕشتووەتەوە؟ وەڵامەکەمان لەم چەند خاڵەدا کورت دەکەینەوە:

١. باشترین کەس وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە خودی قورئانە، جا بۆیە ئێمە سەرەتا بەڵگەکانی قورئان دێنینەوە، پاشان بەڵگە مێژوویی و عەقڵی و لۆژیکییەکان.

خوا لە چەندین شوێنی قورئاندا بە ڕاشکاوی دەفەرموێت:

(وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ * نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ * عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ * بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ) (الشعراء: ١٩٢–١٩٥).

(إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (يوسف: ٢).

(وَكَذَلِكَ أَنْزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ) (الرعد: ٣٧).

(وَكَذَلِكَ أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا) (طه: ١١٣).

(وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ* قُرْآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ) (الزمر: ٢٧–٢٨).

(حم * تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (فصلت: ١–٣).

(وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِتُنْذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنْذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ) (الشورى: ٧).

(حم * وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ * إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (الزخرف: ١–٣).

(وَمِنْ قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَى إِمَامًا وَرَحْمَةً وَهَذَا كِتَابٌ مُصَدِّقٌ لِسَانًا عَرَبِيًّا لِيُنْذِرَ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَبُشْرَى لِلْمُحْسِنِينَ) (الاحقاف: ١٢).

(وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُولَئِكَ يُنَادَوْنَ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ) (فصلت: ٤٤).

ئایا ئەم ئایەتانە بەڵگەی یەکلاکەرەوە نین لە سەر ئەوەی کە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە، نەك بە مانا دابەزیبێتە سەر دڵی پێغەمبەر و ئەو بە زمانی خۆی دایڕشتبێتەوە، چونکە دابەزین بە مانا پێویست بە ئاماژەکردن بە زمان ناکات، چونکە ماناکان زمانیان نییە، بەڵکو ئەو کەسەی مانایەك دێتە دڵیەوە خۆی دوایی دەتوانێت بە هەر زمانێك بێت دەری ببڕێت.

٢. کاتێك بێباوەڕەکان داوا لە پێغەمبەر دەکەن قورئانێکی دیکەیان بۆ بێنێت یا ئەم قورئانە بگۆڕێت، قورئان لەوەلامدا دەڵێت: (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (یونس: ١٥).

واتە: من بۆم نییە لە خۆمەوە ئەم قورئانە بگۆڕم، من تەنها شوێنی ئەوە دەکەوم کە بۆم نیگا دەکرێت، من دەترسم ئەگەر سەرپێچی پەروەردگارم بکەم لە ڕۆژێکی گەورەدا سزای سەخت بدرێم.

٣. تەحەدداکردنی بێباوەڕەکان بەوەی کە بتوانن کتێبێك لە شێوەی قورئان، یان لە شێوەی سورەتێکی قورئان بێنن لە ڕووی ڕەوانبیژی و شێوازی داڕشتنەکەیەوە بوو، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر ئەوەی کە قورئان بە لەفز دابەزیوە بەسەر پێغەمبەردا، چونکە پێغەمبەر ئاخاوتنی تریشی هەبوو بەڵام تەحەددای پێنەکراوە، تەحەدداکەش بۆ عەرەب نابێ لە ڕووی ناوەڕۆکی قورئانەوە بێت، چونکە جیاوازییەك بەدینەدەکرا لە نێوان ناوەڕۆکی قورئان و

قسەکانی پێغەمبەردا، بەڵکو پێغەمبەر زیاتر ناوەڕۆك و مەبەستەکانی قورئانی ڕووندەکردەوە، کەواتە هەر دەبێت ئەو تەحەددایە بە پلەی یەکەم بۆ ڕەوانبێژی و شێوازی قورئان بێت، ئەگەر مانای قورئان لای خواوە بوایەو دارشتنەکەی لای پێغەمبەرەوە ئەو کاتە مانایەك نەدەما بۆ تایبەتکردنی قورئان بە تەحەددا، بەڵکو تەحەددا بە هەموو ئەو قسانە دەکرا کە پێغەمبەر دەیکرد.

٤. هەڵوێستی بێباوەڕان لە قورئان دەریدەخات کە قورئان بەزمانی عەرەبی و بە لەفزو مەعنا بەسەر پێغەمبەردا دابەزیوە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە بێباوەڕەکان دەیانزانی قورئان لە دانانی خودی پێغەمبەر نییە، چونکە ئەویان پێشتر دەناسی و ئاوها شتگەلێکیان، یان ئاوها شێوازێکی ئاخاوتنیان لێنەبیستبوو، دەشیانزانی کە شێوازی قورئان لە ناو عەرەبدا، نەك هەر باو نەبوو، بەڵکو بوونی نەبوو، بۆیە هەر جارەو دەیاندایە پاڵ کەسێك و هەر جارەو شتێکیان دەربارەی دەوت، قورئان هەموو ئەو شتانەی تۆمارکردووە.

٥. سووربوونی پێغەمبەر لەسەر نووسینەوەی قورئان ڕاستەوخۆ دوای دابەزینی و ڕاگرتنی دەیان نووسەری قورئان کە بە نووسەرانی وەحی ناسراوبوون و جیاکردنەوەی لە جۆرەکانی دیکەی ئاخاوتنەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، چ لەلایەن پێغەمبەر خۆیەوە، یان لەلایەن هاوەڵانیەوە، هەموو بەڵگەی یەکلاکەرەوەن کە قورئان بە لەفزو مانا دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر.

٦. هەروەها فەرزکردنی خوێندنی قورئان لە نوێژدا و فەرماندان بە لەبەرکردنی و هاتنی فەرموودەیەکی زۆر لە سەر گەورەیی پاداشتی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوەو لەبەریدەکات و دانانی خوێندنەوەی قورئان بە پەرستشێکی گەورەو لەسەرووی هەموو زیکرەکانەوە بەڵگەی یەکلاکەرەوەن لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە لەلایەن خوداوەیە و لەلایەن پێغەمبەرەوە نییە.

پێغەمبەر دەفەرموێت: (اقرءوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعاً لأصحابه). رواه مسلم/ صحيح مسلم، حديث ١١٩١٠، ج٢ ص١٩٧.

(خيركم من تعلم القرآن وعلمه). رواه البخاري/ صحيح البخاري، حديث رقم ٥٠٢٧.

(إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواماً ويضع به آخرين). رواه مسلم، ١٩٣٤، ج٢ ص٢٠١.

(من قرأ حرفاً من كتاب الله فله حسنة، والحسنة بعشر أمثالها، لا أقول ألم حرف، ولكن: ألف حرف، ولام حرف، وميم حرف). رواه الترمذي، حديث ٢٩١٠، ج٥ ص١٧٥.

ئەمانەو دەیان فەرمودەی دیکە کە لە فەزڵ و گەورەیی قورئان بە گشتی و یەکەیەکەی سورەت و ئایەتەکانی هاتوون، هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئان تایبەتمەندی خۆی هەیەو بە لەفزو مانا دابەزیوە بەسەر پێغەمبەردا.

هەروەها جێگیربوونی ئەو ڕاستییە لە سیرەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) کە کاتێك قورئان دادەبەزی بەسەریدا حاڵەت و بارودۆخێکی تایبەتی لێپەیدا دەبوو، وەکو ئەوەی کە ڕەنگی دەموچاوی دەگۆڕا تا وەکو خۆڵەمێشی لێدەهات[١٤] و لە ڕۆژی زۆر سارددا ئارەقەیەکی زۆری دەکرد[١٥] و لەشی قورس

[١٤]. عن عبادة بن الصامت قال: (كان رسول الله صلى الله عليه وسلم اذا نزل عليه الوحي كرب لذلك، تربد لذلك وجهه وخدّه، وأمسك عنه أصحابه، فلم يتكلّم أحد منهم). رواه ابن عبد الرزاق في مصنفه: ٣٢٩/٧، رقم الحديث: ١٣٣٥٩.

[١٥]. عن عائشة قالت: (ولقد رأيته ينزل عليه الوحي في اليوم الشديد البرد، فيفصم عنه وان جبينه ليتفصد عرقاً). رواه البخاري في صحيحه ٤/١ باب كيف كان ينزل الوحي على رسول الله صلى الله عليه وسلم، رقم الحديث: ٣.

دەبووەوە[16]، بەڵگەی دیکەن لەسەر ئەوەی کە قورئان بە لەفز دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر، نەك بە مانا.

٧. هەروەها بێتاقەتبوونی پێغەمبەر لە کاتی دواکەوتنی دابەزینی قورئاندا بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی خودایە بە لەفزو مانا.

٨. لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە ئەو هەموو ئایەتانەی باسی گەورەیی قورئان دەکەن بەڵگەی یەکلاکەرەوەن کە دابەزینی قورئان ڕووداوێکی گەورە بووە، نەك هەر لە ژیانی پێغەمبەردا، بەڵکو لە ژیانی مرۆڤایەتیدا بە گشتی: خوا دەفەرموێت: (لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) (الحشر: ٢١).

(قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ* أَنْتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ) (ص: ٦٧-٦٨).

(وَلَوْ أَنَّ قُرْآنًا سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى بَلْ لِلَّهِ الْأَمْرُ جَمِيعًا أَفَلَمْ يَيْئَسِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعًا وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُمْ بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِنْ دَارِهِمْ حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ) (الرعد: ٣١).

---

[16]. عن ابن عباس قال: (كان النبى صلى الله عليه وسلم يعالج من التنزيل شدة وكان يحرك شفتيه). رواه البخاري في صحيحه ٦/١، باب كيف كان بدء الوحي الى رسول الله صلى الله عليه وسلم، رقم الحديث: ٥ ومسلم في صحيحه باب الاستماع للقراءة ٣٥/٢. عن زيد بن ثابت قال: كُنْتُ أَكْتُبُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ اكْتُبْ لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَجَاءَ عَبْدُ اللَّهِ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُحِبُّ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَكِنْ بِي مِنْ الزَّمَانَةِ وَقَدْ تَرَى وَذَهَبَ بَصَرِي قَالَ زَيْدٌ فَثَقُلَتْ فَخِذُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى فَخِذِي حَتَّى خَشِيتُ أَنْ تَرُضَّهَا فَقَالَ اكْتُبْ {لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ} رواه احمد في مسنده عن زيد بن ثابت ١٨٤/٥ الحديث: ٢١٦٤١.

(اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ) (الزمر: ٢٣).

ئەگەر بهاتبایە قورئان بە لەفز لەلایەن خوداوە نەبوایە، ئەو کاتە پاساوێك نەدەبوو بۆ ئەم هەموو ئایەتەی باسی گەورەیی قورئان دەکەن.

٩. هەروەها ئاماژەدانی قورئان بەوەی کاتێك جنۆکە گوێیان لە پێغەمبەر بوو (دروودی خوای لەسەر بێت) قورئانی دەخوێند بەهەڵەداوان گەڕانەوە نێو قەومەکەی خۆیان و پێیانوتن ئێمە قورئانێکی سەیرمان گوێ لێبوو کە ڕێنمایی خەڵکی دەکات بۆ ڕێی ڕاست ، لە شوێنێکی دیکەدا داننانیان بەوەی کە کتێبێکی ترە دوای ئەوەی بەسەر موسادا دابەزیوە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئان بە لەفزو مانا دابەزیوە.

(قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (الجن: ١).

(وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ* قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنْزِلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُسْتَقِيمٍ (الاحقاف: ٢٩–٣٠).

١٠. واخيراً وليس آخرا: ناوبردنی قورئان بە (كتاب) و (كتاب الله) و (كلام الله) و وەسفکردنی بەو سیفەتانەی لە باسکردنی سیفەتەکانی قورئاندا ئاماژەمان پێدان، وەکو سیفەتی (الحكيم و الكريم و المجيد و المبارك و المبين و الحق) و... هتد هەموو بەڵگەی ئەوەن کە ئەم قورئانە بە لەفزو مانا بەسەر پێغەمبەردا دابەزیوە.

**دووەم: قورئان جیاوازی و دژەیەکی تێدایە:**

هەندێك لەو نەزانانەی ڕەخنە لە قورئان دەگرن [١٧] دەڵێن: قورئان بە شایەتی خۆی دژەیەك (تناقض)ی تێدایە، ئەوە نییە لە قورئاندا هاتووە (ولو كان

[١٧]. ئایا قورئان پارێزراوە؟ نووسینی: عبدالله عبدالفادی، وەرگێڕ نەناسراو.

من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا)، واتە: ئەگەر ئەم قورئانە لەلای غەیری خوداوە بووایە جیاوازییەکی زۆری تێدا دەبوو، کەواتە ئەمە دانپێدانانە کە قورئان جیاوازی و لێکنەچوونێکی کەمی تێدایە، چونکە قورئان نکوڵی لە بوونی جیاوازی زۆر کردووە، نەك هی کەم، بە مەفهومی موخالەفەش، واتە جیاوازییەکی کەمی تێدایە!

لە ڕاستیدا ئەم بەشە لە ئایەتەکە (ولو كان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا) بە هیچ شێوەیەك مەفهومی موخالەفەی تێدا نییە، بەڵکو تەنها یەك مانای هەیە، ئەویش ئەوەیە قورئان هیچ جیاوازی و ناکۆکییەکی تێدا نییە و وتنی ئەم شتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نووسەر نازانێ مەفهومی موخالەفە چییە! بەڵام لە گریمانەیەکیشدا ئەگەر مەفهومی موخالەفەی لێوەربگیرێت، ئەو کاتە ئەم بەشە ئایەتە یەکێك لەم دوو مانایە دەبەخشێت:

یەکەم: یا ئەوەیە قورئان ئەگەر زۆرێك جیاوازی و لێکنەچوونی تێدا نەبێت، بەڵام کەمێکی تێدایە.

دووەم: یان مەبەست دەرخستنی گەورەیی قورئان و نەبوونی هیچ جیاوازی و لێکنەچوون و کەموکورتییەك تێیدا، واتە ئەم ئایەتە یان دانانی تێدایە بە بوونی جیاوازی و لێکنەچوونێکی کەم لە قورئاندا، یان بەرگرییە لە قورئان و دەرخستنی گەورەیی و تۆکمەییەکەیەتی، ئەم دوو مانایەش ڕێك پێچەوانەو دژی یەکن و نابێت لەیەککاتدا مەبەستی ئایەتەکە بێت، کەواتە مەبەست لەم ئایەتە یەکێکیانە، جا کامیانەو بە چیدا بیزانین؟

لێرەدا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ چەند شتێك: یەکەم سیاقی ئایەتەکە، دووەم هەندێك پێشەکی و قەرینە، سێهەمیش ناوەڕۆکی قورئان کە خودی ئایەتەکە داوامان لێدەکات.

به نیسبەت سیاقی ئایەتەکەوە دەبێ سەرەتا هەموو ئایەتەکە بەسەریەکەوە بخوێنینەوە، نەك تەنها ئەو بڕگەیەی، ئایەتەکە دەفەرموێت: (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا) (النساء: ٨٢).

کەواتە سەرەتاکەی داوای وردبوونەوە و تێڕمان لە قورئان دەکات: (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ)، واتە ئایا لە قورئان وردنابنەوە و تێڕانامێنن؟ ئەگەر لەلایەن غەیری خوداوە بوایە جیاوازییەکی زۆری تێدا دەبوو.

ئایا نێرەری قورئان لێرەدا کە داوادەکات وردبینەوە لە قورئان بۆ ئەوەیە بوونی جیاوازی و لێکنەچوون و دژەیەك لەقورئاندا ڕابگەیەنێت یان بۆ ئەوەیە سەرنجمان ڕابکێشێت بۆ گەورەییەکەی؟ یەکەمیان (واتە ڕاگەیاندنی بوونی کەموکورتی لە قورئاندا) وردبوونەوەی بۆچییە؟ ئەوەندە بەسە کە بڵێت ئەم قورئانەی ناردومەتە خوارەوە زۆر تەواو نییەو هەندێك کەموکورتی تێدایە، وەکو چۆن هەموو نووسەرێك کاتێك کتێبێك دەنووسێت دەڵێت: ئەمە ئەوپەڕی توانای من بوو خستوومەتە کار، ئەگەر کەموکورتییەکتان تێدا بینی، یان دەڵێ: چاوپۆشیم لێبکەن، یان دەڵێ: پێم ڕابگەیەنن، بەڵام ئەوە بە ڕوونی دیارە کە ئەم ئایەتە لە میانەی بەرگری لە قورئان هاتووە، کەواتە بەدڵنیاییەوەوە مەبەست لە ئایەتەکە دەرخستنی گەورەیی قورئانە، نەك داننان بە بوونی جیاوازی و کەموکورتی تێیدا، بە پێچەوانەی ئەوەی کە هەندێك خەڵکی ناحاڵی لێی تێگەیشتوون!

خودا لێرەدا دەیەوێت بڵێت ئەم کتێبە ئەوەندە گەورەو بە پێزو پڕلە نهێنی و زانیارییە ئەگەر لەلایەن هەرکەسێکی دیکەوە بووایە غەیری خۆی جیاوازی و دژەیەکییەکی زۆری تێدا دەبوو، چونکە لە توانای کەسدا نییە کتێبێکی لەو شێوەیە بەم تۆکمەیی و بێکەموکورتییە دابنێت؟ لۆژیکیش وا دەڵێت، ئەگینا بە چ لۆژیکێك خودا لەمیانەی بەرگری لە قورئان بوونی جیاوازی و لێکنەچوون دەسەلمێنێت؟ هەر بە سەرنجێکی سەرپێیانە تێدەگەی کە مەبەستی خودا لێرەدا

ئەوەیە کە ئەم قورئانە جیاوازی و زانیاری دژەیەکتری تێدا نییە، چونکە یەکەم لە بواری تەحەددیدا هێناویەتەوەو دووەم داوای وردبوونەوەو تێڕامان لە قورئان دەکات.

بەنیسبەت ئەو پێشەکی و قەرینانەشەوە کە واتاو مەبەستی ئایەتەکە دەردەخەن، دوو شتن: یەکەمیان ئەوەیە کە نێرەری ئەم قورئانە خودایەکی زاناو داناو بەدەسەڵات و کاربەجێیە، بۆیە هەر شتێك بڵێت و بکات بێکەموکورتییە.

(تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ) (الزمر: ١).

(تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) (غافر: ٢).

(تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) (فصلت: ٢).

دووەمیشیان ئەوەیە کە خودا لە چەندین شوێنی دیکەدا وەسفی ئەم قورئانەی کردووە بەوەی کە بێکەموکورتییە و هیچ ناتەواوییەکی تێدا نییەو ئایەتەکانی بەتەواوی مەحکەم کراوە.

(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ* لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ) (فصلت: ٤١-٤٢).

(كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (فصلت: ٣).

(قُرْآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ) (الزمر: ٢٨).

سێهەمیش خودی قورئانە کە خودا خۆی لەم ئایەتە و لە زۆر شوێنی دیکەدا داوا دەکات لێی وردبینەوە.

(كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ) (ص: ٢٩).

(أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) (محمد: ٢٤).

لە ئەنجامدا دەردەکەوێت بێژەری ئەو قسەیە کە گوایە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بوونی جیاوازی و ناکۆکی و دژەیەکی لە قورئاندا خاوەنی نەزانییەکی ئاوێتەیە، هەم نەزانییە بە خودا، هەم بە پلەو پایەو گەورەیی قورئان، هەمیش تێنەگەیشتنە لە مەبەستی قورئان و نەزانییە بە شێوازی دەربڕینی قورئانی.

بە کورتی، خوای گەورە لێرەدا دەیەوێت ئاماژە بە گەورەیی قورئان بدات و بە بەندەکانی بگەیەنێت کە قورئان زۆر گەورەیە، ئەگینا ئەگەر کەسێکی دیکە کتێبێکی لە گەورەیی ئەم قورئانەدا دابنایە پڕی دەکرد لە جیاوازی و زانیاری دژە یەك، بەڵام لەبەر ئەوەی لەلایەن خوداوەیە هیچ جیاوازی و دژەیەکترێکی تێدا نابینرێت.

با بە نموونەیەك زیاتر ئەم مەبەستە ڕوون بکەینەوە: ئەگەر ئەندازیارێکی شارەزا بچێتە سەر دەزگایەکی زۆر زۆر گەورەو ئاڵۆز و هەستیار و لە هەموو ڕوویەکەوە لێی وردبێتەوە ببینێت زۆر بە شێوەیەکی ئەندازیاری تەواو دروستکراوەو هیچ کەموکورتییەکی تێدا نییە و بپرسێت ئەمە چ ئەندازیارێك نەخشەکەی کێشاوەو سەرپەرشتی کردووە، لە وەڵامدا بڵێن فڵانە ئەندازیار، (ئەندازیارێکی گەورەو پسپۆڕ و لێهاتوو) ئەویش لە وەڵامدا بڵێت: ئەگەر ئەم دەزگایە هەرکەسێکی دیکە بیکردایە جگە لەو ئەندازیارە پڕدەبوو لە کەموکورتی. ئایا ئەمە داننانە بە گەورەیی و ڕێکوپێکی ئەو دەزگایەدا، یان داننانە بە بوونی هەندێك کەموکورتی تێیدا؟ گومانی تێدانییە کە داننانە بە گەورەیی ئەو دەزگایە و بێعەیبییەکەی، بەهەمان شێوە خودا دەفەرموێت: ئەگەر ئەم قورئانە گەورەیە کە پڕە لە نهێنی و زانیاری و بەجوانترین بەرگ ڕازێنراوەتەوە لەلایەن غەیری خوداوە بوایە، پڕ دەبوو لە جیاوازی و دژەیەکی، واتە ئەم ئایەتە هەم ئاماژەیە بۆ گەورەیی قورئان، هەم بۆ زانایی و کاربەجێیی خودای گەورە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هێنانەوەی ئەم ئایەتە بە بەڵگە لەسەر بوونی جیاوازی و لێکنەچوون لەقورئاندا لە لایەن ئەو کەسانەوە، بەدەستەوەدانی بەڵگەی بەرجەستەیە لە سەر تێنەگەیشتنیان لە قورئان و پشتڕاستکردنەوەی قسەی ئەو کەسانەیە کە تۆمەتباریان دەکەن بە تێنەگەیشتن لە قورئان.

**سێیەم: قورئان هەڵەی ڕێزمانیی تێدایە:**

مەسەلەیەکی دیکە کە زۆر لەوەی پێشووتر بێبنەماترە، لافلێدانی بوونی هەڵەی ڕێزمانییە لە قورئاندا لە لایەن هەندێك کەسەوە![18]

نووسەری کتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە؟) بە پشت بەستن بە نزمی ئاستی خوێندەواری ئەوانەی کتێبەکەی بۆ نووسیون، یان ناشارەزاییان لە زمانی عەرەبی هەندێك ئایەتی هێناوەتەوە لە قورئان کە گوایە ئەو ئایەتانە هەڵەی ڕێزمانییان تێدایە، بێئەوەی بۆ وەڵامی زانایان لەو ڕووەوە بگەڕێتەوە!

ئێمە لێرەدا نایەین نەزانیی نووسەر و هاوشێوەکانی لە یەکە یەکەی ئەو ئایەتانەدا باس بکەین کە هێناونیەتەوە، چونکە لە کۆن و نوێدا وەڵام دراونەتەوەو زانایان هەڵوێستەی زۆریان لەسەر کردوون و ڕووە جیاجیاکانیان دەرخستووە، بەڵام کەسیان نەیوتووە ئەوانە هەڵەی ڕێزمانیین، نەك لەبەر ئەوەی کە بە هەڵەیان زانیوەو جورئەتیان نەکردووە ئەوە بڵێن، بەڵکو لەبەر چەند هۆی زانستی، لەوانە:

١. ڕەوانبێژی قورئان جێی قسە نییەو زانایان هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی هیچ کتێبێك نییە لە قورئان ڕەوانتر، کەواتە دوورە لە لۆژیکەوە، بەڵکو ئەستەمە خاوەنی قورئان ئەو شتانەی نەزانیبێت و لە ڕووی نەزانییەوە کردبێتی، بەڵکو دەبێ نهێنی و حیکمەتی خۆی تێدابێت و بە مەبەست و لە دەستی ئەنقەست خوای گەورە بەو شێوەیە بە خیلافی قاعیدەیە هێنابێتنی.

٢. زمانی عەرەبی لەبەر ئەوەی زۆر دەوڵەمەندە لە ڕووی زمانەوەو ڕێساگەلێکی زۆری ڕێزمانیی هەیە، ئەو چەند حاڵەتە کە زانایان ناویان ناوە کسر الاعراب لەژێر ئەو ڕێسا ڕێزمانییانەدا جێیان دەبێتەوە.

٣. لەبەر ئەوەی کە عەرەب ڕەخنەیان لەو شتانە نەگرتووە کاتێك کە بەسەریاندا خوێنراوە، کەواتە ئەوانە بە هەڵە نەژمێردراون و پێچەوانەی ڕەوانبێژی

---

[18]. ئایا قورئان پارێزراوە (هل القرآن معصوم) نووسینی: عبدالله عبدالفادی، وەرگێڕ نەناسراو.

نین و له نرخی ڕەوانبێژی قورئانیان کەمنەکردۆتەوە. باوەڕیش ناکەم کەسێك هەبێت شارەزایی له زمانی عەرەبیدا هەبێت گومانی هەبێت لەوەی که خەڵکانی سەردەمی پێغەمبەر لەوانەی دوای خۆیان ڕەوانبێژتربوون و عەرەبییەکەیان که به سەلیقه دەیانزانی زۆر بەهێزتر بوو لەنەوەکانی دوای خۆیان که زمانەکەیان تێکەڵی زمانەکانی تر بوو بوو له ئەنجامی فتوحاتی ئیسلامی و تێکەڵبوونی عەرەب له گەڵ میللەتانی تردا.

زانایان له ڕووی دووەمەوە سەرکەوتوو بوون، واتە جێکردنەوەی ئەو حاڵەتانه له ژێر ئەو ڕێسا ڕێزمانییانەدا، بەڵام لەوانەیه هەموو نهێنییەکانی ئەو کارەیان بۆ دەرنەکەوتبێت.

بەندەی هەژار لێرەدا، له ئەنجامی بیرکردنەوەی زۆر، هەندێك نهێنیم بۆ دەرکەوتووە که ئومێدەوارم پێکابێتم و جێی سەرنجی پسپۆران بێت.

من لەو باوەڕەدام ئەم شتانەی که خیلاف قاعیده گشتییەکه هاتوون و ناحەزه نەزانەکان پێی دەڵێن هەڵەی ڕێزمانی له قورئاندا، بەڵگەن لەسەر دوو شت:

**یەکەم:** لەلایەن خواوەبوونی قورئان.

**دووەم:** دەستکارینەکرانی قورئان و ڕوونەدانی کەموکوڕی و گۆڕانکاری بەسەریدا.

بابزانین چۆن:

١. هەموو دەزانین که پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت جگه له قورئان دوو جۆری دیکه ئاخاوتن دەدرێتە پاڵی، یەکێکیان فەرموودەکانی خۆیەتی که ماناو داڕشتنیان له لایەن خۆیەوە بووە، دووەمیشیان فەرموودەی قودسییە که واتاکەی لای خوداوەیەو داڕشتنەکەی لەلایەن پێغەمبەرەوەیە، لەم دوو جۆرە ئاخاوتنانەدا هیچ شتێکی لەو جۆرەیان تێدا نییه که له قورئاندا هەیەو پێیان دەوترێت "کسر الاعراب" و ناحەزانی ئیسلام پێی دەڵێن هەڵەی ڕێزمانیی، ئەمە له

کاتێکدایە کە پێغەمبەر قورئانی بەلاوە لەو دوو قسەیەی خۆی گەورەترو ڕەوانتر بووە و تەحەددای مرۆڤایەتی پێکردووە، نەك بەو دوو جۆرەکەی دیکەی، کەواتە چۆن دەبێت قورئان ئەو هەڵانەی تێدا بێت و لە دوو جۆرە ئاخاوتنەی دیکەدا نەبن؟

٢. زانایانی زمانیش هەموو قورئانیان پێ ڕەوانترە تاکو فەرموودەکانی پێغەمبەر بە هەردوو بەشەکەیەوە، کەواتە دەبێ لێرەدا نهێنییەك، یان چەندین نهێنی هەبێت کە وای کردووە قورئان ئەم جۆرە شتانەی تێدابێت کە ناحەزانی پێی دەڵێن هەڵەی ڕێزمانیی، نەك ئەو شتانە لە ڕووی ناشارەزایی بە یاساکانی زمانی عەرەبییەوە ڕوویاندابێت.

٣. ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن پێغەمبەر خۆیەوە بوایە، ئەو جۆرە شتانەی نەدەکرد بە بەڵگەی ئەوەی لەو دوو جۆرە ئاخاوتنەی تریدا شتێکی لەو جۆرە نییە، چونکە ئەگەر قورئان لەلایەن پێغەمبەرەوە بوایە، حەتمەن دەبوایە خاڵی بوایە لەو جۆرە شتانەی کە دوو جۆرە ئاخاوتنەکەی دیکە خاڵین لێیان.

٤. ئەگەر قورئان لە دانانی پێغەمبەر بوایە دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوت ئەوانە هەڵەی ڕێزمانی و زمانەوانین ڕاستیدەکردنەوە، بەڵام بەوەی کە دەستکاری نەکردووە، دەردەکەوێت کە ئەو نە دەستی هەبووە لە داڕشتنی قورئاندا، وەنە لە گۆڕینیدا، بەڵکو ئەو تەنها ڕاگەیاندنی قورئانی لەسەر بووە، چۆن بۆی دێتە خوارەوە ئاوها بیگەیەنێت، وەکو لە قورئاندا هاتووە: (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ (يونس: ١٥).

٥. هەروەها ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موسوڵمانانیش بە هیچ شێوەیەك دەستکاری قورئانیان نەکردووە، نە هاوەڵانی پێغەمبەر، نە ئەوانەی

لەدوای ئەوان هاتوون، چونکە ئەگەر بکرایە دەستکاری شتێك بکەن ئەوا دەستکاری ئەو ئایەتانەیانە دەکرد کە ناحەزان دەڵێن هەڵەی ڕێزمانییین.

ئەم ئایەتانە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرن کە نە پێغەمبەر، نە موسوڵمانان دەستکاری پیتێکی قورئانیان نەکردووە، بەڵکو زۆر بە حەزەر و ئەمانەتەوە ڕەفتاریان لە گەڵدا کردووە و جورئەتیان نەکردووە لە خۆیانەوەو بە ئیجتیهادی خۆیان پیتێك لە جێی پیتێك دابنێن لە ژێر هەرپاساوێکدا بێت، بەڵکو تەنانەت نەیانتوانیوە بە ناوی قیرائاتیشەوە دەستکاری بکەن، کەواتە ئەو قیرائەتانەش کە هەن هەمووی لە لایەن خوداوە بووە، نەك لە ئەنجامی دەستکاریکردنی قورئانەوە بە مەیل و ئارەزووی زانایان، یا لەبەر بەرژەوەندی ئایینەکە، وەکو ئەوەی کە زانایانی ئایینی جولەکەو نەصرانی بە کتێبەکانی خۆیانیان کردووە.

**چوارەم: ڕەخنە لە ڕەوانبێژی قورئان: سورەتی (تبت يدا أبي لهب)، وەکو نموونەیەك:**

ئەم مەسەلەیە دەتوانم بڵێم تا ڕادەیەك تازەیە لە سەر عەرەبی زمانەکان و دەرهاویشتەی سەردەمی لاوازی هەستی ئەدەبی و سەلیقەی عەرەبی خەڵکی بەگشتی و عەرەب بەتایبەتییە، ئەگینا کەس نەبووە لەمەوبەر ڕەخنە لە ڕەوانبێژی قورئان بگرێت، بەڵکو هەموو زانایانی زمانی عەرەبی و شاعیرو ئەدیبە عەرەبەکان، بە موسوڵمان و غەیرە موسوڵمانەوە، دانیانناوە بەوەی کە قورئان ڕەوانبێژترین کتێبە و سەرچاوەی هەموو ڕەوانبێژییەکەو هۆکاری سەرەکی مانەوەی زمانی عەرەبییە وەکو خۆی و بە زیندوێتی و زانایان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون ڕووە ڕەوانبێژییەکانی قورئان پەی پێببەن و لە پێشبڕکێی ئەوەدابوون کێ لایەنی زیاتری ڕەوانبێژی قورئان بدۆزێتەوە، هەندێك لەوانەی پسپۆرن لەو بوارەدا ڕووەکانی ڕەوانبێژی قورئانیان گەیاندۆتە هەزارەها ڕوو.

سورەتی "تبت يدا ابی لهب" بەڵگەیەکی ترە لەسەر لەلایەن خواوەبوونی قورئان و دەستکاری نەکرانی:

ئەوەی سەیرە لەم ڕۆژەدا ئەوەیە زۆربەی ئەوانەی ڕەخنە لە ڕەوانبێژی قورئان دەگرن لەم سەردەمەدا کەسانێکن، یان غەیرە عەرەبن و شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە زمانی عەرەبیدا نییە و عەرەبی لە ڕێگەی خوێندنەوە فێربوون، یان کەسانێکی عەرەبن، بەڵام دیسانەوە شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە زمانی عەرەبیدا نییە و زەوق و سەلیقەی عەرەبییان لاوازە.

نموونەی یەکەم ڕۆژهەڵاتناسە بیانییەکان و دکتۆر عەبدولکەریم سروشی ئێرانی و دووەمیان (احمد القبانجي)ـە، نووسەری کتێبی (هل القرآن معصوم) کە ناوی خۆی ناوە (عبدالله عبدالفادي) نازانرێت عەرەبە، یان نا، بەڵام ئەوەی پێوە دیارە کە سەرباری ڕق و قینی لە ئیسلام، کەسێکی نەزان و ناعیلمییە.

جا یەکێك لەو قسانەی سروش دەیکات، کە بە حیسابی خۆی بیرمەندێك و فەیلەسوفێکی ئیسلامییە و خوێندنەوەی نوێ بۆ چەمکەکانی ئایین دەکات بە قورئانیشەوە، لە وتارێکیدا بەناوی "توتی و زەنبور" دەڵێت: قورئان بە لەفز بەسەر پێغەمبەردا دانەبەزیوە، بەڵکو بە مانا دابەزیوەو پێغەمبەریش خۆی دایڕشتۆتەوە لە ژێر کاریگەری کۆمەڵێك فاکتەردا ـ لەوانە کەلتوری نیوەدورگەی عەرەب و سەردەمی خۆی و باری دەروونیی خۆی و... هتد، جا لەو کاتانەی باری دەروونیی بەرز بووە ئایەتی وەکو "الله نور السموات والارض"ی داڕشتووە، کاتێکیش باری دەروونیی پەست بووە سورەتی وەکو "تبت يدا ابي لهب وتب"ی داڕشتووە کە هیچ ڕەوانبێژییەکی تێدا نییە و نابێت بدرێتە پاڵ خودا، بەڵکو ڕەنگدانەوەی باری دەروونیی پێغەمبەر خۆیەتی.... هتد!

من لێرەدا قسە لەسەر لایەنی ڕەوانبێژی ئەم سورەتە ناکەم و نامەوێت ئەوە بسەلمێنم کە گەیاندنی ئەو مانایانە بەو وشە کەمانە و بەو جوانییە لە توانای کەسدا نییە، چونکە یەکەم: پسپۆڕ نیم لەو بوارەدا، دووەم: زانایان قسەیان لەسەر کردووە و کەسێك بیەوێت بیزانێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبی "في ظلال القرآن"ی سەید قوتب، لەو باوەڕەدام بەسی بێت، بەڵام قسە لەو ڕووەوە دەکەم

کەچۆن دابەزینی ئەو سورەتەو مانەوەی وەکو خۆی لە قورئاندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە نە دانانی لەلایەن پێغەمبەرەوە بووە، نە دەستیشی هەبووە لە دابەزینیدا، نە توانیویشیەتی دەستکاری بکات و نە موسوڵمانانیش دوای خۆی توانیویانە دەستکاری بکەن.

[1]. ئاشکرایە ئەم سورەتە لە سەرەتاکانی سەردەمی بانگەوازی ئیسلامییدا دابەزیوە لە مەککە کە هێشتا ژمارەی موسوڵمانان بە پەنجەی دەست دەژمێرران، جا ئەگەر ئەم قورئانە لە دانانی موحەممەد خۆی بوایە هەرگیز لەو کاتەدا ئاوها سورەتێکی دانەبەزاند، لەبەر ئەم هۆیانە:

**یەکەم:** وەکو ئەزانین ئەبولەهەب مامی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەریش لەو سەرەتایەوە پێویستی بە هاوسۆزی و هاوکاری و پشتیوانی خزمانی هەبوو، وەکو قورئان لەو سەرەتایەدا بەسەر زمانی پێغەمبەرەوە دەفەرموێت: (ذَلِكَ الَّذِي يُبَشِّرُ اللَّهُ عِبَادَهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى وَمَنْ يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَزِدْ لَهُ فِيهَا حُسْنًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ) (الشورى: ٢٣). واتە: من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێت جگە لەوەی ڕەچاوی ئەو خزمایەتییە بکەن کە لە نێوانماندا هەیە.

کەواتە کەسێك خۆی داوای ڕەچاوکردنی ئەو پەیوەندییە بکات چۆن دەچێت بەو شێوە توندە دادەبەزێت بەسەر مام و مامۆژنیدا، ئایا لە کاردانەوەی خزمانی دیکەی ناترسێت؟ دوایی، لەوە ناترسێت خەڵکی سەرزەنشتی بکەن لەسەر ئەوەی بەو شێوە توندە دابەزیوە بەسەر مام و مامۆژنیدا؟ ئەی لەوە ناترسێت ئەبوتالیبی مامی کە یەکەم پشتیوانی بوو لێی زوێر بێت و هەڵوێستی لێوەربگرێت لەسەر ئەو هێرشە توندەی لەسەر ئەو برایەیانە کردوویەتی؟ ئەی لەوە نەدەترسا کە خزمانی بچن بۆ لای ئەبوتالیبی مامی و داوای لێبکەن لەسەر ئەو قسانەی بە ئەبولەهەبی وتووە سەرزەنشتی بکات، یان پشتی بەربدات؟

**دووەم:** هەموو دەزانین کە دوو کچی پێغەمبەر مارەبڕی دوو کوڕی ئەبولەهەب بوون، ئایا ئەگەر قورئان لە دانانی موحەممەد بووایە دەچوو ئاوها موجازەفەیەك بکات و ئایندەی کچەکانی بخاتە مەترسییەوە و ئەو هێرشە توندە لەسەر خەزورانی کچەکانی بکات کە دەرئەنجامەکەی دیاربوو، ئەویش تەڵاقدرانی دوو کچەکەی و شێوانی لانە لێیان؟ لەوباوەڕەدام هیچ کەسێك گەر بەدەستی خۆی بێت ئاوها هەنگاوێك نانێت.

کەواتە لە ڕووی عەقڵ و لۆژیکە پێغەمبەر هیچ بەرژەوەندییەکی نەبوو لەو هێرشکردنە سەر ئەبولەهەب.

٢. ئاشکرایە کە ئەبولەهەب و ژنەکەی لە ژیانی پێغەمبەردا هەر لە مەککە کۆچی دواییان کرد، ئایا ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن پێغەمبەرەوە بوایە، یان توانای دەستکاریکردنی هەبوایە چ لە خۆیەوە، یان لەسەر داوای مامەکانی و خزمانی ئەو سورەتەی لانەدەبرد؟ چ زەرورەتێك مابوو بۆ هێشتنەوەی ئەو سورەتە لە قورئاندا؟

٣. ئاشکرایە کە دوای فەتحی مەککە هەموو ئەهلی مەککە موسوڵمان بوون بەخزمانی پێغەمبەر و کوڕەکانی ئەبولەهەبیشەوە، ئایا ئەگەر قورئان لە دانانی خودی پێغەمبەر بوایە، یان دەستکاریکردنی بەدەستی ئەو بوایە، ئەم سورەتەی هەڵنەدەگرت؟ هیچ نەبوایە لەبەر دڵی خزمانی و کوڕەکانی ئەبولەهەب و مامەو ئامۆزاکانی! مێژوو و کتێبەکانی سیرە هیچ ئاماژەیەکیان تێدا نییە لەوەی کە کەسێك لە خزمانی پێغەمبەر، یان کوڕانی ئەبولەهەب ئاوها داوایەکیان لە پێغەمبەر کردبێت، چونکە هەموو بە تەواوی تێگەیشتبوون کە نە هاتنە خوارەوەی قورئان و نە دەستکاریکردنیشی دەسەڵاتی پێغەمبەری تێدا نییە. ئەگەر خەڵکی کەمترین گومانیان هەبوایە ئاوها داوایەکیان لە پێغەمبەر دەکرد و ئەو کەسانەی ناویان بەخراپە لە قورئاندا هاتبوو، یان سەرزەنشت کرابوون کوڕەکان و خزمانیان مەرجی ئەوەیان لەسەر پێغەمبەر دەکرد کە ئەو ئایەتانە

لاببەن ئینجا موسوڵمان دەبن، لەوانە کوڕەکانی ئەبولەهەب و خالیدی کوڕی وەلید کە ئایەت لەسەر باوکی دابەزیبوو و...هتد.

٤. پێغەمبەر چۆن توانی لەو سەرەتای بانگەوازەوە موجازەفەیەکی وا بکات و بڕیارێکی وا دەربکات کە ئەبولەهەب و ژنەکەی هەردووکیان دۆزەخین و باوەڕ ناهێنن، ئایا ترسی ئەوەی نەبوو مامی بۆ بەدرۆخستنەوەشی بێت بە سەرزارەکیش بێت، موسوڵمانێتی خۆی ڕاگەیەنێت؟ ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوەیە لەسەداسەد دەیزانی سەرئەنجامی ئەبولەهەب و ژنەکەی بەچی دەگات و دەیزانی کە هەرگیز بە سەرزارەکیش بێت، باوەڕناهێنن؟

٥. ئەم سورەتە بەشێکە لە ژیاننامەی پێغەمبەر و دۆکیومێنتێکی مێژووییە لەسەر ئەو سەردەمەی پێغەمبەر لەسەر ئەو ناڕەحەتییانەی ڕووبەڕووی دەبوونەوە لەو سەرەتای بانگەوازەوە کە لە هەموویان سەختتر پشتهەڵکردنی خزمانی بوو لێی و دوژمنایەتیکردنی بوو لەلایەن ئەو خزمانەوە، ئیتر نازانم چۆن کەسێکی وەکو د. سروش شتێکی وای لێ دەشارڕێتەوە و سورەتێکی وا بە زیاد و نابەجێ دەزانی لە ناو قورئاندا.

٦. بەدرۆخستنەوەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن پێغەمبەر قورئانی لە بەحیراوە وەرگرتووە، چونکە لۆژیکی نییە نە بەحیراو نە هیچ کەسێکی تر بزانن هەڵوێستی یەکەیەکەی ئەو خەڵکییە چۆن دەبێت بەرامبەر بە بانگەوازەکەی پێغەمبەر، بە تایبەت خزمانی خۆی.

**پێنجەم: (نهج البلاغة) لە قورئان ڕەوانترە:**

لەناو ئەو ڕەخنەگرە سەیرانەی کە لەم سەردەمەدا پەیدا بوون عەمامە بەسەرێکی شیعەیە بەناوی (احمد القبانچي) کە لە لەندەن دادەنیشێت و هەر بەو جلە ئاینییەوە شوڵی لێهەڵکێشاوەو دەستی داوەتە ڕەخنەگرتن لە چەمکە ئایینیەکان، هەر لە مەسەلەی بەهەشت و دۆزەخ و تا حیجاب و نیقاب، بەوەشەوە

نەوەستاوە، بەڵكو لەم دواییەدا دەستی دایە ڕەخنەگرتن لە ڕەوانبێژی قورئان بە میتۆدێكی زۆر سەقەت، ئەویش بە بەراوردكردنی هەندێك دەقی قورئانی لەگەڵ هەندێك دەقی ناو (نهج البلاغة)ی ئیمامی عەلی كە شریف الرضي بەبێ سەنەد كۆیكردۆتەوە !

سەرەتا، سەقەتی میتۆدەكەی لەوەدایە بەراورد لە نێوان دوو دەقدا دەكات كە باس لە دوو بابەتی جیاواز دەكەن، دەقەكەی قورئان كە سورەتی (همزە)ـەیە باس لەو دەوڵەمەندانە دەكات كە بە سەروەت و سامان و پلەپایە دونیاییەكەیاندا دەنازن و گاڵتە بە خەڵكی دەكەن، دەقەكەی (نهج البلاغة)ش باس لە وەسیەتیكی ئیمامی عەلی دەكات بۆ حەسەنی كوڕی!

میتۆدی ڕاست و ساغیش ئەوەیە كە بەراورد لە نێوان دوو دەقدا بكەیت كە باس لەیەك شت و چارەسەری یەكجۆر شت بكەن، نەك هەریەكەو باسی بابەتێك بێت. بۆ نموونە گەر بتەوێت بەراورد لە نێوان دوو دەقی شیعریدا بكەیت دەبێت هەردووكیان لە هەمان بواردا بن، بۆنموونە هەردوكیان شیعری غەزەل بن، یان هەردووكیان شیعری حەماسەت بن، یان شیعری هەجوو بن، نەك یەكێكیان بەسەر غەزەل بێت و ئەوی تریان لەسەر حەماسەت، یان هەجووكردن بێت.

**دووەم:** ئەوەی كە سەرنج دەدرێت لەو بەراوردەدا ئەوەیە كە قەبانچی تەنانەت ئەو سوورەتە بچووكانەی قورئانیشی لەبەر نییە، نەك هەر ئەوە، بەڵكو بەجوانییش نازانێت بیانخوێنێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو نە شارەزایی لە قورئاندا هەیە، نە لێكۆڵینەوەو توێژینەوەیەكی ئەوتۆشی بۆكردووە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو وەكو هەموو تاكێكی شیعە ئەوەندەی ئاگای لە (نهج البلاغة) هەیە و ئەوەندە خوێندنەوەو لێكۆڵینەوەیان بۆ (نهج البلاغة) كردووە، بۆ قورئان نەیانكردووە، ئەمە لە وتارو ئاخاوتنی هەموو زانایەكی شیعەدا بەدی دەكرێت، ئەمەش لە بەتاڵەوە نەهاتووە، بەڵكو پشت بە بنەمایەكی عەقیدەیی دەبەستێت ئەویش ئەوەیە كە لە ناخی هەموو شیعەیەكدا نهج البلاغە

له قورئان ڕاسترو ڕەوانترە! ئەوەتا لەو سەردەمەی کە سەید قوتب کتێبی (في ظلال القرآن)ی نووسی، زانایەکی شیعە کتێبێکی دەرکرد لە ڕاڤەی (نهج البلاغة)دا و ناوی نا "في ظلال نهج البلاغة".

**سێهەم:** بەو بەڵگەیەی کە قەببانچی نە دەیزانی ئایەتەکان بە جوانی بخوێنێتەوە، نە بە جوانی تەفسیر و ڕاڤەیان بکات، دەردەکەوێت ئەو کەسێکی پسپۆر نییە لەو بوارەداو ئەهلییەتی ئەوەی نییە تەفسیری قورئان بکات، چ جای قسە لە ڕەوانبێژی قورئاندا بکات، چونکە ئەوە بوارێکی زۆر تایبەتە و شارەزاییەك و پسپۆڕییەکی زۆری دەوێت، نەك هەرکەسێك هەڵسێت و دەمی لێبکوتێت.

**چوارەم:** ئەو نەك هەر نەزانە بە قورئان، بەڵکو خاوەنی لۆژیکێکی زۆر سەقەتیشە، هەڵەکانی ئەو لە ڕاڤەکردنی ئایەتەکاندا بەڕوونی دیارە، بێئاگاییەکەشی لە قورئان لەوەوە دەردەکەوێت کە سروشتی بەهەشت و ژیانی ئەهلی بەهەشت و سروشتی دۆزەخ و ژیانی ئەهلی دۆزەخی لە قورئاندا نەخوێندۆتەوە، بۆیە دەڵێ بەهەشت تەمەڵخانەیە و هیچ هەستێکی مرۆڤایەتی تێدا نییە و، وەکو تەویلەی ئاژەڵ وایە، تەنها خواردن و ڕابواردنە و ژیانی دۆزەخم پێباشترە، چونکە هەستی مرۆڤانەی تێدایە کە ئازار چەشتنە! ئەمە چ تێگەیشتن و چ لۆژیکێکە؟!

**پێنجەم:** ئەو گاڵتە بە هەندێك لە سورەتەکانی قورئان دەکات وەکو سورەتی (همزة) و (الرحمن)، لەو گاڵتەکردنەدا نەزانیی خۆی دەردەخات، ئەگینا بە گەڕانەوەیەك بۆ ئەو ئەو شتانەی لە تەفسیری ئەو دوو سورەتەدا وتراوە دەردەکەوێت ئەو چەند بێئاگاو ناشارەزایە، نەك تەنها لە ڕووی بەلاغەتەکەیەوە، بەڵکو لە چەندین ڕووەوە، لەوانە دەروونی و زانستی و کۆمەڵایەتی و... هتد.

**شەشەم:** لە کۆتاییشدا، ئەو کە بەراورد لە نێوان (نهج البلاغة) و قورئاندا دەکات با بێین بزانین ڕای خاوەنی (نهج البلاغة) کە ئیمامی عەلییە دەربارەی قورئان چییە؟ ئەگەر دەرکەوت کە عەلی دانی بە ڕەوانبێژی و باڵادەستی قورئاندا

ناوه له ڕووی ڕەوانبێژییەوە، ئەوکاتە قسەکانی قەببانچی له جێی خۆیاندا پووچەڵ دەبنەوە:

ئیمامی عەلی له چەند شوێنێکدا دەربارەی قورئان دەفەرموێت: عن علي رضي الله عنه قال: أَمَا إِنِّى قَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– يَقُولُ «أَلاَ إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ». فَقُلْتُ مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «كِتَابُ اللَّهِ فِيهِ نَبَأُ مَا كَانَ قَبْلَكُمْ وَخَبَرُ مَا بَعْدَكُمْ وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ هُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ مَنْ تَرَكَهُ مِنْ جَبَّارٍ قَصَمَهُ اللَّهُ وَمَنِ ابْتَغَى الْهُدَى فِى غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللَّهُ وَهُوَ حَبْلُ اللَّهِ الْمَتِينُ وَهُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ وَهُوَ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ هُوَ الَّذِى لاَ تَزِيغُ بِهِ الأَهْوَاءُ وَلاَ تَلْتَبِسُ بِهِ الأَلْسِنَةُ وَلاَ يَشْبَعُ مِنْهُ الْعُلَمَاءُ وَلاَ يَخْلَقُ عَلَى كَثْرَةِ الرَّدِّ وَلاَ تَنْقَضِى عَجَائِبُهُ هُوَ الَّذِى لَمْ تَنْتَهِ الْجِنُّ إِذْ سَمِعَتْهُ حَتَّى قَالُوا (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِى إِلَى الرُّشْدِ) مَنْ قَالَ بِهِ صَدَقَ وَمَنْ عَمِلَ بِهِ أُجِرَ وَمَنْ حَكَمَ بِهِ عَدَلَ وَمَنْ دَعَا إِلَيْهِ هُدِىَ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ». رواه الترمذي وهو حسن لغيره.

نیسبەتی ئەم ریوایەتە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) قسەی زۆری لەسەرەو زانایان گومانی زۆر دەبەن کە قسەی حەزرەتی عەلی بێت، ئێمەش ئەمەمان زیاتر مەبەستە.[١٩]

---

١٩. قال ابن كثير في تعليقه على هذا الخبر: "وقد وهم بعضهم في رفعه، وقصارى هذا الحديث أن يكون من كلام أمير المؤمنين علي - رضي الله عنه -". (انظر: ابن كثير/ فضائل القرآن: ص ١٥). وقد أخرجه مرفوعاً الترمذي، في ثواب القرآن، باب ما جاء في فضل القرآن رقم (٢٩٠٦): ١٧٢/٤، والدارمي في سننه، كتاب فضائل القرآن، باب فضل القرآن ص:٨٣١، ورواه الإمام أحمد في مسنده: ٧٠٣/٢ رقم (٧٠٤)، (تحقيق أحمد شاكر).

والحديث في سنده مقال. قال الترمذي: "هذا حديث لا نعرفه إلا من هذا الوجه، وإسناده مجهول، وفي الحارث (أحد رجال السند) مقال". (انظر: الترمذي: ١٧٢/٤)، وقال الحافظ ابن العربي المالكي: وحديث الحرث لا ينبغي أن يعول عليه. (انظر: عارضة الأحوذي: ٣٠/١١). قال الشيخ أحمد شاكر: إسناده ضعيف جداً من أجل الحارث. (انظر: المسند ٧٠٤/٢) وقال الشيخ الألباني: إسناده ضعيف، فيه الحارث

لەچەند شوێنێکی نهج البلاغەشدا دەفەرموێت:[20] "وَاَللَّهُ سُبْحَانَهُ يَقُولُ مَا فَرَّطْنا فِي اَلْكتاب مِنْ شَيْ ءٍ وَ فِيه تِبْيَانُ كُلِّ تِبْيَانٌ لِكُلِّ شَيْ ءٍ وَ ذَكَرَ أَنَّ اَلْكِتَابَ يُصَدِّقُ بَعْضُهُ بَعْضاً وَ أَنَّهُ لاَ اخْتِلاَفَ فِيه فَقَالَ سُبْحَانَهُ وَ لَوْ كانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اَللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلافاً كَثِيراً وَ إِنَّ اَلْقُرْآنَ ظَاهِرُهُ أَنِيقٌ وَ بَاطِنُهُ عَمِيقٌ لاَ تَفْنَى عَجَائِبُهُ وَ لاَ تَنْقَضِي غَرَائِبُهُ وَ لاَ تُكْشَفُ اَلظُّلُمَاتُ إِلاَّ بِهِ"(شرح النهج ج١ ص ٢٨٩).

"فَالْقُرْآنُ آمِرٌ زَاجِرٌ وَ صَامِتٌ نَاطِقٌ حُجَّةُ اَللَّهِ عَلَى خَلْقِهِ أَخَذَ عَلَيْهِ مِيثَاقَهُمْ وَ ارْتَهَنَ عَلَيْهِمْ أَنْفُسَهُمْ أَتَمَّ نُورَهُ وَ أَكْرَمَ بِهِ دِينَهُ...

"وَ إِنَّ اَللَّهَ سُبْحَانَهُ لَمْ يَعِظْ أَحَداً بِمِثْلِ هَذَا اَلْقُرْآنِ فَإِنَّهُ حَبْلُ اَللَّهِ اَلْمَتِينُ وَ سَبَبُهُ اَلْأَمِينُ وَ فِيهِ رَبِيعُ اَلْقَلْبِ وَ يَنَابِيعُ اَلْعِلْمِ وَ مَا لِلْقَلْبِ جَلاَءٌ غَيْرُهُ مَعَ أَنَّهُ قَدْ ذَهَبَ اَلْمُتَذَكِّرُونَ وَ بَقِيَ اَلنَّاسُونَ أَوِ اَلْمُتَنَاسُونَ "(نفس المصدر ص٣٢).

"وَ اعْلَمُوا أَنَّ هَذَا اَلْقُرْآنَ هُوَ اَلنَّاصِحُ اَلَّذِي لاَ يَغُشُّ وَ اَلْهَادِي اَلَّذِي لاَ يُضِلُّ وَ اَلْمُحَدِّثُ اَلَّذِي لاَ يَكْذِبُ وَ مَا جَالَسَ هَذَا اَلْقُرْآنَ أَحَدٌ إِلاَّ قَامَ عَنْهُ بِزِيَادَةٍ أَوْ نُقْصَانٍ زِيَادَةٍ فِي هُدًى أَوْ نُقْصَانٍ مِنْ عَمًى وَ اعْلَمُوا أَنَّهُ لَيْسَ عَلَى أَحَدٍ بَعْدَ اَلْقُرْآنِ مِنْ فَاقَةٍ وَ لاَ لِأَحَدٍ قَبْلَ اَلْقُرْآنِ مِنْ غِنًى فَاسْتَشْفُوهُ مِنْ أَدْوَائِكُمْ وَ اسْتَعِينُوا بِهِ عَلَى لَأْوَائِكُمْ فَإِنَّ فِيهِ شِفَاءً مِنْ أَكْبَرِ اَلدَّاءِ وَ هُوَ اَلْكُفْرُ وَ اَلنِّفَاقُ وَ اَلْغَيُّ وَ اَلضَّلاَلُ فَاسْأَلُوا اَللَّهَ بِهِ وَ تَوَجَّهُوا إِلَيْهِ بِحُبِّهِ وَ لاَ تَسْأَلُوا بِهِ خَلْقَهُ إِنَّهُ مَا تَوَجَّهَ اَلْعِبَادُ إِلَى اَللَّهِ تَعَالَى بِمِثْلِهِ وَ اعْلَمُوا أَنَّهُ شَافِعٌ مُشَفَّعٌ وَ قَائِلٌ مُصَدَّقٌ وَ أَنَّهُ مَنْ شَفَعَ لَهُ اَلْقُرْآنُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ شُفِّعَ فِيهِ وَ مَنْ مَحَلَ بِهِ اَلْقُرْآنُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ صُدِّقَ عَلَيْهِ فَإِنَّهُ يُنَادِي مُنَادٍ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ أَلاَ إِنَّ كُلَّ حَارِثٍ مُبْتَلًى فِي حَرْثِهِ وَ

---

الأعور، وهو لين، بل اتهمه بعض الأئمة بالكذب، ولعل أصله موقوف على علي - رضي الله عنه - فأخطأ الحارث فرفعه إلى النبي صلى الله عليه وسلم (انظر: اشرح الطحاوي، الطبعة التي خرج أحاديثها الألباني ص: ٦٨) وهذا الأثر مروي عن علي في كتب الشيعة: انظر: تفسير العياشي: ٣/١، البرهان: ٧/١، تفسير الصافي: ١٥/١، بحار الأنوار: ٧/١٩.﴾.

[20]. شرح نهج البلاغة / ابن ابي الحديد/ دار الكتب العلمية / بيروت / الطبعة الاولى١٩٨٨م تحقيق محمد عبد الكريم النمري.

عَاقِبَةِ عَمَلِهِ غَيْرَ حَرَثَةِ اَلْقُرْآنِ فَكُونُوا مِنْ حَرَثَتِهِ وَ أَتْبَاعِهِ وَ اِسْتَدِلُّوهُ عَلَى رَبِّكُمْ وَ اِسْتَنْصِحُوهُ عَلَى أَنْفُسِكُمْ وَ اِتَّهِمُوا عَلَيْهِ آرَاءَكُمْ وَ اِسْتَغِشُّوا فِيهِ أَهْوَاءَكُمْ غشه يغشه بالضم غشا خلاف نصحه واللأواء الشدة. (نفس المصدر).

ئایا کەس هەیە گومانی هەبێت لە ڕەوانبێژی کتێبی (نهج البلاغة)؟

جا ئەگەر ئەمە قسەی خاوەنی نهج بێت دەربارەی قورئان، ئیتر هەر قسەیەك بکرێت دەربارەی لەبەرتری (نهج البلاغة) لە قورئان لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە هیچ نرخ و ئەرزشێکی هەیە؟

ئەوەی دەڵێت (نهج البلاغة) لە قورئان ڕەوانبێژترە وەکو کەسێك وایە شارەزایی لە هونەری وێنەکێشاندا نەبێت، دوو تابلۆ ببینێت یەکێکیانی بەلاوە لەوی تریان جوان و باشتر بێت، دوایی بچێت بۆ لای ئەو وێنەکێشەی ئەم وێنەیەی کێشاوە بۆ ئەوەی ئەم بۆچوونەی خۆی پێ ڕابگەیەنێت، ئەویش لە وەڵامدا بڵێ تۆ بەهەڵەداچوویت و ناشارەزای، ئەگینا تابلۆکەی من ناگاتە قولەپێی ئەو تابلۆیەی تردا و ئینجا دەستبکاتە باسی نهێنی و وردەکارییەکانی ئەو تابلۆیە، ئەم قسەیەش لە تەوازوعەوە نەکات، بەڵکو قەناعەتی تەواوی پێی هەبێت، ئایا هەڵسەنگاندنی ئەو کەسە هیچ نرخێکی دەمێنێت؟!

دڵنیام کە نە عەلی، وەنە ئەوەیشی کە (نهج البلاغة)ی گێڕاوەتەوە ئەوە بەخەیاڵیاندا نەهاتووە کە کەسێك دێت و (نهج البلاغة)ی بەلاوە لە قورئان پێڕەوانتر دەبێت، ئەگینا یەکەم شت لە ڕێوە تەکفیریان دەکرد و هەردووکیان بەرائەتی خۆیانیان لێی ڕادەگەیاند و ڕوونکردنەوەیەکی زۆریان لەوبارەیەوە دەدا.

# کۆتایی

لە کۆتاییدا دەبێت ئەوە بڵێین کە قورئان مەترسی لە سەر نییە، دە ئەوەندەی دیکە هێرشی بکرێتە سەر جێ پێی لەق ناکرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە جێ پێی تا بێت قایمتر و جێگیرتر دەبێت، مێژووی ١٤٠٠ ساڵی قورئانیش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستییە، ئەم هێرشانە هیممەتی شارەزایان و پسپۆران لە غەمخۆرانی قورئان دەجولێنن بۆ ئەوەی نهێنی زیاتر لە قورئان دەربهێنن و زۆر لایەنی دیکەی گەورەییەکەی دەربخەن و ئەوانەشی کە هێرشی دەکەنە سەر ڕووڕەشی و پەشیمانییان لە دونیاو دواڕۆژدا بۆ بمێنێتەوە و ناتوانن باوەڕو متمانەی موسوڵمانان و ئەهلی قورئان بەم کتێبە پیرۆزە لەق بکەن، بەڵکو ئەوەندە هەیە، ئەوانەی پێ لە خشتە دەچن کە دڵەکانیان نەخۆشەو شیاوی چوونە بەهەشت نین: (فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ * مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ * إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ) (الصافات: ١٦١–١٦٣).

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە زۆربەی ئەوانەی ڕەخنە لە قورئان دەگرن، یان کەسانێکی دەمارگیرو چەواشەکارن، یان کەسانێکی سادەی فریوخوراون و هەردوولاش ئەو شارەزاییە ئەوتۆیەیانە نییە لە قورئان و زۆر بەزوویی هەڵەو چەواشەکارییەکانیان دەردەکەون، لەبەر ئەوە نابێت لەو جۆرە بەرنامانە بترسین، بەڵکو دەبێ تەحەددای ئەو جۆرە کەسانە بکەین کە هێرش دەکەنە سەر قورئان، بەتایبەت لە کوردستانی خۆماندا و دیراسەی گومان و ڕەخنەکانیان بکەین و زانستییانە و بێ هەڵچوون، وەڵامیان بدەینەوە.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە دەبێ هەوڵبدەین ئەو دەستانە بدۆزینەوە کە لەپشت ئەو جۆرە کەسانەوەن کە هێرش دەکەنە سەر ئیسلام، بۆ ئەوەی لە میانەی ئەو وەڵامانەدا کە دەدرێنەوە باسی بیروباوەڕی ئەو جۆرە کەسانە بکەین و لەگەڵ ئیسلامدا بەراوردیان بکەین بۆ ئەوەی خەڵکی گەورەیی ئیسلام و بچووکی ئەو ڕێبازو ئاینانەیان بۆ دەرکەوێت کە ئەو کەسانە لێوەی ئینتیلاق دەکەن.

## ڕاسپاردەکان:

لە کۆتاییدا پێشنیاز دەکەم ئەم جۆرە کۆنگرانە زیاتر بگیرێن، بەڵام لەگەڵ هەندێك تێبینیدا:

١. بابەتەکان زیندوو بن، واتە چارەسەری ئەو شتانە بکەن کە لە ئارادان.

٢. تایبەت بن بەو نووسین و نووسەرانەی بە کوردی شت بڵاودەکەنەوە.

٣. لەگەڵ زانکۆو ناوەندە زانستییەکاندا بگیرێن بۆ ئەوەی بارستاییەکی زیاتری هەبێت و مامۆستایان و خوێندکارانی زانکۆ لە نزیکەوە ئامادەی بن.

## مختصر البحث باللغة العربية:

هذه ورقة بحثية فكرية بالدرجة الاولى تطرقت فيها الى عدة امور الخصها كالآتي:

١. المقدمة.

٢. مدخل الى اسرار واعجاز القرآن، خلاصته ان القرآن كتاب مليء بالاسرار وهو فريد في كل جوانبه، ثوبه وشكله، كنهه وماهيته، مضمونه ومحتواه، اسلوبه وطريقته، رسالته ووظيفته، طبيعته وصفاته، واخيرا وليس آخرا في تأثيره.

وعليه فان حصر الاعجاز في مظهره وشكله الخارجي الذي هو بلاغته انتقاص له وتقليل من شأنه.

ثم الرد على القائلين بالصرفة واثبات ان ذلك يتضمن طعنا في الله ثم في القرآن.

٣. ثم تحدثت عن بعض صفات القرآن التي وردت على لسان القرآن والتي لها دلالات عميقة ومهمة كوصفه بالمجيد والكريم والحكيم والحق والمبين والمبارك والنور والروح..الخ

٤. تحدثت عن بعض ما يستند عليه الطاعنون في طعنهم في القرآن، من ذلك: روايات كتابة القرآن وجمعه وتدوينه وروايات الناسخ والمنسوخ وعلى رأسها الروايات الشيعية التي تطعن في القرآن مباشرة وتتهمه بحصول التغيير والنقصان فيه.

٥. ناقشت رأيين للمفكر الايراني عبد الكريم سروش، ذكرهما في مقال منشور على الانترنيت في موقعه سماه(الببغاء والنحل):

اولهما: قوله ان القرآن لم ينزل على رسول الله صلى الله عليه وسلم باللفظ، وانما نزل بالمعنى على قلبه، ثم صاغه الرسول بعباراته متأثرا ببيئته وواقعه التأريخي والاجتماعي وحالته النفسية والوجداني، وبالتالي فإن بعض اقواله غاية في البلاغة والسمو كآية " الله نور السموات والارض" وبعضها الاخرى غاية في الركاكة كسورة" تبت يدا ابي لهب وتب".

ثانيا: ناقشت رأيه حول سورة تبت يدا ابي لهب التي يقول عنها انها ركيكة وتعبر عن حالة الرسول النفسية والوجدانية السيئة واثبت بالدليل العقلي والمنطقي ان هذه السورة ليست غير ركيكة فحسب، بل انها تدل على ان القرآن نازل من عندالله وانه لم يحصل فيه أي تغيير.

٦. ناقشت رأيين لصاحب كتاب " هل القرآن معصوم":

اولهما: قوله ان القرآن يقر بان فيه اختلافا وتناقضا وذلك في قوله تعالى " ولو كان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا" فهذه الآية في زعمه تنفي الاختلاف الكثير وليس القليل مما يدل – بمفهوم المخالفة– على ان فيه اختلافا قليلا.

ثانيا: وجود اخطاء نحوية ولغوية في القرآن.

٧. ناقشت بعض تخرصات المعمم الشيعي العراقي احمد القبانجي لا سيما قوله ان القرآن ليس بليغا بل ان نهج البلاغة ابلغ من بعض سوره، فيعقد مقارنة بين سورة الهمزة ونص من نهج البلاغة يوصي فيه سيدنا علي ابنه الحسن رضي الله عنهما، ثم يتهكم بهذه السورة و بسور اخرى كسورة الرحمن، كما يتهكم بالجنة والنار..الخ، واثبت ان هذه الآراء كلها تدل على جهل اصحابها بالقرآن وغفلتهم عنه وبعدهم عنه.

٨. الخاتمة، وذكرت فيها ان لا خوف على القرآن فانه ينتصر على اعدائه وانه كلما زاد الطعن فيه زادت قوته وظهر فيه من الاسرار مالم يكن معروفا من قبل.

٩. ثم طلبت في التوصيات الإكثار من مثل هذه المؤتمرات ولكن ببحوث اكثر علمية وجدية وبالتعاون مع الجامعات لضمان مشاركة اكبر قدر ممكن من الاساتذة والطلبة. والحمد لله أولا وآخيرا.

# سەرچاوەكان:

١. القرآن الكريم

٢. ﴿اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان﴾- تأليف: محمد فؤاد بن عبدالباقي بن صالح بن محمد (المتوفى: ١٣٨٨هـ) عدد الأجزاء: ٣ أجزاء في مجلد واحد، الناشر: دار احياء الكتب العربية – محمد الحلبي (بدون طبعة و بدون تاريخ). ثم صوّره: – كما هو و بنفس ترقيم صفحاته وأحاديثه –: دار الحديث، القاهرة، بتاريخ: ١٤٠٧ هـ – ١٩٨٦ م، توزيع: دار الريان للتراث.

٣. الجامع الصحيح المسمى صحيح مسلم / الناشر: دار الجيل بيروت + دار الأفاق الجديدة ـ بيروت.

٤. الجامع الصحيح سنن الترمذي/ محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي. الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت. تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون.

٥. مباحث في علوم القرآن / مناع القطان. الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع. الطبعة: الطبعة الثالثة ١٤٢١هـ – ٢٠٠٠م.

٦. البرهان في علوم القرآن. المؤلف: محمد بن بهادر بن عبد الله الزركشي أبو عبد الله. الناشر: دار المعرفة – بيروت، ١٣٩١. تحقيق: محمد أبو الفضل إبراهيم. عدد الأجزاء: ٤.

٧. الإتقان في علوم القرآن، المؤلف: عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي (المتوفى: ٩١١هـ)، المحقق: محمد أبو الفضل إبراهيم، الناشر: الهيئة المصرية العامة للكتاب، الطبعة: ١٣٩٤هـ/ ١٩٧٤م.

٨. . الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٩/ تأليف أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الظاهري/ الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت/ الطبعة الأولى، ١٤٠٦تحقيق: د. عبد الغفار سليمان البنداري.

٩. هل القرآن معصوم/ عبد الله عبدالفادي. وەرگێڕ و شوێنی چاپ و ناوی چاپخانه نەزانراوە.

١٠ . التحرير والتنوير المعروف بتفسير ابن عاشور، المؤلف: محمد الطاهر بن محمد بن محمد الطاهر بن عاشور التونسي (المتوفى: ١٣٩٣هـ). الناشر: مؤسسة التاريخ العربي، بيروت – لبنان. الطبعة: الأولى، ١٤٢٠هـ/٢٠٠٠م.




# ڕۆژهەڵاتناسان و هەڵبەستراوەکانیان سەبارەت بە ئیسلام

**پ. ی. دکتۆر موحەممەد زەکی مەلا حسێن بەرواری**

**زانکۆی زاخۆ – کۆلێژی پەروەردە – بەشی خوێندنی ئیسلامیی**

# پێشەکی

**بسم الله الرحمن الرحيم**

سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی کە گەردوونی ڕووناککردووەتەوە بە نووری ئیسلام و ژیریی مرۆڤەکانی پرشنگدار کردووە بە نووری ئیمان. ئەو کەسەی قورئانی دابەزاندووە و هەر خۆی دەیپارێزیت بە بەردەوامی، ئەو کەسەی مرۆڤایەتیی ڕزگار کرد لە گومڕایی و وەهم و وەسوەسەی شەیتان و ئادەمیان. درووود و سەلام لەسەر مامۆستای مرۆڤایەتی و بونیاتنەری شارستانیەت، نێردراو بە ڕەحمەت و بەرنامەی گونجاو بۆ هەموو کات و شوێنێك، درووود بۆ سەر ئال و بەیت و هاوەڵانی پارێزەری بیروباوەڕی پاك بێت، هاوەڵانێك کە زانست و زانیارییان گەیاند، درووود لەسەر ئەو زانایانەش کە لەسەر بەرنامەی باشترینی مرۆڤایەتی دەڕۆن.

دوای سوپاس و ستایش: بێگومان بەریگردن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام واجبی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە، هەر لەبەر ئەوە ویستم سەبارەت بە ئەم بابەتە (ڕۆژهەلاتناسان و هەڵبەستراوەکانیان سەبارەت بە ئیسلام) بنووسم، توێژینەوەکەشم بەو شێوەی خوارەوە داڕشتووە:

بەشی یەکەم: ناساندنی ڕۆژهەلاتناسان و ڕۆژهەلاتناسی.

باسی یەکەم: سەرهەڵدانی ڕۆژهەلاتناسی و قۆناغەکانی

باسی دووەم: هۆکاری سەرهەڵدانی ڕۆژهەلاتناسی و ڕای زانایان لەسەری.

باسی سێهەم: گرنگترین ئەو دەوڵەت و لایەنانەی پەیوەستن بە ڕۆژهەلاتناسییەوە.

بەشی دووەم: پاڵنەرەکانی ڕۆژهەلاتناسی.

باسی یەکەم: چین و گرووپەکانی ڕۆژهەڵاتناسان.

باسی دووەم: ئامانجەکانی لیکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان.

بەشی سێهەم: هەڵبەستراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان سەبارەت بە ئیسلام.

باسی یەکەم: شایەتی و دانپێدانانی زانایانی ویژدانزیندووی ڕۆژئاوا بە گەورەیی ئیسلام.

باسی دووەم: تەواوی ئەو کەلێن و کەم و کووڕی و هەڵە مەنهەجییانەی کە لە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکاندا هەن سەبارەت بە ئیسلام.

# بەشی یەکەم:
# ناساندنی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژهەڵاتناسان

## ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕووی زمانەوانییەوە:

وشەی ڕۆژهەڵاتناسی هەڵێنجراوی وشەی ڕۆژهەڵاتە، مەبەست لێی ئەو شوێنەیە کە ڕۆژی لێ هەڵدێت و واتای وشەکەش: لێگەڕان و دواکەتنی ئەوەی لە ڕۆژهەڵات هەیە[١].

شایەنی باسە دەستەواژەی ڕۆژهەڵات سەرەتا لە لایەن بیرمەندە ڕۆژئاواییەکانەوە بەکارهاتووە، ئەوان بوون کە جیهانیان دابەش کردووە بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، ڕۆژهەڵاتیشیان کردووە بە سێ بەشەوە: نزیك و ناوەڕاست و دوور. لە بەکارهێناندا وشەی ڕۆژهەڵات مەبەست پێی وڵاتانی ئاسیا و ناوچەی عەرەبی و ئەفریقییە. ئێستاش زاراوەیەکی تر لە جێگای ڕۆژهەڵات بەکاردێنن ئەویش (جیهانی نوێ)ە (العالم الحديث).

## ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕووی ناوەرۆکەوە:

وشەی ڕۆژهەڵاتناسی بەو هەوڵانە دەوترێت کە بیرمەندانی ڕۆژئاوا دەیدەن بۆ زانینی بنەماکانی فیکری ئیسلامی و شارستانیەتی ئیسلامی و زانست و کەلتووری گەلانی ڕۆژهەڵات.

کەوابوو ڕۆژهەڵاتناسی: زانستێکە لیکۆڵینەوە دەکات لەسەر زمان و کەلتوور و شارستانیەت و کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵات لە ڕووی مێژوویی و سەردەمی

---

[١] بڕوانە ماددەی: (الشرق) لسان العرب، ج٢/ ٣٣، والمصباح المنير، ج١، ٣٣٢، ومختار الصحاح، ص٣٣٦.

ئێستاشی[2]. بە واتایەکی تر: لێکۆڵینەوەی توێژەرانی غەیری ڕۆژهەڵاتە لەسەر شارستانیەتی ڕۆژهەڵات و ئایینەکانی و زمانەکانی و مێژوو و زانستەکانی و ڕێڕەوە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانیان و بە تایبەتی تر لەسەر ئیسلام و کاروباری موسڵمانان لە سەردەمە جیاوازەکاندا[3]. هەندێك کات ڕەنگە بە ڕۆژهەڵاتناس بوتریت عەرەبناس، بەڵام ئەم دەستەواژەیە ناکرێت بە گشتی بەکاربێت، چونکە ڕۆژهەڵاتناسان کاریان لەسەر غەیری عەرەب کردووە و ڕۆژهەڵاتناس فراوانترە لە عەرەبناس. هەروەها ناکرێت هەموو مێژووناسی ئەوروپی بە ڕۆژهەڵاتناس لەقەڵەم بدرێت، بەڵکو تەنها ئەوانەی کە گرنگییان داوە بە کەلتووری ڕۆژهەڵات، هەتا ئەگەر زمانەکەشیانی نەزانیبێت.

ناوزەدکردنی هەندێك لە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بە (زانست) — ئەوانەی بابەتەکەیان شارستانیەتی ئیسلامییە— کەمتەرخەمییەکی زۆری تێدایە، چونکە وەك ئاشکرایە وشەی زانست بەو ڕاستیانە دەوترێت کە سەلمێنراون و گومانیان تێدا نییە، ئەگەر لە غەیری ڕاستیی سەلمێنراویشدا بەکارهاتبێت، ئەوە بەو دەرەنجامانە وتراوە کە گومانی ڕاستێتییان هەیە. کێشەکە ئەوەیە کە ئەو لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییانەی سەبارەت بە ئیسلام کراون، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بابەتگەلێکن دوور و نزیك پەیوەندییان بە ڕاستییەوە نییە، هەر لەبەرئەوەیە کە ناکرێت بە زانست ناوزەد بکرێن، ئەم ڕایەش دراوەتە پاڵ دکتۆر

---

[2] بڕوانە: (الدراسات العربية والإسلامية في الجامعات الألمانية)، ل١٢ و دواتر.

[3] بڕوانە: تاريخ الأدب العربي، أحمد حسن الزيات، ص٥١٢، ومجلة الشريعة والدراسات الإسلامية بمكة العدد الخامس، ص٢٦، وتطور الاستشراق في التراث العربي، د. ناجي، ص٢٣، والاستشراق الخلفية الفكرية للصراع الحضاري، د. زقزوق، ص١٨.

ئیدوارد سەعید کە پێی وایە ڕۆژهەڵاتناسی نەشارەزایە بە بابەتەکەی خۆی و بابەتگەلێکی بێ بنەمایان بۆ خۆیان دروستکردووە[٤].

لەگەڵ ئەمەشدا، لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان مەرجی لێکۆڵینەوەی زاستییان تێدا نییە و لەسەر بنەمای بێلایەنی بونیات نەنراون لە بابەتە ئیسلامییەکەیاندا. گومانی تێدا نییە گەر بوترێت: ڕۆژهەڵاتناسان یان لە خزمەتی بەگاورکردندا بوون (التنصیر) یان لە خزمەتی ئیستیعمار و زایۆنیزمدا بوون، یان لە خزمەتی هەر سیانیاندا بوون، وە لە هەر یەك لەم حاڵەتانەدا ناتوانن بێلایەن بن، هەتا ئەگەر لەو جۆرانەش نەبوون، تواناى تێگەشتنی تەواوی زمانی عەرەبییان نەبووە و نەیانتوانیوە پەی بە واتا نهێنییەکانی بەرن، کە ئەمەش ڕێگرە لە گەیشتن بە ڕاستی[٥].

ڕۆژهەڵاتناسی – هەرچۆنیك بێت – زانستێکە کە بیانییە بە زاراوە زانستییەکانی خۆمان و پەروەردەی وڵاتانی غەیری ڕۆژهەڵاتە. ناکرێت ڕۆژهەڵاتناسی زاراوەی زانستی بە بەردا بکرێت، تەنها کاتێك نەبێت کە بێلایەن بێت و گوزراشت لە راستی و دەرەنجامە زانستییە سەلمێنراوەکان بکات، بەڵام کاتێك ڕۆژهەڵاتناس لە ڕێڕەوی زانستی و بێلایەنبوون لایدا، بە تایبەتی لێکۆڵینەوەکانیان سەبارەت بە ئیسلام، ناکرێت بە زانست ناوزەد بکرێت بە گوێرەی پێوەرە زانستییە دیارەکان، چونکە لەم حاڵەتەدا ڕۆژهەڵاتناسی دەبێتە ئامرازێك بۆ دابینکردنی ئامانجی گڵاو، بۆ تانەدان لە بەها و بنەما و پەیڕەو

---

[٤] مناهج المستشرقين، د. الساموك، الهامش ٨. وحقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام منذ ظهوره إلى نهاية الألفية الثانية، د. محمد بهاء الدين، ص٣.

[٥] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص٣.

پرۆگۆامی ئایینی ئیسلام و ئەمەش وەك خزمەتێك بە گاورکردن یان ئیستیعمار یان زایۆنیزم، یاخود وەك خزمەتێك بە هەموویان[٦].

وشەی (ڕۆژهەڵاتناس)یش بەو بیرمەندانە دەوترێت کە لێکۆڵینەوەیان کردووە لەسەر زانست و مێژوو و شارستانیەت و کاروباری کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووریی ڕۆژهەڵات کردووە و هەندێکیش بەم شێوە پێناسەیان دەکات ((نووسەرانی ڕۆژئاوا کە سەبارەت بە فیکری ئیسلامی و شارستانیەتی ئیسلامی دەنووسن))[٧]. جگە لەمانەش پێناسەی تر زۆرن کە لە ناوەڕۆکدا زۆر جیاواز نین لەم واتایە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا وادیارە کە ڕۆژهەڵاتناسان خۆیان حەشارداوە لە پشت ناونیشانی زانستی و چەندین جۆری تر، لە ترسی ئەوەی کە ڕووی ڕاستەقینەیان بەدەرکەوێت و ئەمەش شتێکی نامۆ نییە لە ڕۆژئاوادا، بەمشێوەیەش دەتوانن ڕۆڵی کاریگەرتر ببینن و چالاکیی زیاتر ئەنجام بدەن.

---

[٦] سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

[٧] إنتاج المستشرقين وأثره في الفكر الإسلامي، مالك بن نبي، ص٧.

## باسی یەکەم:

## سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی و قۆناغەکانی

توێژەرەوان بە گشتی کۆکن لەسەر ئەوەی کە بزووتنەوەی ڕۆژهەڵاتناسی لە کۆتاییەکانی سەدەی دەهەم و سەرەتاکانی سەدەی یانزەهەمی زایینی سەری هەڵدا لە فەرەنسا و قەشەی فەرەنسی (جربر دی أولیاك ٩٣٨-١٠٠٣م) یەکێك بووە لە یەکەمەکان کە سەرقاڵ بووە بە زانیاریی ڕۆژهەڵاتەوە، کاتێك ئەم قەشەیە لە فەرەنساوە دەچێت بۆ ئیسپانیا کە لانکەی شارستانیەتی ئیسلامی بوو لەو کاتەدا و لەوێ فێری زمانی عەرەبی دەبێت و هەروەها فێری زانستی موسڵمانان دەبێت لە بوارەکانی ماتماتیك و پزیشکی و فەلەك و کیمیا و فەلسەفەدا و هەندێکیش لە زانستی ئایینی فێردەبێت، دواتر کۆچ دەکات بۆ ڕۆما کە سەنتەری پاپایەتییە و لەوێ ناوبانگ دەردەکات بە زانستە فراوانەکەی سەبارەت بە زمانی عەرەبی و زانستەکانی موسڵمانان، دواتر هەڵدەبژێردریت وەك پاپا لەژێر ناوی سلفستەری دووەم (٩٩٩-١٠٠٣ ز). بەم شێوەیە یەکەم فەرەنسییە کە کورسیی پاپایەتی وەرگرێت. دواتر هەستا بە وەرگێڕانی چەند پەرتووکێکی عەرەبی لە بواری ماتماتیك و فەلەکدا و بووە هۆکاری بڵاوبوونەوەی ژمارەی عەرەبی لە ئەوروپا، کە ژمارە سفر یان نەبوو هەتا ئەو کاتە و بووە هۆی چارەسەری زۆرێك لە کێشە ماتماتیکییەکان[٨].

لە دوای ئەو ئەم ڕۆژهەڵاتناسانە هاتن: قوستەنتینی ئەفریقی (١٠٨٧ز) و بوترسی المحترم (١٠٩٢-١١٥٦ز)و أرجودی سانتلا (١١٠٧ز) دواتر جیراد کریمون (١١١٤- ١١٨٧ز) هات و دواتر ژمارەیان زۆربوو، لە هەموو ڕەگەزەکانی تێدا دروست بوو، بە شێوەیەك زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکای سەردەمی ئێستای گرتەوە.

---

[٨] بڕوانە: المستشرقون، العقیقي، ج١٢، ١- وما بعدها.

لە سەرتاوە سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی تەنها مەبەستێکی ئایینیی لە پشتەوە بوو، بەڵام دواتر فراوان بوو بە شێوەیەك ڕۆژهەڵاتناسان مەبەستی سیاسی و زمانەوانییان تێکەڵ کرد. توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان سەبارەت بە ئیسلام بە ئاماژە و ویستی کەنیسەی کاسۆلیکی دەستی پێکرد، بۆ تانەدان لە بەرنامەی ئیسلام و دژایەتیکردنی بەهاکانی، بە مەبەستی پاراستنی مەزهەبی (کاسۆلیکی) لە لایەك و قەرەبووکردنەوەی تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانیان لە شەڕەکانی خاچپەرستیدا بۆ رزگاکردنی قودس لە لایەکی تر، دواتر ئیستیعماری ڕۆژئاوا ئەم لێکۆڵینەوانەیان لە زانکۆکاندا کردە بابەتی خوێندن و زانستی[٩].

بەڵام مێژووی سەرەتای دەسپێکی ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕۆژئاوا، لە ساڵی (١٣١٢ز)[١٠] بوو، کاتێك مەجمەعی کەنەسی لە ڤییەنا بە فەرمی بڕیارێکی دەرکرد بە تەرخانکردنی چەند پۆستیکی فێرکردنی باڵا لە بوارەکانی عەرەبی و یۆنانی و عیبری و سریانی، لە زانکۆکانی پاریس و ئۆکسفۆرد و پۆلۆنیا و افینیون و سلامنکا. لە ئەوروپای ئێستادا ڕۆژهەڵاتناسی بووە بە بابەتێکی زانستیی دانپێدانراو لە لایەن هەموو لایەك و لە هەموو زانکۆکانیاندا دەخوێندریت و هەروەها کۆمەڵگەی ئەورووپی لە ڕێگای حکومەت و پەرلەمانەکانیانەوە توانایەکی تەواوی مادی و مەعنەوی دابین دەکەن بۆ ڕۆژهەڵاتناسان بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکانیان[١١].

---

[٩] بڕوانە: الفكر الإسلامي الحديث، د. محمد البهي، ص٩ وما بعدها.

[١٠] الاستشراق: إدوارد سعيد، ص٨٠، والإسلام دين المستقبل، روجيه، ص١٧٤.

[١١] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص١٩.

## باسی دووەم:

## هۆکاری سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕای زانایان لەسەری

بەپێی ڕای لێکۆڵەرەوان، هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی و توێژینەوەکانیان سەبارەت بە ئیسلام، دەگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتەرێك، لەوانە:

١- جەنگەکانی خاچپەرستی: سەرەتای دەسپێکی ڕۆژهەڵاتناسی هۆکارەکەی جەنگی خاچپەرستی بوو، کاتێك بەریەککەوتنی سیاسی و ئایینی ڕووی دا لە نێوان ئیسلام و مەسیحیەتی ڕۆژئاوا لە فەلەستین، بەڵگەی ئەوانەش کە ئەم ڕایەیان هەیە: دژایەتیی نێوان ئیسلام و مەسیحیەتی ڕۆژئاوا زۆر توند بوو لە کاتی نورەددین زەنکی (و١١٧٤ز) و سەلاحەددینی ئەیوبی (١١٣٨-١١٩٣ز) و دوای شکستە یەك لە دوای یەکەکانیان، ڕۆژئاوا ویستی تۆڵەی ئەو شکستانە بە ناشیرینکردنی وێنای ئیسلام و وێنای پێغەمبەرەکەی بکاتەوە، بە چەندین تۆمەت و شێوازی جۆراوجۆر[١٢].

٢- ئەوروپا پێویستی بەوەبوو بەرپەرچی ئیسلام بداتەوە لە لایەك و لە لایەکی تر ڕۆژهەڵاتناسی بۆ ئەوەبوو تا نهێنیی هێزی موسڵمانانی بۆ دەرکەوێت، بە تایبەتی دوای ڕزگارکردنی قوستەنتینیە لە ساڵی (١٤٥٣ز) کاتێك موسڵمانان گەشتنە کەنارەکانی ڤییەننا و بوونە بەربەستێکی بەهێز لەبەردەم بڵاوبوونەوەی مەسیحیەتدا[١٣].

٣- دوای داگیرکردنی هەندێك لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی دوور، ناوڕاست و نزیك و باکووری ئەفریقا لە لایەن ئیستیعماری ئەوروپیەوە، پێویستیان بەوەبوو لە کەلتوور و ئایینی ئەو گەلانە تێبگەن، بۆ چەسپاندنی

---

[١٢] الاستشراق بين الموضوعية والافتعالية، د. السامرائي، ص٢٠.

[١٣] التبشير والاستعمار للدكتورين خالد وفروخ، ص٣٧.

دەسەڵاتی خۆیان، وڵاتانی ئیستیعمار پاڵپشتیی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانیان کرد لە زانکۆکانیاندا و گرنگییان پێدا[١٤].

٤- کاتێك جەنگی خاچپەرستی سەرکەوتوو نەبوو لە بەدەستهێنانی مەرامەکانی بە شێوازی سەربازی، ئەوروپا بیری لە ئەلتەرناتیڤێك کردەوە کە ئەویش ڕۆژهەڵاتناسی بوو، بۆ زاڵبوون بەسەر موسڵماناندا، بە داگیرکردنی فیکری (الغزو الفكري) ئەویش بە پیلانێکی دارێژراو و تەکتیکاتی پێشکەوتوو. بەمشێوە ڕۆژهەڵاتناسان لە خزمەتی ئمپریالیستیدا بوون بۆ بێهێزکردنی موسڵمانان و دواتر زاڵبوون بەسەریدا لەڕووی ئابووری و سیاسی و فیکرییەوە.

٥- هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان، ڕۆژهەڵاتناسییان کردووەتە ئامرازێك بۆ تێرکردنی ئارەزووە تایبەتییەکانی خۆیان لە گەشتکردن، یاخود ئاشنابوون بە کەلتووری جیهانی دێرین، کۆمەڵێکی تر ڕۆژهەڵاتناسییان وەك پەیداکردنی ڕۆزی بەکارهێناوە، یاخود وڵاتانی خۆیانیان جێهێشتووە کاتێك توانای زانستییان زۆر بێ نرخ بووە بەرامبەر زاناکانی بوارەکانی تر، یان خۆدزینەوە بووە لە بەرپرسیارێتیی ئایینییان لە کۆمەڵگە مەسیحییەکانی خۆیاندا[١٥].

## قۆناغەکانی نووسینی ڕۆژهەڵاتناسان:

دەکرێت قۆناغەکانی نووسینی ڕۆژهەڵاتناسان بکرێت بە سێ قۆناغەوە:

### قۆناغی یەکەم: قۆناغی پێشەنگ:

دەسپێکی نووسینەکان سەبارەت بە موسڵمانان لە لایەن کۆمەڵێك زانای پێشەنگەوە بوو، کاتێك گەشتیان کرد بۆ وڵاتانی عەرەبی و ئیسپانیا و کەوتنە

---

[١٤] مناهج المستشرقين، د. الساموك، ص١٥.

[١٥] بڕوانە: المستشرقون، نجيب العقيقي، الصفحات: ١٩، ٢٨، ٤٠ و دواتر، بە دەستکارییەوە. حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام، د. محمد بهاء الدين، ص٢٥.

ژێر کاریگەریی شارستانیەتی ئیسلامییەوە و زمانی عەرەبی فێربوون و کتێبەکانیان وەرگێڕایە سەر زمانی خۆیان، بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی شارستانیەتی ئەوروپا و رزگارکردنی لەو تاریکییەی باڵی کیشابوو بە سەریدا. لە دیارترینی ئەو زانایانە لەم بوارەدا (جربردی أولیك ٩٣٨–١٠٠٣ز) و یۆحەننای کوڕی داودی ئیسپانی و یۆحەننای ئیشبیلەیی و ڕۆجەر بیکۆن و چەندانی تر[١٦].

**قۆناغی دووەم: قۆناغی دوای لەدەستدانی غەرناتە:**

کاتێك موسڵمانان دەرکران لە غەرناتە لە ساڵی (١٤٩٢ز)، خوێندنی زانستە ڕۆژهەڵاتییەکان و وانە وتنەوە بە عەرەبی، قەدەغە کرا، بەڵام ئەمانە لە ڕۆما دەستی پێکردەوە، ڕەنگە دەستپێکردنەوەی مەبەست لێی ئاسانکاری بووبێت بۆ کاری بەگاورکردن (التنصیر)، چونکە تێگەشتن لە ئیسلام باشترین ئامرازی بەرپەرچدانەوەی فیکری ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت بوو لە وڵاتانی ئیسلامیدا. هەڵوێستی ڕۆژهەڵاتناسان لەم قۆناغەدا زۆر دوژمنانە بوو لە دژی ئیسلام، تا کار گەشتە ئەوەی ئیسلام بە دوژمنی خودا لەقەڵەم بدەن.

هەوڵی مامۆستا (ریجرسیمون) جێگای ڕێزە کاتێك لە پەرتووکێکی بەنرخدا ئیسلامی ڕوونکردووەتەوە لە ساڵی (١٦٨٤ز)دا و تێیدا باسی ڕۆژهەڵات و مەسیحیەت دەکات و هەوڵی ڕوونکردنەوەی عەقیدەی ئیسلامی و عیبادەتەکان و چەندین لایەنی تری داوە و هێرشی نەکردووەتە سەر ئیسلام، بەڵکو زۆرجار بە باشە باسی کردووە، لەوشتانەدا کە لە ئیسلامدا بە باشتری زانیوە وەك لە مەسیحیەتدا. ڕەنگە ئەم هەوڵدانە بۆ زانینی ڕاستی سەبارەت بە ئیسلام، لەوەوە سەرچاوە گرتبێت کە سەرچاوەی ئیسلامیی بەکارهێناوە بۆ زانیارییەکانی، هەروەها پەرتووکێکی تری لەسەر هەمان ڕێچکە لە ساڵی (١٦٩٧ز)دا نووسیوە

---

[١٦] بڕوانە: المستشرقون، العقیقي، ج١، ١٢٠ دواتری، والمستشرقون ومصادر التشریع الإسلامي، د.النشمي، ص١٠ و دواتری.

لەسەر ژياننامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بە باشە باسی دەكات، پێچەوانەی نووسینەكانی پێشتری لەسەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)[17].

دواتر بە ڕوونی كاریگەریی شێوازی نووسینی مامۆستا (ریجرسیمون) سەبارەت بە ئیسلام لەسەر نووسینی نووسەرانی دوای خۆی دەركەوت، بە شێوەیەك نووسینی ڕۆژهەڵاتناسەكان لایەنی بابەتییانەی (الموضوعیة) تێدا دەركەوت، لە ساڵەكانی دوای (١٧٠٠ز) وە، تا ئەو ڕادەیەی هەندێك لە ڕۆژهەلاتناسان بە باشە باسی ئیسلامیان دەكرد و لایان پەسەند بوو، هەندێكیان بە ئاشكرا ئەوەیان ڕاگەیاند كە جیاواز لە عەقیدەی مەسیحی، عەقیدەی ئیسلامی لە ڕووی لۆجیك و فیكرییەوە دروستە و بەجێیە[18]. لە ساڵی (١٧٣٤ز)یشدا تەرجەمەیەكی قورئانی پیرۆز هاتە كایەوە لەسەر دەستی ڕۆژهەلاتناس (جۆرج سیل) كە پێشەكیەكی بۆ دانابوو لەگەڵ ڕوونكردنەوە لە هەندێك شوێندا، دواتر زانای ئەڵمانی (رایسكە ١٧١٦-١٧٧٤ز) هات و لە نووسینەكانیدا ئاماژەی بە ڕاستییە خوداییەكان (الحقائق الالهیة) كرد كە لە ئیسلامدا هەن، بەدوای ئەودا مامۆستا (سیمون أوكلی) هات و پەرتووكێكی دانا و تێیدا گرنگیی فیكری ئیسلامی بەرز نرخاند، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە كە مامۆستا (سلفستەر دی ساسی) یەكەم كەس بوو كە پەرتووكێكی دانا و توێژینەوەیەكی دروست و بێلایەن بوو سەبارەت بە ئیسلام، بە بێ كەوتنە ژێر كاریگەریی عەقیدە و فیكری مەسیحییەوە، وەك ئەوانەی پێش خۆی. هەر ئەم ڕۆژهەلاتناسە بەهۆی نووسراوەكانیەوە سەبارەت بە ئیسلام، بووە سەرچاوەی

---

[17] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص٢٩، ٣٠.

[18] بڕوانە: المستشرقون ومصادر التشريع الإسلامي، د. النشمي، ص١٧ و دواترى.

ئەوروپییەکان بۆ لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و دەرگای کردەوە بە ڕووی ڕۆژهەڵاتناسانی غەیری مەسیحی، بۆ چوونە ناو ئەو بوارەی توێژینەوە[19].

**قۆناغی سێهەم: قۆناغی دوای ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی:**

ئەم قۆناغە، قۆناغی دژایەتیی ئاشکرایە، بە جۆرێك کە ڕق و کینە و هەوا و ئارەزوو و دەمارگیری، لای ڕۆژهەڵاتناسان زاڵ بوو بوو بەسەر عەقڵ و ڕاستی و بێلایەنی، ئەمەش کاتێك بوو کە ئەوروپییەکان مملانێیەکی زۆریان هەبوو لەسەر مەسەلەی ڕۆژهەڵات لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا و مەبەستیش لە ڕۆژهەڵات خەلافەتی ئیسلامی بوو لە ئەستەنبووڵ کە پایتەختی خەلافەتی عوسمانی بوو. نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان هەستان بە وێناکردنی ئیسلام نەك وەك دوژمنێکی مەسیحیەت بە تەنها، بەڵکو وەك دوژمنی زانست و پێشکەوتن و شارستانیەت، چەندین تانە و تۆمەتی وەك کۆنەپەرستییان دایە پاڵ و دەستیان دایە پێشکەشکردنی ئەلتەرناتیڤ بۆ ئیسلام و ڕزگارکردنی موسڵمانانان لەو بارودۆخە نالەبارەی تێیدان، ئەلتەرناتیڤەکەش وەرگرتنی کەلتوور و شارستانیەتی ئەوروپییە[20].

---

[19] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص٣١.

[20] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

## باسی سێهەم:

## گرنگترین ئەو دەوڵەت و لایەنانەی پەیوەستن بە ڕۆژهەڵاتناسییەوە

گرنگترین ئەو لایەنانەی پەیوەستن بە ڕۆژهەڵاتناسییەوە ئەمانەن:

١- کەنیسە و دێرەکان، کە قەشە و پیاوانی خۆیان دەنارد بۆ وڵاتانی ئیسلامی بۆ ئاشنابوون بە فیکری ئیسلامی، هەتا بتوانن خاڵی خەتەرناك بە نسبەت مەسیحیەتەوە دیاری بکەن و هەوڵی ولاّمدانەوە و ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی بکەن.

٢- ئەو دامودەزگایانەی بە تایبەت بۆ ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە دروستکرابوون لە ئیسپانیا لەسەر شانی قەشە و نێردە مژدەدەرەکان (منصرين) لە ئیشبیلیە و بەرشلۆنە و دواتر پەرەی سەند و بوون بە زانکۆ، نموونەی زانکۆکانی (بلنسيه) و (لشبۆنه) و چەندانی تر.

٣- یەکەمین دامەزراوەی پێشەنگ لە توێژینەوەی ئیسلامیدا ئەو دامەزراوەیە بوو کە لە لایەن (ڕیمۆندی یەکەم)ەوە گەورەی قەشەکان (١١٢٦-١١٥١ز) دامەزرا لە شاری گلیگلە لە ئیسپانیا.

بە نیسبەت ئەو وڵاتانەی کە گرنگییان دەدا بە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتییەکان و تا ئێستاش گرنگی دەدەن، وڵاتانێکی زۆرن و لەوانە:

١- هۆڵەندا ٢- بەریتانیا ٣- فەڕەنسا ٤- ئەمریکا ٥- ئەڵمانیا ٦- ئیتاڵیا ٧- ئیسپانیا ٨- نەمسا ٩- دانیمارك ١٠- یەکێتیی سۆڤیەت (جاران). جگە لەمانەش هەندێك وڵاتانی تر هەن کە گرنگی بە ڕۆژهەڵاتناسی دەدەن و ڕۆژهەڵاتناسانیان لێکۆڵینەوە دەکەن سەبارەت بە شارستانیەتی موسڵمانان[٢١].

---

[٢١] بڕوانە: المستشرقون، العقيقي، ج٣/ ١٩٢٠ وما بعدها، ومناهج المستشرقين، د. الساموك، ص٤٢ نقلاً عن الدراسات العربية الإسلامية في الاتحاد السوفياتي وعن الاستشراق السوفياتي والتراث العربي، وحقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام..، د. محمد بهاء الدين، ص٤٠ وما بعدها.

## ئیستیعماری و ڕۆژهەڵاتناسی:

وڵاتانی ئیستیعمار توانیوانە کۆمەڵێك لە ڕۆژهەڵاتناسان بەکاربهێنن بۆ مەرامی خۆیان و وەدەستهێنانی ئامانجەکانیان و جێگیرکردنی دەسەڵاتیان لە وڵاتانی ئیسلامی، بەم شێوە پەیوەندییەکی توند و تۆڵ هەیە لە نیوان ڕۆژهەڵاتناسی و داگیرکەران، تا ئەو ڕادەی هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان بوونە داردەستی داگیرکەران و بوونە ئامرازێك بۆ زەلیلکردنی موسڵمانان و بێهێزکردنی ئیسلام و نەهێشتنی بەها و بنەماکانی، هەرچەندە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسە بێلایەنەکان و خاوەن ویژدانەکانیان هەستیان بە شەرمەزاری دەکرد لە بەرامبەر ئەو کارەدا، هەروەك ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیی سەردەم (استفان فیلد) دەڵێت: ((لەوەش قێزەونتر ئەوەیە کە کۆمەڵێك هەن خۆیان ناوناوە ڕۆژهەڵاتناس و زانست و زانیارییەکانیان سەبارەت بە ئیسلام و مێژووەکەی بەکارهێناوە لە دژایەتیکردنی ئیسلام و موسڵماناندا، ئەمەش ڕاستییەکی بەئازارە کە دەبێت ڕۆژهەڵاتناسە ڕاستەقینەکان بە ڕاشکاوانە دانی پێدا بنێن))[٢٢].

نموونەی پەیوەندیی بەهێزی داگیرکەران و ڕۆژهەڵاتناسی (کارل هینریش بیکر)ی ڕۆژهەڵاتناسە کە لە ساڵی (١٩٣٣ز) کۆچی دوایی کردووە و دانەری گۆڤاری (مجلة الاسلام)ی ئەڵمانییە لە ئەفریقا، هەروەها (بار تولد) ی ڕۆژهەڵاتناس کە لە ساڵی (١٩٣٠ز) کۆچی دوایی کردووە و دانەری گۆڤاری (عالم الاسلام الروسية)، ئەم ڕۆژهەڵاتناسە لە لایەن حکومەتی ڕووسییەوە تەکلیف کرابوون بۆ لێکۆڵینەوە بۆ خزمەتی بەرژەوەندیی و سەرووەریی ڕووسیا لە ئاسیای ناوەڕاست. بە هەمان شێوە زانای زانستە ئیسلامییەکانی هۆڵەندا (سنوك هور جرونیە) کە لە ساڵی (١٩٣٦ز) بە مەبەستی بەدەستهێنانی توانا و زانیاری بۆ خزمەتی داگیرکەران، لە ساڵی (١٨٨٥ز) بەرەو مەککە گەشت دەکات و

[٢٢] الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، د. زقزوق، ص٤٤.

ناوێکی ئیسلامی (عبدالغفار) له خۆی دەنێت و نزیکەی نیو ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە، دیارە ئەم نموونانە مشتێکن له خەرمانێك[٢٣].

له فەرەنساش بە هەمان شێوە کۆمەڵێك ڕۆژهەڵاتناس ڕاوێژکار بوون له وەزارەتی موستەعمەراتی فەرەنسا بۆ کاروباری باکووری ئەفریقا، لەوانە ڕۆژهەڵاتناسی گەورە (دی سای) هەروەها تا سەردەمانێکی نزیك (ماسینیون) ڕاوێژکاربوو له بەڕێوەبەرایەتیی موستەعمەراتی فەرەنسی بۆ کاروباری ئیسلامی. (سنوك هیرغرونج)ی ڕۆژهەڵاتناسیش دوای تەواوبوونی له توێژینەوە و شارەزابوون له ئیسلام، بوو به ڕاوێژکاری حکومەتی هۆڵەندی له بەڕێوەبەرایەتیی موستەعمەراتی هۆڵەندی له ئەندەنوسیای موسڵماننشین[٢٤].

حکومەتی بەریتانیش دوای ڕاوێژ به کۆمەڵێك ڕۆژهەڵاتناس و له دوای لێکۆڵینەوە، هەڵدەستا به دانانی پلان و سیاسەتەکانی لەو شوێنانەی داگیری کردبوون، گومانی تێدا نییە کە ڕۆژهەڵاتناسی یەکێکە له گرنگترین ئامرازەکان کە ئاسانکارییان کرد بۆ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات له ڕووی کەلتووری و سەربازییەوە، دەکرێت بڵێین کە : ڕۆژهەڵاتناسان بە گشتی بە جۆرێك له جۆرەکان خزمەتیان به ئیستیعمار کردووە.

## یەهودیەت و ڕۆژهەڵاتناسی:

ڕۆژهەڵاتناسانی جولەکە فاکتەری ئایینی پاڵی پێوەناون بۆ ڕۆژهەڵاتناسی، بە مەبەستی هەوڵدان بۆ بێهێزکردنی ئیسلام و گومان دروستکردن سەبارت بە بەهاکانی و له ڕێگەی سەلماندنی گەورەیی یەهودیەت بە سەر ئیسلامەوە و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە یەهودیەت سەرچاوەی ئیسلامە — هەورەك

[٢٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤، وحقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام، د. محمد بهاء الدين، ص٦٤.
[٢٤] الاستشراق: إدوارد سعيد، ص١٤٦ وما بعدها.

(جولدتسیهر) ئەو بانگەشەیەی دەکرد– هەروەها هۆکاری سیاسیشی هەبوو کە پەیوەستە بە زایۆنیزمەوە لە ڕووی فیکری و دەوڵەتیشەوە.

دەتوانین بڵێین کە ئامانجەکانی ڕۆژهەڵاتناسانی جولەکە لەم مەبەستانەی خوارەوەدا کۆبوونەتەوە:

١– بێنرخکردنی موسڵمانان و گاڵتەکردن بە بارودۆخی ئێستایان و گێڕانەوەی سەرچاوەی زانست و زانیارییان بۆ ڕۆژئاوا، هەروەها بەرزنرخاندنی لێکۆڵینەوەکانی جولەکە بە کۆن و نوێوە.

٢– گۆڕینی شتە پڕوپووچەکان و داستانەکانیان کە باس لە میللەتی هەڵبژێردراو (الشعب المختار) و زەوی پەیمانپێدارو (الارض الموعودة) دەکات بۆ ڕاستی.

٣– شێواندنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئێستای موسڵمانان لە ڕێگای وێناکردنی وەك کۆمەڵگەیەکی پیاوسالاری کە ئافرەت و مافەکانی پشتگوێ دەخات، ئەمانە و چەندان شتی تر کە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئیسلام لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا.

باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەوەیە کە گەورەترین ڕۆژهەڵاتناس لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست، ڕۆژهەڵاتناسی جولەکە (جولدتسیهر)ە کە هەموو ژیانی تەرخان کرد بۆ تانەدان لە ئیسلام و پێغەمبەرکەی و کتێبەکەی و مێژوو و پیاوە ناودارەکانی، لە ڕێی نووسین و لێکۆڵینەوە و وتارەکانیەوە، بە تایبەتی هەردوو پەرتووکی (العقدیة و الشریعة في الاسلام) و (مذاهب التفسیر الاسلامي). نموونەی (جولدتسیهر) ڕۆژهەڵاتناس

(شاخت)ە کە ئەمیش هەر جولەکەیە لە سەدەی بیستدا ژیاوە و نووسینەکانە هەمووی بریتییە لە هێرشکردنە سەر ئیسلام و تانەدان و شێواندنی وێنایەتی[٢٥].

دەیان نموونەی ڕۆژهەڵاتناسی تری جولەکە هەن کە وەك (جولدتسیهر) و (شاخت) نووسینەکانیان دژی ئیسلام بووە، بەڵگەی ئەمەش (صموئیل زویمر)ە کە گەورەترین و ترسناکترینی مژدەدەران (المنصرین)ە لە تەواوی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا، جولەکەیەکی ئەمریکییە و سەرکردەی هەڵمەتی بەگاورکردنی دەکرد لە وڵاتانی ئیسلامیدا.

بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین: کە ڕۆژهەڵاتناسی بە شێوەیەکی گشتی لە خزمەتی داگیرکەر و سیاسەتەکانی زایۆنیزم و ئیسرائیلدا بووە و جولەکە دەستی هەبووە لە ڕۆژهەڵاتناسی و بەگاورکردندا، کە لە دژی ئیسلام و موسڵمانان بووە.

---

[٢٥] المبشرون والمستشرقون، ص٥٢٤، وحقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام، د. محمد بهاء الدين، ص٧١.

## بەشی دووەم:
## پاڵنەرەکانی ڕۆژهەڵاتناسی

کۆمەڵێك پاڵنەر هەبوون بۆ لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەم پاڵنەرانە لە هەموو قۆناغەکاندا هەبوون، یاخود پاڵنەری هاوبەش هەبێت لەناو هەموو قۆناغەکاندا، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی خەڵکانی پسپۆڕ لە بابەتی ڕۆژهەڵاتناسیی کۆمەڵێك پاڵنەریان دیاری کردووە لەوانە:

**١- پاڵنەری ئایینی:**

سەرەتای سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی لەسەر دەستی پیاوانی ئایینی مەسیحی و بە ڕێنموونیی ئەوان بووە، بەردەوام هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆ، هۆکارەکەشی دەمارگیریی پیاوانی ئایینی مەسیحی بووە و بە مەبەستی تانەدان لە ئیسلام و شێواندنی ڕاستییەکان و هێرشکردنە سەر پێغەمبەرەکەی، بەم شێوە وێنایەکی زۆر خراپیان لە ئیسلام پیشانی خەڵکانی مەسیحی دا، بۆ ئەوەی بۆیان بسەلمێنن کە ئیسلام شایەنی ئەوە نییە کە خەڵکی لە ئامێزی بگرن، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە شتێك لە هەستیاندا دروست بووبوو[٢٦]. دوای وریابوونەوەی خەڵکی و دوورکەوتنەوە لە خورافاتەکانی کەنیسە و ئایینی مەسیحیەت، پیاوانی کەنیسە ترسیان هەبوو کە خەڵکی بچنە ناو ئیسلامەوەو ئەمەش پاڵنەرێك بوو بۆ ئەوەی وێنایەکی شێواو بۆ ئیسلام دروست بکەن و بڵاوی بکەنەوە بە ناوگەلانی ئەوروپادا، بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێ بکەن کە ئایینی ئیسلام یان زەندەقە — بە گوێرەی وتەی ئەوان– شایەنی ئەوە نییە لە ئامێز بگیرێت و ملکەچی ببیت. لیکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتییەکان لەسەر ئەم ڕێڕەوە بەردەوام بوو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم، تا ئەوکاتەی پەیوەندی و

---

[٢٦] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام، د. محمد بهاء الدين، ص٧٣.

بەیەکگەشتن زۆربوو لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، زۆرێك لە ئەوروپییەکان توانییان ڕاستییەکانیان بۆ دەرکەوێت سەبارەت بە ئیسلام و ئاکاری پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لەسەربێت)، ئەوکات متمانە کەمبووەوە بە نووسینە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و هەندێك لە ڕۆژئاواییەکان مەنهەجی خۆیان گۆڕی، بۆ نموونە (کارلیل) پەرتووکی (الابطال)ی دانا کە لایەنێکی پرشنگداری ژیانی پێغەمبەری باس کرد و بە پاڵەوانێکی گەورە ناوی برد، نەوەك پێغەمبەر... قەشەو کاهینەکان مەبەستیان لەو هێرشە درِندانە بۆ سەر ئیسلام لەم قۆناغەدا ئەوەبوو کە سەرنجی ڕۆژئاواییەکان دووربخەنەوە لە ڕەخنە لە عەقیدە و کتێبەکانی خۆیان لە لایەك و دروستکردنی شك و گومان لەسەر کەلتوور و شارستانیەتی ئیسلامی لە لایەکی تر.

## ٢- پاڵنەری داگیرکاریی:

دوای شکستهێنانیان لە جەنگەکانی خاچپەرستی، ڕۆژئاوا دەستبەرداری مەرامەکانی خۆیان نەبوون لە ڕۆژهەڵات، بەڵکو بە هەموو گوڕ و تینێکەوە دەستیان دایە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆژهەڵات لە هەموو بوارەکاندا، بۆ دیاریکردنی خاڵی بەهێز، هەتا بێهێزی بکەن، لەگەڵ هەر هەستێکی بەرنگاربوونەوەو مەعنەویاتێك کە وڵاتانی ڕۆژهەڵات هەیانە، ئەمەش بە گومان دروستکردن لە عەقیدە و بەهاو شارستانیەتیان[٢٧]. هەروەها بە هەوڵدان بۆ جێگرتنەوەی پێوەری ئەخلاقی و بنەما عەقیدەییەکانی ڕۆژئاوا لە باتی پێوەرە ئەخلاقییەکان و تێگەشتنە ئیسلامییەکان.

## ٣- پاڵنەری سیاسی:

وڵاتانی ڕۆژئاوا هەم لە کاتی داگیرکردنی وڵاتە ئیسلامییەکان، هەم لە دوای داگیرکاریەکانیانەوە، سوودیان لە توێژنەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بینیوە، هەر

---

[٢٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

باڵیۆزخانەیەکیان لە وڵاتانی ئیسلامی، کەسانی شارەزا لە لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و زمانە ڕۆژهەڵاتییەکانی تێدا دادەنرا، بۆ ئەوەی توانای ئەوەیان هەبێت کە پەیوەندی دروست بکەن لەگەڵ پیاوانی فیکر و سیاسەت و ڕۆژنامەگەری و دواتر لە ڕێگەی ئەوانەوە کار لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو ڕێڕەوە سیاسییانە بکەن کە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دەیانەوێت فیتنە و دووبەرەکی بخەنە نێو وڵاتە ئیسلامییەکانەوە. بەم شێوەیە کارمەندی باڵیۆزخانەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا توانیویانە سیخوڕ بۆ وڵاتەکانی خۆیان دروست بکەن لە هەموو بوارەکانی سیاسی و فیکری و پەروەردەیی و ڕاگەیاندندا.

**٤- پاڵنەری ئابووری و بازرگانی:**

ڕۆژئاواییەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی بازار بۆ کاڵاکانی خۆیان، لە دوای شۆڕشی پیشەسازییەوە زیاتر پاڵنەری ڕۆژهەڵاتناسی بوون. لە دوای شۆڕشی پیشەسازییەوە، ڕۆژئاوا سەرچاوەی سروشتی کەمنرخی لە وڵاتانی ئیسلامی بەدەست دەهێنا و پیشەسازیی خۆیانی پێدەبوژایەوە و پیشەسازیی وڵاتانی ئیسلامیش لەناودەبراو وڵاتانی ئیسلامیش شوێنکەوتەیەکی ئابووریی ئەوان بوون، چونکە ئەوان هەموو کات ڕێگربوون لە دروستکردنی کارگە و پڕۆژەی وەبەرهێنانی کاریگەر لە وڵاتانی ئیسلامیدا، لە ڕێگای فشاری سیاسی و کودەتا و دروستکردنی قەیرانەوە، بەم شێوەش ڕۆژهەڵات و وڵاتانی ئیسلامی بوونە بازارگەلێکی بەکاربەر بۆ کاڵاکانی ڕۆژئاوا[٢٨].

**٥- پاڵنەری زانستی:**

کۆمەڵێکی کەم لە ڕۆژهەڵاتناسان دەستیان داوەتە ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕوانگەی حەزکردن لە شارەزابوون لە شارستانیەت و ئایین و کەلتوور و زمانی میللەتانی تر، ئەمانەش هیچ کات مەترسی نەبوون بۆ سەر ئیسلام و لایەنی

---

[٢٨] بڕوانە: الاستشراق، د. السباعي، ص١٩، وحصوننا مهددة من داخلها، محمد حسين، ص٣٤٨.

تریش، چونکە بە مەبەست هەوڵی هەڵگێڕانەوەی ڕاستییەکانیان نەداوە و لێکۆڵینەوەکانیشیان زۆر لە ڕاستییەوە نزیك بووە، بەراورد بە نووسینی زۆرینەی ڕۆژهەڵاتناسان، هەربۆیە بەرهەمەکانیشیان هەڵەی کەمتر تێدا بووە و ئەو هەڵانەش کە تێیٚ کەوتوون بە هۆی نەشارەزاییان بووە لە زمانی عەرەبی و کەوتنە ژێر کاریگەریی تێگەشتنە ڕۆژئاواییەکان کە خۆیان تێیدا ژیاون، هەر بۆیە هەڵەکانیان بە مەبەست نەبووە.

هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە بە هۆی لێکۆڵینەوەکانیان کە بە بێلایەنی و بە پاکی ئەنجامیان داوە، هاتنە ناو ئیسلامەوە. بۆ نموونە: (ألفونس أتين دیینە) کە بە نازناوی (ناصرالدين) ناسراوەو چەندین پەرتووکی نووسیوە دوای موسڵمانبوونی لەوانە (أشعة خاصة بنور الاسلام) و (محمد رسول الله). یەکێکی تر (مۆریس بۆکای) بوو کە پەرتووکێکی نووسی سەبارەت بە قورئانی پیرۆز و زانستی سەردەم بە زمانی فەرەنسی و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، بە ناوی: (دراسة الكتب المقدسة فی ضوء المعارف الحديثة)، هەروەها (زنغرید هونکە) خاوەنی پەرتووکی (شمس الله تسطع علی الغرب)، چەندان ڕۆژهەڵاتناسی تر کە پابەند بوون بە سنووری توێژینەوەکانیانەوە و نە بە دڵی پیاوانی کەنیسە بوون و نە سیاسەتمەداران و پاڵپشتی داراییشیان لە هیچ لایەك پێنەگەشتووە و دەرەنجام ژمارەیان کەم بووە[٢٩].

[٢٩] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص٧٧، والاستشراق في دراسة التراث العرب، د. ناجي، ص٢٥.

## باسی یەکەم:

## چین و گرووپەکانی ڕۆژهەڵاتناسان

ڕۆژهەڵاتناسان ڕەگەزنامەیان دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتان و میللەتانی جیاواز و هۆکاری جیاوازیان هەبووە بۆ ئەو کارەو لە زانست و بێلایەنی و پاراستنی ئەمانەتی زانستیشدا جیاواز بوون، دەکرێت ڕۆژهەڵاتناسان پۆلێن بکرێن بۆ چین و گرووپی جیاواز، بۆ نموونە لە ڕووی کاتەوە، چینی پێشەنگەکان هەن، نموونەی (جربردی أورلیاك) (توماس الاکوینی) و چەندانی تر، یاخود چینی سەردەمی تازە، نموونەی (کارە دفو) و (کازانوفا) و (جولدتسیهر) و (جوزیف شاخت) و (ماسینون) و (جب) و (بلاشیر) و هی تر.

ئەگەر بە وردی سەیری نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بکەین سەبارەت بە ئیسلام و هەڵوێستەکانیان بەرامبەری لە قۆناغە جیاوازەکاندا، بە ڕوونی دەردەکەوێت کە گرووپی جیاواز پێك دەهێنن لە ڕووی دەمارگیری و بێلایەنی و پاکێتی، بەم شێوەی خوارەوە:

**١- کۆمەڵی خورافە و داستانی سەیروسەمەرە:**

ئەمانە ئەوڕۆژهەڵاتناسانە بوون کە بە ئاشکرا درۆیان هەڵدەبەست سەبارەت بە (قورئانی پیرۆز) و پێغەمبەرو (د.خ) موسڵمانان و لە خەیاڵی خۆیان بەسەرهات و چیرۆکی درۆیان دروست دەکرد، بەڵام ئەمانە لە لایەن زانایانی بێلایەنەوە پەسەند نەکران. سەرهەڵدانی ئەم کۆمەڵە لە سەرەتای بزووتنەوەی ڕۆژهەڵاتناسییەوە بوو، بەرەبەرە لەناوچوون لەگەڵ گوزەرانی سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەمانە بۆ زەمەنێکی زۆر باوەڕیان وابوو کە موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) خودای موسڵمانانە[٣٠].

**٢- کۆمەڵی بەکرێگیراو:**

[٣٠] بڕوانە: الاستشراق والمستشرقون، د. مصطفى السباعي، والمستشرقون، العقيقي، ج٣/ ١١٦٠.

ئەم کۆمەڵە خۆیان و لێکۆڵینەوەکانیان تەرخانکردبوو بۆ خزمەتی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا و سیاسەت و ئابووری و داگیرکارییەکانیان.

**٣- کۆمەڵی لووتبەرزەکان:**

ئەمانە بە هۆی سەرلێشێواوییانەوە دوورکەوتبوونەوە لە لێکۆڵینەوەی پاك و بابەتی و زانستییانە، دەرەنجام نووسینەکانیان پڕبوون لە ڕق و کینە و تانەدان لە ئیسلام، پێیان وابوو کە ئیسلام هیچ بەهایەکی نییە، نموونەی ئەم کۆمەڵە (رودیل) و (بریدو) و (سبیل) و چەندانی تر لە سەدەی هەژدەدا.

**٤- کۆمەڵی ئەوانەی بە ناوی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە هاتبوونە ناو ڕۆژهەلاتناسییەوە:**

ئەم کۆمەڵە هەردەم بە ناوی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە سەبارەت بە ئیسلام دەدوان، بەڵام لە ڕێگەی ڕاست لایانداو کەوتنە گومان دروستکردن لە ڕاستیی ئایینی ئیسلام و عەقیدەی ئیسلامی و قورئانی پیرۆز لە ڕووی سەرچاوە و دەقەوە، گومان خستنە سەر ڕاستیی فەرمودەی پیغەمبەر، هەروەها گومان دروستکردن سەبارەت بە بەهاکانی ئیسلام و تەصەوفی ئیسلامی و شارستانیەتی ئیسلامی، نموونەی ئەم کۆمەڵەش (جولد تسیهر) لە توێژینەوەکانی سەبارەت بە قورئان و عەقیدە و فەرمودە، هەروەها (شاخت) لە تویژینەوەکانی سەبارەت بە فەرموده و فیقهی ئیسلامی، هەروەها (نولدکە و بلاشیر و کازانوفا) و چەندانی تر[٣١].

**٥- کۆمەڵی ڕۆژهەلاتناسانی جولەکە:**

ئەم کۆمەڵەش دەستیان دایە کاری ڕۆژهەلاتناسی لەسەر ئەو بنەمایەی کە یەهودییەت سەرچاوەی ئیسلامە – هەروەك چۆن (جولد تسیهر) ئەو

---

[٣١] المستشرقون والحديث النبوي، د. محمد بهاء الدين، ص٢١، ٧٢، ٧٥- ٨٠، ١٤٥، ١٦٠.

بانگەشەیەی دەکرد، هەروەها هۆکاری سیاسی پاڵنەر بوو بۆ ئەم کۆمەڵە کە لە خزمەت زایۆنیزمدا بوون.

لە مێژوویەکی دوورەوە هەوڵی ئەوە درا کە ڕۆژهەڵاتناسییەکی جولەکە بێتە کایەوە کە بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ ڕێچکە و ئامانجی ڕۆژهەڵاتناسی ڕۆژئاوا یەکدەگرنەوەو ئامانجەکەشیان هێرشکردنە سەر ئیسلام و هەڵگێڕانەوەی بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیبراهیمی و ئەو شتانەی پەیوەستن بە پێغەمبەران ئیسماعیل و ئیسحاق (سەلامی خوایان لێ بێت)[32].

نموونەی ڕۆژهەڵاتناسانی جولەکە کە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە دژایەتیکردنی ئیسلام و بێهێزکردنی و نکوڵی کردنی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (د.خ) و خزمەتکردنی بزووتنەوەی زایۆنی و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، ئەمانە بوون: (مرجلیوپ، لفنسون، لیفی بریل، جولدتسیهر، برنارد لویس، مکسیم رودنسون، جارودی، شاخت) و چەندانی تر[33].

---

[32] بڕوانە: المبشرون والمستشرقون، ص٥٩٩، والإسلام في وجه التغريب، ص٢٢٩، وحقيقة الإستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص٩١.

[33] حقيقة الإستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص٩٢.

## باسی دووەم:

## ئامانجەکانی لیکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان

گومانی تێدا نییە کە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسی زۆر گەورەیە و خۆی لە سەدەها پەرتووك و ڕاڤە و لێکۆڵینەوەدا دەبینێتەوە و باش و خراپی تێدایە، هەندێکیان دەکرێت بە زانستێکی پوخت و توێژینەوەی ورد هەژمار بکرێن و هەندێکی تریان پڕن لە هەڵەی ئاشکرا و نەزانی و ڕوکەشگیری. هەروەها هەندێکیان بێلایەنانە مامەڵەیان لەگەڵ ئیسلام و پێغەمبەر و مێژووی ئیسلامی و شەریعەت و موسڵمانان کردووەو لە بەرامبەردا هەندێکی تر پڕن لە تانە و ناواخنی درۆ و هەڵگێڕانەوەی ڕاستییە ئیسلامییەکان. بەم شێوە کۆمەڵێك لە ڕۆژهەڵاتناسان زانستخواز بوون و کۆمەڵێکی تریان نیەتیان پیس بووە و فیتنەگێڕبوون.

لێرەدا دەکرێت ئامانجەکانی ڕۆژهەڵاتناسانی دژ بە ئیسلام لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

١- مەبەستی ئایینی: دژایەتیکردنی ئیسلام بە گەڕان بە دوای خاڵی لاوزیدا - بە گوێرەی ڕۆژهەڵاتناسان - و زەقکردنەوەی، بە بانگەشەکردنی ئەوەی کە ئیسلام لە یەهودیەتەوە سەرچاوە دەگرێت، یاخود لادینییەکە کە بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ یەهودیەت و مەسیحیەت و سەرچاوەی تر، هەروەها دژایەتیکردنی بە بەکەم نرخاندنی بەها و بنەما و ڕۆڵی لە دەوڵەمەند کردنی کەلتووردا. بەم شێوەیە لای ئەوروپییەکان لە سەردەمانی جەنگی خاچپەرستیدا و سەدەیەکیش پێشتر، وێنایەکی زۆرناشیرین و شێواوی ئیسلام دروست بوو کە

دەرەنجامی ڕق و کینە و نەزانی بوون و کارەکتەری سەرەکیی ئەم ڕۆڵەش کەنیسە بوو، چونکە ئیسلام بووبووە مەترسییەك لەسەریان[٣٤].

٢- پارێزگاریکردنی گاورەکان لە مەترسیی ئیسلام بە شاردنەوەی ڕاستییەکان لە ئەوروپییەکان و ترساندنیان لە ئیسلام، چونکە دوای ئەوەی ئیسلام لە ڕۆژهەڵاتدا زاڵ بوو بەسەر بتپەرستیدا و تا ڕادەیەکیش بەسەر مەسیحیەتدا، پیاوانی کەنسیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیسلام هیچیان پێ نەبوو جگە لە دانانی پەرتووك و هۆنراوە بۆ تانەدان و درۆهەڵبەستن و قسەی خراپ لە دژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (د.خ)[٣٥].

٣- مژدەدان و بەگاورکردن (التبشير و التنصير): باشترین بەڵگەن لەسەر ئامانجە ئایینییەکان و هەروەها کۆنگرەی ڤییەننای کەنەسی لە ساڵی (١٣١٢ز) بڕیارەکانی بە دروستکردنی پۆستی باڵای فێرکردن لە زمانی عەرەبی لە زانکۆکانی ئەوروپا و دەرکردنی گۆڤاری (العالم الاسلامي) لە ساڵی ١٩١١ز لە لایەن (صموئیل زویمر) سەرۆکی بەگاورکەران لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە مەبستی گەشەپێدانی کاری بەگاورکردن.

٤- بەرگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ئەوروپا و شوێنانی تر، بە مەبەستی هێشتنەوەی دەسەڵاتی کەنیسە، چونکە هەموو ئەوروپیەکان ئەوەیان لەبیر بوو کە چۆن ئیسلام (و خەلافەتی ئیسلامی) زاڵ بوو بەسەر ڕۆما لە ڕووی گرنگی و دەسەڵاتەوە[٣٦]. باشترین بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستییە ئەو مەرجانەن کە ئینگلیز فەرزی کردن بەسەر تورکیا و ناسراون بە چوار مەرجەکەی (کرزون) و

---

[٣٤] بڕوانە: الحضارة الإسلامية، خدابخش، ص٣٨، والمستشرقون والإسلام، د. عرفان عبدالحميد، ص٦ و دواتری.

[٣٥] الوحي المحمدي، ص٦٩. وحقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام...، د. محمد بهاء الدين، ص١١١.

[٣٦] الاستشراق، إدوارد سعيد، ص١٠١.

(موستەفا کەمال ئەتاتۆرك)یش زۆر بە پەرۆشەوە جێبەجێی کردن، مەرجەکانیش: تورکیا خەلافەت ئیلغا بکاتەوە و پەیوەندی بە ئیسلامەوە بپچڕێنێت و دامرکاندنەوەی هەر بزووتنەوەیەك لایەنگرانی خەلافەت پێی هەڵدەستن و بەتاڵکردنەوەی ئەو دەستوورەی لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە[٣٧].

هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو ئەورووپییەکان ترسێکی گەورەیان هەبوو بەرامبەر بە ئیسلام و سەریان سوڕدەما لە تیژڕەویی ئیسلام لە بڵاوبوونەوەدا، بە بێ ئەوەی نهێنی ئەوە بزانن، ئەوەتا ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی لە پێشەکیی (الحوليات الاسلامية)دا دان بەوەدا دەنێت کە دەیەوێت نهێنیی ئەو بەڵا گەورەیە بزانێت کە چۆن ئیسلام ملیۆنان شوێنکەوتەی مەسیحیی بردووە لە پارچە جیاجیاکانی ئەم جیهانەو تا ئێستاش موسڵمانەتی دەکەن و باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (د.خ) هەیە[٣٨].

٥- هەڵگێڕانەوەی موسڵمانان و دروستکردنی گومان بۆیان سەبارەت بە ڕاستیی پەیامەکەی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) و سەرچاوە ئاسمانییەکەی.

٦- پێشکەشکردنی خزمەتێکی زۆر بە داگیرکەران، بەهۆی ڕۆژهەڵاتناسییەوە، ڕۆژئاوا توانی خەڵکانێکی ئەڵقە لە گوێی خۆیان لە زانکۆکانی وڵاتانی ئیسلامی دابنێن و لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بکەن بە بابەتی خوێندن و فێرکردنی موسڵمانان و نەهێشتنی یەکڕیزییان.

٧- تەرکیز کردنە سەر دروستکردنی گومان و تانەدان و درۆ هەڵبەستن سەبارەت بە قورئان و فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیز (درودی خوای

---

[٣٧] الغزو الفكري، د. عبد الستار فتح الله، ص١١١.

[٣٨] تراثنا بين ماضي وحاضر، د. بنت الشاطئ، ص٥٤.

لەسەربێت) بە مەبەستی ئەوەی موسڵمانان متمانەیان بە سەرچاوەکانی ئایینەکەیان نەمێنیت و بتوانن مێژووی ئیسلامیش لەو ڕێگەیەوە بشێوێنن. هەروەها گرنگیدان بە دروستکردنی دووبەرەکیی مەزهەبی و تێکدانی یەکڕیزیی موسڵمانان و هێنانە کایەی نەوەیەك لە موسڵمان کە بێزیان لە ژیانێکی موسڵمانانە بێتەوەو ئیسلامیش بە بەربەست بزانن لە بەردەم پێشکەوتنی گەلانی موسڵماندا[٣٩].

٨- کۆمەڵێك ئامانجی تر هەن، وەك ئامانجی زانستی و بازرگانی و سیاسی، لێرەدا ناتوانین باسیان بکەین، چونکە بابەتەکە زۆر درێژ دەبێت.

[٣٩] الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، د. زقزوق، ص٩٨- ٩٩، ومجلة كلية الشريعة والدراسات الإسلامية بمكة، العدد الخامس، السنة الخامسة، ص٣٨، ومجلة العربي، الكويت، العدد ٢٥٢، السنة ١٩٧٩، ص٣٧.

# بەشی سێهەم:
# هەڵبەستراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان سەبارەت بە ئیسلام

## باسی یەکەم:
## شایەتی و دانپێدانانی زانایانی ویژدانزیندووی ڕۆژئاوا بە گەورەیی ئیسلام

ڕۆژهەڵاتناسان — بە پێوەری بەرهەمەکانیان– پێکهاتبوون لە قەشە و داگیرکەر و جولەکە و ژمارەیەکی زۆر کەمیان هەیە لەوانە نەبن، هەتا ئێستاش ڕۆژهەڵاتناسی لە دۆخی خەیاڵە سەرکەشەکەیدا دەژی کە ئەوروپا لە سەرەتای دروستکردنیەوە بونیاتی نابوو. لەم بەشەدا نموونە و شێوازی ئەو درۆ و هەڵبەستراوانەی ڕۆژهەڵاتناسانی نیەتپیس دروستیان کردووە، دەخەینەڕوو، کە عەقڵی دروست و لۆجیکی زانستی بە هیچ شێوەك قبووڵیان ناکات و هەر لە لایەن ڕۆژهەڵاتناسانی بێلایەن و بە ویژدان خۆیانەوە، بە شێوەیەکی زانستی وەڵامدراونەتەوە و بە درۆخراونەتەوە.

١– درۆزنەکانی ناو ڕۆژهەڵاتناسان دەڵێن: موحەممەد پێغەمبەرێکی درۆزنە و قورئان دروستکراوە، ئیسلام ئایینێکی بەتاڵە و عەقیدەکەیان هەڵەی نادروستی تێدایە بەرامبەر خودا، ئیسلام خەڵکی بانگ دەکات بۆ بێ ئەخلاقی و خراپەکاری و ئارەزووبازی و هاندانی نەفس نزمی و عیباداتێکی زۆری بێسوود[٤٠].

٢– پێغەمبەرایەتیی موحەممەدیان پێ ڕەفزە و دەڵێن قورئان نە کتێبێکی ئاسمانییە و نە لای خوداوە هاتووە. ڕۆژهەڵاتناسان لەژێر زۆر ناو و ناتۆرەدا

---

[٤٠] عبدالحميد الشرفي: الفكر الإسلامي في الرد على النصارى، ص٥١٦.

پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) ڕەتدەکەنەوە، وەك لە خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) لای هەندێکیان عەبقەرییە و لای هەندێکی تر پاڵەوانە و لای کۆمەڵێکی تر کەسێکی زیرەك بووە شتی لە کتێبە کۆنەکان نەقڵ کردووە، یاخود لای ڕاهیبەکانی گاوران خۆی فێرکردووە، یاخود توانایەکی بێ وێنەی هەبووە لە پێکەوەنانی شتدا، یاخود جادووگەر بووە، یان خوازیاری دەسەڵات و سەرۆکایەتی بووە.

دەڵێن ئەو هاتووە بۆ بانگەوازکردن بۆ ئیشتیراکیەت نەوەك بۆ عەقیدە و ئایین، هەروەك ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (هویمرت جریمی) لە پەرتووکی (موحەممەد)دا دەڵێت[٤١]. بەڵام هەرکەس بانگەشەکانی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە سەبارەت بەوەی کە قورئان دانراوی مرۆڤە، بخوێنێتەوە و بەراوردیان بکات بە بانگەشەکانی بتپەرستەکانی مەککە کە قورئان دەیگێڕێتەوە، شتێکی نوێ لە بانگەشەکانی ڕۆژهەڵاتناسانەکان نابینێت، بەڵکو دووبارەکردنەوەی هەمان قەوانی بتپەرستانی مەککەیە. قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا باسی تانە و بانگەشە جۆراوجۆرەکانی بتپەرستانی مەککە دەکات، وەك لەم ئایەتانەدا هاتووە: (إنْ هذا إلاّ سِحرٌ يُؤثَر، إنْ هذا إلاّ قَولُ البَشَر) (المدثر: ٢٤–٢٥) و دەیان وت: (أساطيرُ الأوَلينَ اكتَتَبها، فَهيَ تُملى عَلَيهِ بُكرَةً وأصيلاً) (الفرقان: ٥) سەبارەت بە موحەممەد دەیانوت: (إنَّما يُعَلِمهُ بَشَر) (النحل: ١٠٣) و دەیانوت: (يا أيُها الذي نُزلَ عَليه الذِكرُ إنكَ لَمَجنون) (الحجر: ٦) و پێیان دەوت (لستَ مرسلاً). یاخود هەر شتێکی تر کە قورئان باسی دەکات، هەر بۆیە شتێکی نامۆ نییە کە

[٤١] محمد: هويمرت جريمي، ص٥٦٥، ٥٩٢، ١٤١.

هەمان تۆمەت و تانە لە لایەن دوژمنانی ئیسلامەوە لە ڕۆژهەڵاتناسانەوە یاخود غەیری ئەوان، بوترێتەوە[٤٢].

دەبینین کە زۆرینەی ڕۆژهەڵاتناسان نکوڵی لە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) دەکەن و بە ڕاڤەی جیاواز دیاردەی وەحی و هاتنەخوارەوە قورئان ڕوون دەکەنەوە، هەندێکیان دەڵێن موحەممەد فێی لەگەڵدا بووە، هەندێکی تر بە خەیاڵات لەقەڵەمی دەدەن و کۆمەڵێکیشیان دەڵێن ئەوە نەخۆشییەکی دەروونی بووە.

بێگومان دەرەنجامی نکوڵیکردن لە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێت) نکوڵیکردنە لەوەی کە قورئان کتێبیکی ئاسمانی بێت و ئیسلام ئایینێکی خودایی بێت، بەڵکو بە بانگەشەی ئەوان ئایینی ئیسلام پێکهاتەیەکە لە تێکەڵکردنی ئایینەکانی یەهودیەت و مەسیحیەت و زەردەشتی و هەتا بتپەرستیش.

لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان فەرموودەی پێغەمبەریان بەدەرنەکردووە لە گومان دروستکردن لە ڕاستێتیدا[٤٣].

– لەو بەڵگانەی کە شایەتیی ڕق و کینەی ڕۆژهەڵاتناسان و پشتگوێ خستنی ڕاستییە زانستییەکان دەدەن لە لێکۆڵینەوەکانیاندا، وتەی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (کیمون)ە کە دەڵێت: (ئایینی موحەممەد تاعونێکە لەناو خەڵکیدا بڵاوەی کردووەو بە خراپی لەناویان دەبات، بەڵکو نەخۆشی و ئیفلیجیی گشتی و شێتییە کە وا لە مرۆڤ دەکات تەمبەڵ و بێ هەست بێت...

---

[٤٢] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام، د. محمد بهاء الدين، ص٩٥، ٩٦.

[٤٣] بۆ وردەکاریی تانە و بانگەشەکان سەبارەت بە فەرموودە و وەڵامی زانستییانەیان، بڕوانە: المستشرقون والحديث النبوي الشريف للدكتور محمد بهاء الدين.

گۆڕەکەی موحەممەدیش وەك ستوونێکی کارەبایی وایە کە شێتی دروست دەکات لە سەری موسڵمانەکاندا..)[٤٤].

– هەوروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن کە موحەممەد بە مەسیحی لەدایك بووەو دواتر لە پاپایەتی جیابووەتەوەو دواتریش بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی کردووە، هەروەها ئیسلامیان بە تێکەڵەیەك لە بنەماکانی مەسیحیەت و یەهودیەت داناوە و دەڵێن قورئان شتی دژبەیەکی زۆر تێدایە و موسڵمانەکانیش وەك دڕندە وان و لە نەوەی شەیاتینی و بتپەرستەکانن.

– (نیکلسون)ی ڕۆژهەڵاتناس سەبارەت بە قورئانی پیرۆز دەڵێت: ئەوروپییەکان کاتێك قورئان دەخوێننەوە، سەریان سوڕدەمێنێت لە ناجێگیریی دانەرەکەی و بێتوانایی قورئان لە چارەسەری کێشە گەورەکاندا، دانەرەکەی خۆیشی ئاگادارنەبووە بەم دژبەیەکانەی کە تێیدایە[٤٥].

بەم شێوە (نیکلسون) کەوتووەتە هەڵەیەکی فیکریی مێژویی نالەبار و ڕوونەوە، بەوەی کە بانگەشەی ئەوەی کردووە کە قورئان لە لایەن موحەممەدەوە دانراوە و شتی دژبەیەکی تێدایە، بە بێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە، ئەوەی ئەم ڕۆژهەڵاتناسە دەیڵێت، لە ڕاستیدا بانگەشەی زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکانە جگە لەوانەی بێلایەن و بە ویژدان بوون، ئەم بانگەشەیەش نوێ نییە و بێباوەڕانی قورەیش هەمان شتیان وتووەو قورئان باسی دەکات و بەرپەرچیشان دەداتەوە، هیچ بواریشی بۆ بەرامبەر نەهێشتووەتەوە بۆ سەلماندنی ئەو بانگەشەیە، بەڵکو قورئانی پیرۆز بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە وەڵامی داونەتەوە و قوڕی داوە بە دەمیاندا.

---

[٤٤] مناهج المستشرقين، ج١/ ٢٢.

[٤٥] الصوفية في الإسلام، رينولد نيكلسون، ص٦.

(جولدتسیهر) هەمان بانگەشە دەڵێتەوە وەك دەڵێت: (قورسە بتوانین مەزهەبێکی عەقیدی تۆکمەی بەدوور لە دژبەیەك لە قورئان هەڵێنجێنین)[٤٦].

ڕۆژهەڵاتناسێکی تر کە (فنسك)ـە، بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر (د.خ) قورئانی داناوە بە پشتبەستن بە پوختەی کتێبە ئایینی و فەلسەفییەکانی پێش خۆی[٤٧].

ئەگەر باسیش لە نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بکەین سەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ئەوە هیچ باشتر نییە لە نووسینەکانیان سەبارەت بە قورئان و خودی پێغەمبەر (د.خ) خۆی[٤٨].

ئەو بابەتانەی کە ڕۆژهەڵاتناسە دەمارگیرەکان هێرشیان تێیدا کردووەتە سەر ئیسلام، لە چەند بابەتێکی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە:

ڕاستگۆیی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لە بانگەوازەکەیدا، ڕاستیی ئەو کیتابەی بۆ ئوممەتەکەی هێناوە، باوەڕ بە قەزاو قەدەر، فرەژنی و تەڵاق، حیجاب، کۆیلایەتی، سەرخۆشکەرەکان، ریبا، وێنەگرتن. لێرەدا بە خاڵی یەکەم دەست پێدەکەین کە ڕاستیی پەیامی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)ە و شایەتیی هەندێك لە زانایانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتناسە بێلایەنە بە ویژدانەکان دەهێنین لەسەر ڕاستی و گشتگیریی بانگەوازی ئیسلام. ڕۆژهەڵاتناسانی بێویژدان چەندین وەصفی ناشیرینیان داوەتە پاڵ پێغەمبەری ئازیز (درودی خوای لەسەربێت) نموونەی: تووشی ڤێ بووە بە هۆی زۆرخۆرییەوە، یەکێکی تریان دەڵێت: تووشی تایەکی قورس بووە و نەخۆشیی دەماری هەبووە. دیارە

---

[٤٦] العقيدة والشريعة في الإسلام، جولد تسيهر، ص٧٨، ٧٩.

[٤٧] بڕوانە: المستشرقون والإسلام، د. حسن الهواري، ص٧١٠.

[٤٨] حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام، منذ ظهوره إلى نهاية الألفية الثانية، د. محمد بهاء الدين، ص٢٠٤.

ئەمانە زۆر ناڕەوا بوون لەو وەصفانەدا و بەری ڕووناکیی خۆریش بە بێژنگ ناگیرێت، بەڵام ئێمە لێرەدا هەر بە شایەتیی ڕۆژهەڵاتناسانی بەویژدان وەڵامیان دەدەینەوە.

– ماسینون کە یەکێکە لە زانا ڕۆژهەڵاتناسەکان، دەڵێت: ئیسپاتی دەکەین کە موحەممەد خاوەن عەقڵێکی دروست و بەدەنێکی سەلامەت بووە. پێشتریش (کارلایل) قوڕ دەدات بە دەمی ئەوانەدا کە لە قەدری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) کەمدەکەنەوە و پێیان دەڵێت: ((گەورەترین شەرمەزارییە بۆ هەر تاکێکی ڕۆشنبیری ئەم سەردەمە، گوێ بۆ ئەوانە بگرێت کە پێیان وایە ئایینی ئیسلام درۆیە و موحەممەد فێڵباز و ساختەکار بووە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە دژایەتیی ئەو بانگەشە بێنرخ و شەرمەزارکەرانە بکەین... خۆ ئەگەر درۆ و فێڵکردن لای مرۆڤەکان ئەم ڕەواجەی هەبێت و بەو ڕادەیە بڕوای پێ دەکرێت و قبووڵ دەبێت لایان، ئەوا خەڵکی هەموو دەبەنگ و شێتن و ژیانیش شتێکی بێ قیمەت و گاڵتەجاڕی و سەرلێشوانە و باشتریش دەبوو کە هەر نەبوایە))[٤٩].

– (ولیم مویر) لە پەرتووکەکەیدا (سیرە محمد) دەڵێت: ((زۆربەی ئەوانەی نووسینیان هەیە لە بواری ژیاننامەدا لە ئەوروپییەکان و باسی ژیاننامەی موحەممەدیان کردووە، خۆیان نەپاراستووە لە شێواندنی ژیاننامەی ئەو، بەوەی کە درۆ و هەڵبەستراویان تێکەڵکردووە، وەك دروستکردنی تۆمەتی دڵڕەقی و ئەنجامدانی کاری خراپە و ڕۆچوون لە ئارەزووەکاندا، یان کە گوایا کەسێکی درۆزن و ستەمکار و تینووی خوێنمژین بووە)).

– (مونتیە) باس لە هۆکاری تانەدان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لە لایەن هەندێك لە ڕۆژئاواییەکان دەکات و دەڵێت: ((زۆرجار حوکمی زۆر دڵڕەقانەی بە سەردا دراوە، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەو بێ

[٤٩] سەرچاوەی پێشوو لەگەڵ: محمد كرد علي: الإسلام والحضارة العربية، ج١، ص ٦٦.

وێنەیە لەناو هەموو چاكسازیخوازەكاندا، كە من بە وردی ئاگاداری ژیانیان بووم هەر وەك ئەو، بەڵكو ئەوەی ئەو كردی لە چاككردنی ئەخلاق و پاككردنەوەی كۆمەڵگە، دەكرێت لەقەڵەم بدرێت بە یەكێك لە گەورەترین چاكەهێنەران بۆ مرۆڤایەتی))[٥٠].

– لە سەدەی هەژدەدا (جان جاك) دەڵێت: ((كەسانێك هەن كە تۆزێك عەرەبی فێردەبن و قورئان دەخوێنن و دواتر پێكەنینیان پێی دێت، بەڵام ئەگەر گوێیان لە موحەممەد بوایە كە بەو زمانە پاراوە بۆ خەڵكی دخوێندەوە بە دەنگێكی كاریگەر لە سەر دڵان و دەیبینی ئەحكامەكانی دووپات دەكردەوە بە هێزی زمانپاراوی، ئەو كات دەچووە سوجدە و هاواری دەكرد ئەی پێغەمبەری خودا دەستمان بگرە بەرەو شوێنی فەخر و شانازی، یان بەرەو هەر مەترسییەك و ئازارێك، چونكە لە پێناوی تۆدا ئێمە دەمانەوێت یان سەركەوین یان بمرین)).

– (جیبون) دەڵێت: ((ئەحكامەكانی شەریعەتی موحەممەد گشتی بوون، گەورەترین پاشا ملكەچی دەبوو لەگەڵ بێهێزترین هەژار، شەریعەتێكە كە بە بەهێزترین بنەماكانی شەرع تەنراوە و بێ وێنەیە لە هەموو جیهاندا))[٥١].

– (لیودوروش) دەڵێت: ((ئیسلام ئایینێكی مرۆیی سروشتیی ئابووری ئەدەبییە، هیچ شتێكم باس نەكردووە لە یاسا دەستكردەكان، ئیللا لە ئیسلامدا هەبووە، بەڵكو كاتێك گەڕامەوە سەر ئەو یاسایەی كە (جول سیمون) پێی دەڵێت (یاسای سروشتی) بینیم هەمووی لە ئیسلامەوە وەرگیراوە، دواتر گەڕام بە دوای كاریگەریی ئەم ئایینە لەسەر دەروونی موسڵمانان، بینیم كە پڕی كردووە لە ئازایەتی و پیاوەتی و لەسەرخۆیی و جوانی و بەخشندەیی. بەڵكو

---

[٥٠] موتیه: حاضر الإسلام ومستقبله، والمصدر السابق: محمد كرد علي، الإسلام والحضارة العربية، ج١، ص٦٧.

[٥١] سەرچاوەی پێشوو لەگەڵ: محمد كرد علي : الإسلام والحضارة العربية، ج١، ص ٧٥.

دەروونیان بە شێوازێکە کە فەیلەسوفەکان ئاواتەخوازبوون بۆ هەبوونی دەروونێ لەو جۆرە کە چاکە خواز و بەبەزەیی بێت، لە جیهانێکدا کە خراپە و گاڵتەجاری و درۆی تێدا نییە، چونکە موسڵمان گومانی خراپ بە کەس نابات و ماڵی خەڵکی ناخوات بەناهەق بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی، هەر بۆیە موڵکیان کەمتر بوو لە جولەکە و لە هەندێکیش لە مەسیحییەکان)).

هەروەها دەڵێت: لە ئیسلامدا چارەسەری دوو کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر قورسم بینیەوە کە هەموو جیهانیان سەرقاڵ کردووە: یەکەمیان لە قورئاندا دەڵێت: (إنما المؤمنين إخوة) ئەمەش جوانترین بنەمای کۆمەڵایەتییە (إشتراكيه). دووەم: فەرزکردنی زەکات لەسەر هەر کەسێك کە پارەی هەیە و هەژارەکان مافی ئەوەیان بدرێتێ کە بە زۆر وەریگرن، ئەگەر دەوڵەمەندەکان ڕازی نەبوون بیدەن، ئەمەش چارەسەری فەوزایە)[٥٢].

– (ماسینیوس) دەڵێت: زەکات سیستەمێکی کۆمەڵایەتیی گشتییە... لەسەر بنەمایەکی بە سیستەمکراوی تۆکمەیە... ئەم سیستەمە بێ وێنەیە تەنها ئیسلام بوو بۆ یەکەم جار بەردی بناغەی دانا لە مێژووی هەموو مرۆڤایەتیدا، ئەو زەکاتەی کە لە چینەکانی دەوڵەمەند و بازرگان و خاوەن موڵکەکان وەردەگیرا بۆ ئەوەی دەوڵەت دابەشی بکات بەسەر هەژار و نەداراندا، ئەو دیوارەی ڕووخاند کە لە نێوانی چینەکانی یەك دەوڵەتدا هەبوون و کۆمەڵگەی یەکخست لە بازنەیەکی کۆمەڵایەتیی دادپەروەردا، بەمەش سیستەمی ئیسلامی سەلماندی کە بنەماکەی لەسەر چینایەتی بێزراو دانەمەزراوە[٥٣].

بەڵێ ئایین لای خوای گەورە تەنها ئیسلامە و شایەتی دەدەین کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە و ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان و خوای گەورە

٥٢ سەرچاوەی پێشوو لەگەڵ: محمد كرد علي : الإسلام والحضارة العربية، ج١، ص٧٦.

٥٣ سەرچاوەی پێشوو لەگەڵ: محمد كرد علي : الإسلام والحضارة العربية، ج١، ص٧٧.

قورئانی بۆ ناردووە وەك شەریعەت و مەنهەجی ژیان بۆ مرۆڤایەتی هەتا ڕۆژی دوایی، بە هیچ جۆرێك شتی بۆ زیاد ناکرێت و لێی کەم ناکرێتەوە، گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەری ئازیزە، موعجیزەیەکی ئاشکرایە کە خاوەن عەقڵ شانازیی پێوە دەکات و موسڵمانان دەتوانن بە بێ دوودڵی تەحەدای جیهانی پێ بکەن، دوژمنەکان وا لێ دەکات باوەڕی پێ بهێنن و ملکەچی بن، ئایەتەکانی ڕوونن و لە سنگی خاوەن زانستدان و تەنها ستەمکاران ئینکاری دەکەن، خۆ ئەگەر جنۆکە و مرۆڤ کۆببنەوەو هاوکاربن لەسەر ئەوەی نموونەی ئەم قورئانە بهێنن، ناتوانن ئەوە بکەن، خوای گەورە نموونەی زۆری تێدا هێناوەو ڕێگای ڕاستی تێدا ڕوونکردووەتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی بێباوەڕییان هەڵبژاردووە.

قورئان بە هۆی ئەوەی کە موعجیزەیە، نموونە بۆ ئەوانەی سەردەم دەهێنێتەوە بەوانەی کە ڕابردون، فەرمان بە چاکە دەکات و نەهی لە خراپە و کۆمەڵێك ئەرکی لەسەر بەندەکان واجب کردووە، جیهادی دیاری کردووە بۆ پاراستنی بانگەواز و بەرنامەی تێدایە بۆ پێکهێنانی خێزان، بەرنامەشی پێیە بۆ شێوازی مامەڵەی نێوان خەڵکی و بەرنامەشی تێدایە بۆ ڕوونکردنەوەی سزای تاوانەکان، ئەمە ئەو کتێبەیە کە هیدایەتی خەڵکی تێدایە و دڵەکان پاك دەکاتەوەو یاسای پێکهێنانی کۆمەڵگەشی تێدایە، قورئان ئەو یاسایەیە کە خەڵکی ئامادە دەکات بۆ شارستانیەت و ئەوەیان بیردەخاتەوە کە جیهانێکی تر هەیە و هانیان دەدات بۆ کردەوەی چاکە بۆ بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی هەتاهەتایی.

کۆتایی قسەکان بە وتەیەکی ڕۆژهەڵاتناس (جیمس میتشرز) دەهێنین کە دەڵێت: ((ئیسلام تۆمەتبارکراوە لە لایەن ڕق و کینە لە دڵەکان بەرامبەر ئیسلام، بەوەی کە ئیسلام بەتاڵە لە بیرکردنەوەی ئابووری، تۆمەتبارکراوە بە کۆنەپەرستی سەرمایەداری، بەڵام هۆکاری ئەم تۆمەتانە تەنها نەزانین و

نەشارەزاییە بە ئیسلام و سیستەمەکەی، بە پەیام و ڕێنماییە لێبوردەکانی. بەڵێ ئیسلام بە هەموو سیستەم و بنەماکانی شەریعەتەکەی بانگەوازێکە بۆ رزگاربوون لە متبوون و بێهێزی و کۆنەپەرستیی مادی عەقڵ، ئیسلام سیستەمێکی هاوسەنگە و توانای پێشخستنی هەیە و لەژێر سێبەری خۆشەویستیدا هاوکاری چینەکانی کۆمەڵگە بەدی دەهێنێت)) بەڵێ ڕاستی دەبێت بوترێت: ئەم قورئانە ڕێنماییە بۆ باشترینی شتەکان.

– زانای ئەڵمانی (ڕایسکە) (١٧١٦– ١٧٧٤ز) لە نووسینەکانیدا ئاماژەی بە ڕاستییە خوداییەکان لە ئیسلامدا کردووە و دوای ئەویش مامۆستا(سیمون أوکلی) پەرتووکێکی نووسی کە تێیدا فیکری ئیسلامی بەرزنرخاند، بەڵکو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بە گشتی بەرزنرخاند و فەزڵی دا بە سەر جیهانی ڕۆژئاوادا.

– هەروەها لە وتەی ڕۆژهەڵاتە بێلایەنەکان وتەی شاعیری ئەڵمانی (لیسینغ)ە کە دەڵێت: (من پێم وایە کە هەموو بیرمەندان هاوڕان لەگەڵم لەسەر ئەوەی کە هەموو بنەما سەرەکییەکانی ڕێنماییەکانی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) سەرچاوەکەی ئایینێکی فیگری سروشتییە).

– شاعیری گەورەی ئەڵمانی (گۆتە) هۆنراوەیەکی داناوە کە تێیدا وێنای پێغەمبەری ئیسلام دەکات وەك بەرزترین نموونەی مرۆڤایەتی کە خوای گەورە دڵ و ژیانی پڕکردووە لە چاکە و نیعمەتی بەسەردا باراندووە و هەڵیبژاردووە و پاکی کردووەتەوە بۆ ئەوەی ئایینە گەورەکە دابمەزرێنیت.

– دکتۆر (جرنییە)ەی فەرەنسی کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی فەرەنسی بوو، کاتێك هۆکاری موسڵمانبوونی لێدەپرسن، دەڵێت: من بەدواداچوونم کرد بۆ هەموو ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان هەیە بە زانستەکانی پزیشکی و تەندروستی و سروشتی، ئەوانەی کە من خوێندبووم لە منداڵیدا و

باش شارەزایانم، بینیم کە ئەم ئایەتانە کۆکن لەگەڵ زانستەکانی سەردەمدا[54]، هەر بۆیە موسڵمان بووم... خۆ ئەگەر هەر خاوەن هونەرێك لە هونەرەکان یان زانستێك لە زانستەکان ئایەتە پەیوەندیدارەکان بەراورد بکات لەگەڵ ئەوەی بە باشی فێری بووە وەك بەراوردکردنەکەی من، بێگومان موسڵمان دەبوو ئەگەر کەسێکی عاقڵ بێت و هیچ نەخۆشییەکی نەبێت.

– (بودلی) لە پەرتووکەکەیدا (حیاة محمد) دەڵێت: (... سەبارەت بە ژیانی موحەممەد، ژیاننامەکەی ڕوون و ئاشکرایە و لێرەدا ئیمە لەبەردەم مێژوویەکی ڕاستداین کە هیچ لێڵییەکی تێدا نییە... هەروەها مێژووی ناخۆیی دوای ئاشکراکردنی پەیامەکەی بەسەرهاتی بانگخوازێکی ناڕوون نییە، بەڵکو لەبەردەستی ئێمەدا هەیە کتێبێکی سەردەمیانە کە بێ وێنەیە لە دروستیدا و بە هیچ شێوەیەك شتی ناڕاستی تێدا نییە و لە هیچ لایەکەوە ناکرێت کەم و زیادی بۆ بکرێت)[55].

– بێگومان کۆمەڵێك لە ڕۆژهەڵاتناسان هەقیان وتووە سەبارەت بە ئیسلام و بە هۆی نیەتپاکییان و گرتنەبەری مەنهەجی زانستی لە لێکۆڵینەوەکانیاندا سەبارەت بە ئیسلام، ئیسلامیان لە ئامێز گرتووەو موسڵمان بوون، نموونەی: بوکهات، کرنکوف، زونستین، شنیتسر، دینیە، فولورین ، میشوبیللر، فلیی، لیوبولدفایس، جرمانوسو هەندێك لە پۆڵۆنییەکان و یانزەش لە ئەڵمانییەکان، ئەوانەی کە موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند لە سەر دەستی شێخی گەورەی ئەزهەر و ناوەکانی خۆیان گۆڕی بۆ ناوی موسڵمانان، هەروەها دکتۆرە وارزولانیای ئەڵمانی کە ناوی خۆی کردە (سامیة الازهریة) و هەردوو ئەمریکی: خدیجە دلتك و لیورس (شیخ محمد الازهري) و هەردوو سویسرایی: (جمیلة

[54] الإسلام والإنسان المعاصر، د. محمد ظفر الله خان، مقدمة المترجم، ص١٥ و دواتری.

[55] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥ و دواتری.

زوسترنج و ألبرت كادلر) و هەندێك لە بەریتانییەكان: ڕۆژهەڵاتناس جۆنس و ڕۆژنامەنووس لویس هارد و ئیفون ئیفیت كوكا[٥٦].

– جاهر كاود فارير لە سەدەی بستدا دەڵێت: (ئایەتەكانی قورئان جوانن و خوێندنەوەیان خۆشە، بۆنێكی پاكی سەرسوڕهێنەریان لێدیت، چونكە فەرمان بە ئازایەتی و ڕاستگۆیی و دەستپاكی دەكەن و بانگەواز بۆ پاراستنی بێهێزەكان و پەرستنی یەك خودا دەكەن)[٥٧].

– مێژوونووسی گەورەی بەریتانی (ولز) دەڵێت: (ئیسلام هەر لە سەرتاوە دوور بوو لەو كێشانەی پەوەستن بە زاتی خوداوە، كە مەسیحیەت پێوەی دەناڵاو دوولایەنییەكی دروست كرد (لە نێوان ئایینی هەق و ئایینی دەستكاریكراو) و زاڵ بوو بەسەر ڕۆحی مەسیحیەتدا. لە ئیسلامدا قەشە نییە، بەڵكو زانا و مامۆستا و وتاربێژ هەن و پڕە لە ڕۆحی بەزەیی و بەخشندەیی و برایەتی...).

– جان مليا دەڵێت: (ئێستا كاتی ئەوە هاتووە ئەو بانگەشانەی كە هەندێك لەو فەرەنسییانەی لاف و گەزافی فەلسەفەیان لێدەدا سەبارەت بە ئیسلام، بیخەینە ئەولاوە، قورئان دەبێت بە تێڕامانەوە بخوێنرێتەوە، ئەو تۆمەتانەش كە دوژمنەكانی بۆیان دروستكردبوو كە گوایا خەڵكی فێری دەمارگیری دەكات، تیێدا نییە، بەڵكو ئیسلام ئایینێكی ئاسمانییە و ئایینی خۆشەویستی و سۆز و شەرەفە و لە هەموو ئایینە ئاسمانییەكانی تر لێبوردەترە)[٥٨].

---

[٥٦] بڕوانە: المستشرقون، العقيقي، ج٣/ ١١٦١ و دواتری.

[٥٧] الإسلام والحضارة العربية، محمد كرد علي، ج١، ط٣، ١٩٦٨م القاهرة مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، ص٧١.

[٥٨] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

- ئارسەر جلن لیونارد دەڵێت: (... ئەوروپا هەتا ئێستا لە دڵەوە دانی نەناوە بەم ئایینە گەورەیەدا کە هۆکاری پەروەردەی ئیسلامی و شارستانیەتی عەرەبییە (ئیسلامیە)... ئەگەر خورەشتی جوانی ئیسلام و شارستانەیتی عەرەب (ئیسلام) نەبوایە، هاوتا لەگەڵ زانست و گەورەییان لە بابەتی شارستانیەت و ڕێك و پێکیی خوێندنگاکانیان، ئەوروپا هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆ نقوم بوو بوو لە نەزانیدا...)[٥٩].

- دانای ڕووسی (تۆڵستۆی) دەڵێت: (ئەوەی گومانی تێدا نییە کە پێغەمبەر موحەممەد (د.خ) یەکێك بووە لە گەورەترین پیاوانی چاکسازی، کە خزمەتێکی زۆر گەورەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردووە، گەورەترین شانازییە بۆ ئەو کە ئوممەتێکی بەگشتی هیدایەت داوە بۆ ڕووناکیی هەق، وای لێکرد بە ئاشتی و ئارامی بژین و بە ژیانی سادە ڕازی بن و دووری خستنەوە لە خوێنڕشتن و قوربانی خستنەوە، دەرگای پێشکەوتن و شارستانیەتی بۆ واڵاکردن، ئەمەش کارێکی زۆر گەورەیە کە تەنها بە کەسێکی زۆر بەهێز دەکرێت، کەسێکی لەم جۆرەش شایەنی ڕێزلێگرتنە)[٦٠].

- ولیەم موير لە پەرتووکەکەیدا (سيرة محمد) دەڵێت: (موحەممەد نموونەی باڵا بوو، وتەکانی ڕوون بوون و ئایینەکەی ئاسان بوو، کارە ئەنجامدراوەکانی ئەو سەرسوڕهێنەر بوون، لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا لەناو چاکسازیخوازاندا کەسێکی تر نابینیت وەك ئەو دەروونەکانی بەئاگا هێنابێتەوە و ئەخلاقی زیندووکردبێتەوە و گرنگیی بە بەها بەرزەکان دابێت لە کاتێکی وا کورتدا)[٦١].

---

[٥٩] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

[٦٠] سەرچاوەی پێشوو لەگەڵ: الإسلام والحضارة العربية، محمد كرد علي، ج١، ص٦٦.

[٦١] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦.

– لین پۆڵ دەڵێت: (زۆربەی ئەوانەی نووسینیان هەیە لە بواری ژیاننامەدا لە ئەورووپییەکان و باسی ژیاننامەی موحەممەدیان کردووە، خۆیان نەپاراستووە لە شێواندنی ژیاننامەی ئەو، بەوەی کە درۆ و هەڵبەستراویان تێکەڵکردووە، وەك دروستکردنی تۆمەتی دڵڕەقی و ئەنجامدانی کاری خراپە و ڕۆچوون لە ئارەزووەکاندا، یان کە گوایا کەسێکی درۆزن و ستەمکار و تینووی خوێنمژین بووە)[٦٢].

– مونتیه دەڵێت: (...بەڵکو ئەوەی ئەو (مەبەستی پێغەمبەرە) کردی لە چاککردنی ئەخلاق و پاککردنەوەی کۆمەڵگە، دەکرێت لەقەڵەم بدرێت بە یەکێك لە گەورەترین چاکەهێنەران بۆ مرۆڤایەتی)[٦٣].

– نووسەرێکی ئافرەتی ئیتاڵی[٦٤] دەڵێت: (زانایانی ڕۆژهەڵاتناسی وەك مویر و سبرینجیر لە کۆندا و جولدتسیهر و نولدکە و کایتانی لە سەردەمی نوێدا شێوازێکی ڕەخنەگرتنی زۆر جیاوازیان گرتەبەر بە بەراورد بە زانا موسڵمانەکان، ئەوان گەشتنە ئەوەی دانبنێن بە ئەمانەتی موحەممەد و ئەوە بسەلمێنن – بە پلەی جیاوازی ڕاشکاوی – کە ئەوەی موحەممەد هێناویەتی سەرچاوەکەی وەحیی خودایییە، بەڵام لە کاتی ڕوونکردنەوەی حاڵەتی وەحی، ڕاڤەگەلێکی جیاوازیان هەیە کە لەگەڵ بۆچوونی ڕەخنەگرێکی غەیری موسڵمانیشدا یەکناگرێتەوە)[٦٥].

---

[٦٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦.

[٦٣] سەرچاوەی پێشوو لەگەڵ: ج١، ص٦٧. وحاضر الإسلام ومستقبله لمونتيه، نقلاً عن محمد علي كرد، ص٦٧.

[٦٤] مدح الإسلام للورافشيا فاليري، نقلاً عن محمد علي كرد، ص٦٧.

[٦٥] سەرچاوەی پێشوو، الإسلام والحضارة العربية، ج١، محمد كرد علي، ص ٦٧.

– برناردشۆ گەورە نوسەری ئینگلیزی سەردەم دەڵێت: (سەد ساڵ تێپەڕنابێت هەتا ئەوروپا و بە تایبەتی ئینگەلتەرا دەگەنە قەناعەتی تەواو بە گونجاوی ئیسلام بۆ شارستانیەتی دروست).

– لبون دەڵێت: (ڕەنگە ئەوروپییەکان هەندێکیان داگیرکەری[٦٦] لێهاتوو بن، بەڵام لە سەردەمی ڕۆمەکانەوە موسڵمانان تاکە ئوممەت بوون کە زانستی شارستانیەتیان گەیاند، ئەوان براوەی گەیاندنی بابەتە بنەڕەتییەکانی شارستانیەت و ئایین و کارگە و پیشەسازی بوون، بۆ ناو گەلانی غەیری خۆیان).

– بەڕاستی تورەهاتەکانی ڕۆژهەڵاتناسان زۆرن و زیاتر درێژەی پێنادەین لە نموونە هێنانەوە و ئەرکی وەڵامدانەوەشی ناکێشین، بەڵکو بەسە بۆ وەڵامی ئەو نەزانانە، چەند وتەیەکی زانا و تێگەشتووەکان نەقڵ بکەین:

کلود فاریر[٦٧] مێژوونووس و ئەدیبی فەرەنسی دەڵێت: (شکستی عەرەبەکان (موسڵمانەکان) لە جەنگی بواتیە، شارستانیەتی ڕۆژئاوای بۆ هەشت سەدە دواخست، خۆ ئەگەر (موسڵمانان) لە ڕۆژی بواتیە، سەربکەوتنایە ئەوا شارستانیەتەکەیان دەگەیاندە ڕۆژئاوا و ڕۆژگاری نەزانینیان درێژەی نەدەکێشا).

سمنون دەڵێت[٦٨]: (شتێکی زۆر قورس نەبوو خۆپاراستن لە جەنگەکانی خاچپەرستی، بەڵام نەزانی و ئەوهامی دینی و سیاسی و بەرژەوەندیی پاپایەتی، یارمەتیدەر بوون بۆ دروستبوونی).

– ڕۆژهەڵاتناس (إستفان فلید) دەڵێت: (سەرەتا با دان بەوەدا بنێین کە زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسان کەوتوونەتە هەڵەوە لە نووسینەکانیاندا، هەندێکیان

---

[٦٦] النفسية السياسية لجوستاف لبون: نقلاً عن محمد كرد علي: كتاب الإسلام الحضارة العربية، ج١، ط٣، ١٩٦٨، القاهرة، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، ص٥٣.

[٦٧] مقدمة رواية العباسة لجرجي زيدان بقلم فارير. هەمان سەرچاوە، ص٥٤.

[٦٨] تاريخ روسيا لمارك سمنوف: لە هەمان سەرچاوەوە، ص٥٤.

هەڵەی زمانەوانی و ڕاڤەی قورئان و ڕاڤەی فەرموودەکانی پێغەمبەر، هەروەها هەڵەی مێژوویی و فیقهی و هتد... لەوەش قێزەونتر ئەوەیە کە کۆمەڵێك هەن خۆیان ناوناوە ڕۆژهەڵاتناس و زانست و زانیارییەکانیان سەبارەت بەئیسلام و مێژووەکەی بەکارهێناوە لە دژایەتیکردنی ئیسلام و موسڵماناندا، ئەمەش ڕاستییەکی بەئازارە کە دەبێت ڕۆژهەڵاتناسە ڕاستەقینەکان بە ڕاشکاوانە دانی پێدا بنێن)[٦٩].

– (مۆریس بۆکای) دەڵێت: (ئەو حوکمانەی دراون سەبارەت بە ئیسلام لە ڕۆژئاوا کە گومان لە نادروستییاندا نییە، هەندێك جار بە هۆی نەزانینەوە بووە و هەندێ جاری تر بەهۆی خۆخەڵەتاندنەوە بووە)[٧٠].

## باسی دووەم:
## تەواوی ئەو کەلێن و کەموکوڕی و هەڵە مەنهەجییانەی کە لە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکاندا هەن سەبارەت بە ئیسلام

لە ڕێگەی توێژینەوەو بەدواداچوون دەتوانرێت ئەو کەلێن و کەموکوڕی و هەڵە مەنهەجییانەی کە لە توێژینەوە ڕۆژهەڵاتناسییەکاندا هەن سەبارەت بە ئیسلام، لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکرێنەوە:

١– هەڵگێڕانەوەی دەقە ئیسلامییەکان بە مەبەست و پارچەپارچەکردنیان بۆ مەبەستی تایبەت، نموونەی ئەمەش نووسینەکانی (جولدتسیهر) و (شاخت)ە کاتێك سەبارەت بە ڕاستیی فەرموودەی پێغەمبەر شتیان نووسیوە.

---

[٦٩] الإسلام في الفكر الغربي، د. زقزوق، ص٦٠.

[٧٠] دراسة في الكتب المقدسة، موريس بوكاي، ص١٣٥.

٢- پشت بەستن بە بۆچوونی نادروست و باسنەکردنی ڕا و بۆچوونی ئیسلامی لە بابەتەکەدا، زانایانی ئیسلام و هەندێك لە زانا بێلایەنە بە ویژدانەکانی ڕۆژئاواش بەرپەرچیان داونەتەوە بە بەڵگەی زانستیی یەکلاکەرەوە.

٣- بەکارهێنانی هەندێك دەق لە شوێنی نەگونجاودا بۆ ئەو جێگایە و ڕاڤەکردنی بە شێوەك کە دەقەکە ئەو ڕاڤەیە هەڵناگرێت بۆ مەبەستی ڕۆژهەلاتناسی.

٤- بەڵگەهێنانەوە بە پارچەیەك لە دەقی زانستی بۆ مەبەستێکی قێزەون کە وەڵامەکەی لە هەمان دەقدا هەیە ئەگەر بە تەواوی دەقەکە بنووسرایە.

٥- هەڵەکردن لە گفتوگۆی زانستیدا و گومانی خراپ بردن و خراپ تێگەشتن لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیی بە ئیسلامەوە هەیە.

٦- گومانی خراپ بردن بە موسڵمانان و زاناکانیان و پیاوەناودارەکانیان.

٧- وێناکردنی شارستانیەتی ئیسلامی بە شێوەیەك کە زۆر لە قەدری خۆی کەمترە، ئەمەش وەك بەکەمزانینی دەستکەوتەکانی.

٨- کەمتوانایی لە پەی بردن بە نهێنییەکانی زمانی عەرەبی و کەوتنە ژێر کاریگەریی ئایینی مەسیحیەت لە ئەوروپا، ئەمەش وای لێکردن کە بە چاوی گوماناویی سەیری هەر ئایینێکی تر بکەن[٧١].

---

[٧١] بڕوانە: حیاة محمد، ص٦٠ و دواتری.

# المصادر والمراجع:

١- الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، محمود حمدي زقزوق، (قطر، ط، ١٤٠٤هـ).

٢- الإسلام والحضارة العربية، محمد كرد علي، ج١، ط٣، ١٩٦٨م، القاهرة، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر.

٣- الإسلام والإنسان المعاصر، د. محمد ظفر الله خان، ترجمة وتعليق محمد جلال شرف (بيروت، دار النهضة العربية، ١٩٨١م).

٤- الاستشراق والمستشرقون ما لهم وما عليهم، مصطفى السباعي، (الكويت، مكتبة دار البيان، ط١، ١٣٨٧هـ-١٩٦٨م).

٥- الإسلام دين المستقبل، روجيه غارودي، ترجمة الدكتور عبد الحميد البارودي، دار الإيمان للطباعة والنشر.

٦- الاستشراق: إدوارد سعيد، ترجمة كمال أبو ديب (بيروت: مؤسسة الأبحاث العربية، ط١، ١٩٨١م).

٧- الاستشراق بين الموضوعية والافتعالية، قاسم السامرائي، (دار الرفاعي، ط١، ١٤٠٣هـ-١٩٨٣م).

٨- إنتاج المستشرقين وأثره في الفكر الإسلامي الحديث، مالك بن بني، (القاهرة: مطبعة دار البيان).

٩- تطور الاستشراق في دراسة التراث العربي، عبد الجبار ناجي، (بغداد: دار الجاحظ، ١٩٨١م).

١٠- التبشير والاستعمار، مصطفى الخالدي وعمر فروخ، (بيروت، ط٤، ١٩٧٠م).

١١- تراثنا بين ماض وحاضر، عائشة عبد الرحمن ((بنت الشاطئ))، (معهد البحوث والدراسات العربية، ١٩٦٨م).

١٢- تاريخ الأدب العربي، أحمد حسن الزيات، (القاهرة: دار النهضة، ط٢٥).

١٣- تاريخ روسيا: مارك سمنوفز.

١٤- حقيقة الاستشراق وموقفه من الإسلام منذ ظهوره إلى نهاية الألفية الثانية، د. محمد بهاء الدين حسين، مطبعة الجامعة الإسلامية العالمية بماليزيا، كوالالمبور، ط١، ٢٠٠٣م.

١٥- الحضارة الإسلامية، خدابخش ((صلاح الدين))، ترجمة علي حسني الخربوطلي، (القاهرة: دار إحياء الكتب العربية، ١٣٨٠هـ-١٩٦٠م).

١٦- حصوننا مهددة من داخلها، محمد محمد حسين، (بيروت: دار الإرشاد، ط٣، ١٩٧١م).

١٧- حياة محمد، محمد حسين هيكل، (القاهرة: مكتبة النهضة العربية، ط١٣، ١٩٦٨م).

١٨- حاضر الإسلام ومستقبله: مونتيه.

١٩- الدراسات العربية والإسلامية في الجامعات الألمانية، رودي بارت، ترجمة مصطفى ماهر، القاهرة: دار الكتاب العربي.

٢٠- دراسة في الكتب المقدسة: موريس بوكاي.

٢١- الصوفية في الإسلام، رينولد نيكلسون.

٢٢- العقيدة في الإسلام، جولد تسيهر.

٢٣- الغزو الفكري، عبد الستار فتح الله سعيد، (القاهرة: دار الإنصار).

٢٤- الفكر الإسلامي الحديث وصلته بالاستعمار الغربي، محمد البهي (مكتبة وهبه، مطبعة مخيمر، ط٣).

٢٥- الفكر الإسلامي في الرد على النصارى، عبد الحميد الشرفي.

٢٦- لسان العرب: ابن منظور، إعداد وتصنيف يوسف الخياط، (بيروت: دار لسان العرب).

٢٧- مختار الصحاح، أبو بكر الرازي، (بيروت: دار الكتاب العربي، ١٤٠١هـ-١٩٨١م).

٢٨- المستشرقون والإسلام: د. عرفان عبد الحميد فتاح، (بغداد: مطبعة الإرشاد، ١٩٦٩م).

٢٩- المستشرقون والإسلام، د. حسن الهواري.

٣٠- المستشرقون، بخيث العقيقي، (مصر: دار المعارف، ط٣، ١٩٦٤م).

٣١- مجلة الشريعة والدراسات الإسلامية بمكة، العدد الخامس، ١٤٠٤هـ.

٣٢- المبشرون والمستشرقون وموقفهم من الإسلام، ملحق بكتاب الفكر الإسلامي الحديث وصلته بالاستعمار الغربي، محمد البهي، ط٤.

٣٣- المستشرقون ومصادر التشريع الإسلامي، عجيل جاسم النشمي، (الكويت، ط١، ١٤٠٤هـ-١٩٨٤م).

٣٤- المستشرقون والحديث النبوي: د. محمد بهاء الدين حسين، (عمان: الأردن، دار النفائس، ط١، ١٤٢٠هـ-١٩٩٩م).

٣٥- مناهج المستشرقين، سعدون الساموك، (بغداد: جامعة بغداد، ١٩٨٥م).

٣٦- مناهج المستشرقين في الدراسات العربية والإسلامية، مكتب التربية العربية لدول الخليج، السعودية، الرياض.

٣٧- المصباح المنير، أحمد محمد الفيومي، (مصر: مطبعة البابي الحلبي، ١٣٤٢هـ).

٣٨- مجلة العربي، العدد ٢٥٢، الكويت، ١٩٧٩م.

٣٩- مقدمة رواية العباسة لجورجي زيدان: بقلم فارير.

٤٠- مدح الإسلام: لورا فشيا.

٤١- النفسية السياسية: جوستاف لوبون.

٤٢- الوحي المحمدي، السيد محمد رشيد رضا، المكتب الإسلامي.

# ڕاگەیەندراوی کۆتایی کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، بە هاوکاریی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، هەستا بە گرێدانی کۆنگرەی یەکەمی زانستیی خۆی بە ناونیشانی (بەرگری لە قورئان) لە دوو ڕۆژی (٢٦ ـ ٢٧)ی موحەڕڕەمی ١٤٣٣ی کۆچی، کە بەرابەرە لەگەڵ (٢٢ـ ٢٣/١٢/٢٠١١ی زاینی) بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە زانایان و بیریاران و نووسەران لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستان.

لەم کۆنفرانسەدا سەرەڕای فیستیڤاڵی کردنەوەی کۆنفرانسەکە، چوار دانیشتنی زانستی گرێدران، کە پانزە لێکۆڵینەوەیان تێدا خوێندرایەوە لە لایەن مامۆستایانی پسپۆڕەوە، هەروەها کۆمەڵێك تێبینی خرانە ڕوو لەسەر هەر لێکۆڵینەوەیەك لە لایەن هەڵسەنگێنەر و بەشدارانی ئەم کۆنفرانسەوە. پاش لە بێژنگدانی تێبینی و باسەکانیش، کۆنگرە گەیشتە ئەم دەرەنجام و ڕێنماییانەی خوارەوە:

١ـ بێگومان قورئانی پیرۆز لە لایەن پەروەردگاری جیهانەوە دابەزیوە و کۆدەنگیی تێکڕای موسڵمانانی لەسەرە، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر موسڵمانان کە بە چاوی شکۆ و ڕێزەوە بۆی بنوارن. گرنگیی پێبدەن بە خوێندنەوە و ڕاڤەکردن، مەبەست و نهێنییەکانی بخەنە ڕوو، هەموو لایەنە کشهێنەرەکانی (الإعجازية).

٢ـ بە ڕاستی قورئانی پیرۆز هەر لە سەرەتای دابەزینیەوە لە سەردەمانێکی زووەوە دووچاری چەندان هێرشی دڕندانە بووەتەوە لەلایەن

دوژمنان و نکوڵی لێکەرانیەوە بە جۆرەها شێواز و هیچ کەمتەرخەمی و درێغییان نەکردووە لە دژایەتیکردنیدا، بە چاندنی گومان دەربارەی لە دڵی خەڵکیدا. بەهۆی ئەوەوە کە قورئانی پیرۆز لە لایەن خودای کاربەجێ و زاناوە هاتە خوارەوە و هەر ئەویش پەیمانی داوە بە پاراستنی، لەبەرئەوە بێگومان ئایەتەکانی قورئان خۆیان بەرگری لە قورئان دەکەن و بەرپەرچی هەر گومانێك دەدەنەوە کە لە لایەن دوژمنەکانیەوە دەخرێتە ڕوو.

٣- وەك شکۆیەك بۆ قورئان، پێویستە کۆنفرانس و کۆنگرە و خولی جۆربەجۆر ئەنجام بدرێت لەبارەیەوە، تا موسڵمانان زانیاریی زیاتریان هەبێت دەربارەی قورئان و زانیارییان لەسەری ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بکات.

٤- کۆنفرانس داوا لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمان و وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا و ڕۆشنبیری و ئەوقاف دەکات کە گرنگی بدەن بە قورئان و زانستەکانی، بەوپەڕی گرنگیدان لە هەموو ئاستەکانی فێرکردندا، ئەوەش لە پێناوی پەروەردەکردنی نەوەکاندا لەسەر چەمك و زانینەکانی.

٥- پێویستە لەسەر کۆلێژ و پەیمانگا ئیسلامییەکان کە زیاتر گرنگی بدەن بە لێکۆڵینەوەی قورئان بە دانانی کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگ و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەیی و قووڵ لە فێرکردن و فێربوون و لێکۆڵینەوەدا.

٦- کۆنگرە داوا دەکات لە کەناڵە ڕاگەیاندنە ئیسلامییەکان کە کاتێکی زۆرتر تایبەت بکەن بە پێشکەشکردنی پرۆگرامی تایبەت بۆ دەرخستنی نهێنییەکانی قورئان و لایەنە کشهێنەرەکانی، پێویستە لەسەر کەناڵە ڕاگەیاندنە عەلمانییەکانیش شاڵاوەکانیان بووەستێنن بەرامبەر قورئان، بێلایەنی نیشان بدەن و بابەتییانە مامەڵە بکەن بەرانبەر هەموو شتێك کە پەیوەندییان بە قورئان و سوننەتەوە هەیە، لەبەر ئەوەی ئەم دوو سەرچاوەیە لە پیرۆزترین شتەکانن

لای میللەتی کوردی موسڵمان و هەر لەکەدارکردنێکی ئەم دوانە بە دەستدرێژی دەدرێتە قەڵەم بۆ سەر مافی ئەم گەلە.

٧- پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ بەدواداچوون و کۆکردنەوەی هەموو گومانەکان و سپاردنیان بە پسپۆڕان بۆ لێکۆڵینەوەیان و بەرپەرچدانەوەیان بە شێوەیەکی زانستییانە.

لە کۆتاییدا ئەم هێرشەی کەسانێك دەستیان پێکردووە کە بە رۆشنبیرە نوێیەکان و نووسەرە نوێخوازەکان ناویان دەبرێت، کەوا دەزانن شتێکی تازەیان هێناوە، پێویستە بزانن کە ئەو بیرۆکانە شتێکی سوواو و ڕزیون کە پێشینەکانیان لە سەردەمانێکی زووەوە ئەم گومانانەیان خستووەتە ڕوو، بەرهەمێکی وایان نەداوە کە تینوێتییان بشکێنێ، نەخێر و هەرگیز ناگەنە ئاواتەکانیان، بەڵکو بە ویستی خوای گەورە رۆژان بە پێچەوانەی ئارەزووی ئەوانەوەن.

**﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ (الأنفال: ٣٦).**

**بەشدارانی کۆنگرەی زانستیی بەرگریی لە قورئانی پیرۆز**

**سلێمانی ٢٧ی محرم الحرام/١٤٣٣ی کۆچی**

**بەرامبەر بە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١١ی زایینی**

